لا يتجاوز كراهة التنزيه. وكل فقيه موفق يتمكن بعون الله من التمييز بين القسمين مهما رسخت قدمه في إيمانه وعلمه» [1].

١٣ـ (**الإمام ابن حجر شهاب الدين أحمد بن محمد المكي الهيتمي المتوفى ٩٧٤هـ**) له (**شرح الأربعين**)يدا دەفەرمويّت: « البدعة لغة ما كان مخترعا، وشرعا: ما أحدث على خلاف أمر الشرع ودليله الخاص والعام » [2].

١٤ـ (**العلامة عبد الحق الدهلوي بن سيف الدين بن سعد الله البخاري الحنفي المتوفى ١٠٥٢هـ**) له (**أشعة اللمعات شرح المشكاة**)يدا دەلّيّت: « إعلم أن كل ما ظهر بعد رسول الله (ﷺ) بدعة، وكل ما وافق أصول سنته وقواعدها أو قيس عليها فهو بدعة حسنة، وكل ما خالفها فهو بدعة سيئة وضلالة، ومفتاح كل بدعة محمول على هذا، هذا وإن بعض البدع واجبة شرعاً مثل تعلّم وتعليم الصرف والنحو واللغة التي تعرف به الآيات والأحاديث وبقية الأشياء التي يتوقف عليها حفظ الدين والأمة، وثمة بدع مستحسنة ومستحبة مثل بناء الرباط والمدارس ..الخ» [3].

١٥ـ (**العلامة حسنين مخلوف**) له (**الفتاوى الشرعية**)يدا دەلّيّت: « ويؤخذ من كلام الشاطبي في الاعتصام أن البِدْعة لا تُطْلَق حقيقة إلا على ما لم يشهد له أصل في الشرع، وهي بدعة الضلالة، ولا تُطْلَق البدعة على ما يشهد له أصل في الشرع إلا مجازًا، كجمع القرآن في المَصَاحف، وتدوين الدواوين في عهد عمر، وتدوين الحديث وعلوم العربية التي هي علوم آلية لفهم القرآن والسنة، وكذلك سائر المستحدثات التي يشهد لها أصل في التشريع

---

١. الأمر بالاتباع والنهي عن الابتداع للحافظ جلال الدين السيوطي (ص ٦).

٢. التبيين بشرح الأربعين لابن حجر المكي: ص٢٢١.

٣. وەرگیراوە لە: (موسوعة كشاف اصطلاحات العلوم والفنون للعلامة التهانوي محمد بن علي الهندي، مصطلح البدعة:(١/ ٣١٣ـ٣١٤).

الإسلامي. فما استُحْدِث من الصلاة والتسليم عَقِب الأذان إذا كان قد ورد في الشرع ما يشهد له لا يسمى بدعة إلا مجازًا، على رأي الشاطبي، ويُسَمَّى بدعة حسنة أو بدعةَ هُدًى على رأي الجمهور. وإذا لم يَرِد في الشرع ما يَشْهَد له كان بدعة سيئة باتفاق. والذي نَميلُ إليه ونستظهره أنه بدعة حسنة تَنْدَرِج في أصْلٍ عامّ شرعي، وهو الأمر بالصلاة والسلام على رسول الله (ﷺ) غير مقيد بوقت ولا حال ولا صيغة، فلا بأس من فعلها، ولا تقصير في تركها. والله أعلم» [1].

جگە لەم زانا پایەدارانەی کە باسمانکردن لەمەودواش عیبارەتی دەیان زانای بەرزی ئیسلام بەرچاو دەکەوێت کە داهێنراویان کردووە بە دوو بەشەوە، داهێنراوی باش و داهێنراوی خراپ، بەڵام نامانەوێت تیکرار دەربچێت بۆیە عیبارەتی ئەوانی تر هەڵدەکرین بۆ ئەو بەشەی کە تایبەتمەندە بە نموونە شەرعییەکان لە سەر داهێنراوەکان بە تایبەت لە عیباداتدا.(وبالله تعالى التوفيق).

بەڵێ، ئەو حەقیقەتە شاراوە نییە لای نوسەرانی فیکری وەهابییەتیش دانیان ناوە بەوەی کە زۆرێك لە گەورە زانایانی سەلەف و خەلەف ئەو تەقسیمەیان کردووە بۆ بیدعەت، ئەوەتانی خاوەنی کتێبی (محبة الرسول بين الاتباع والابتداع) (عبد الرؤوف محمد عثمان) دەڵێت: « فممن ذهب إلى أن (البدعة) تنقسم إلى محمودة ومذمومة الإمام الشافعي (رحمه الله) حيث قال: (البدعة بدعتان، بدعة محمودة وبدعة مذمومة، فما وافق السنة فهو محمود وما خالف السنة فهو مذموم» [2] احتج بقول عمر (رضي الله عنه) في

---

١. فتاوى شرعية، حسنين مخلوف: (١ / ٢٩٨).

٢. حلية الأولياء وطبقات الأصفياء. للحافظ أبي نعيم أحمد بن عبد الله الأصبهاني: (٩/١١٣).

قيام رمضان « نعمت البدعة هي»[1] وإذا كان الشافعي ومن تابعه قد اكتفى بتقسيم البدعة إلى قسمين: بدعة محمودة أو مستحسنة، وبدعة مذمومة. فإنّ العز بن عبد السلام[2] ومن حذا حذوه مالوا إلى التفصيل. فالبدعة عندهم تجرى عليها الأحكام الخمسة. وبمثل هذا قسّمهما القرافي[3] والنووي، وابن حجر العسقلاني»[4].

هەروەها خاوەنی کتێبی (غيث العقيدة السلفية) (خالد بن إبراهيم الصقعبي) دەڵێت: « مسألة: البدعة اللغوية والبدعة التي لم تخالف كتاباً ولا سنة ولا إجماعاً لسلف الأمة، هذه البدعة إنما سميت بدعة في اللغة، إلا أنها قد لا تكون سيئةً بل قد تكون حسنة، كما قال شيخ الإسلام ابن تيمية (رحمه الله تعالى): « وما خالف النصوص فهو بدعة باتفاق المسلمين، وما لم يُعلم أنه خالفها فقد لا يسمى بدعة، قال الشافعي رحمه الله: البدعة بدعتان، بدعة خالفت كتاباً وسنة وإجماعاً، وأثراً عن بعض (أصحاب) رسول الله (ﷺ) فهذه بدعة ضلالة، وبدعة لم تخالف شيئاً من ذلك فهذه قد تكون حسنة لقول عمر: (نعمت البدعة هذه) وهذا الكلام أو نحوه رواه البيهقي بإسناده الصحيح في المدخل »[5]

هەروەها لە زۆرێك لە کتێبە تەحقيق كراوەكانی مەكتەبەی شاميلەدا (المكتبة الشاملة)كە لە (موقع جامع الحديث)ەوە وەرگيراوە دانراوە بە

١. محبة الرسول بين الاتباع والابتداع: عبد الرءوف محمد عثمان: (ص ٢٨١).

٢. (الإمام المجتهد عز الدين عبد العزيز بن عبد السلام بن أبي القاسم السلمي الدمشقي الأصولي الشافعي الأشعري المقلب بسلطان العلماء المتوفى ٦٦٠هـ).

٣.(الإمام المجتهد أبو العباس شهاب الدين أحمد بن إدريس عبد الرحمن الصنهاجي القرافي الإمام الفقهي المالكي المتوفى ٦٧٤ هـ).

٤. محبة الرسول بين الاتباع والابتداع: (١ / ٢٨٢-٢٨٣)

٥. غيث العقيدة السلفية شرح منظومة الحائية للصقعبي خالد بن إبراهيم: (ص٩).

تەقسـيمی بیدعەتـدا بـۆ بـاش و خـراپ ئـەم عیبارەتـەیان دووبـارە کردەووەتەوە کە تەصریحە بەو دابەش کردنە: « البدعة بِدْعَتَان: بدعة هُدًى، وبدعة ضلال، فما كان في خلاف ما أمَر اللّه به ورسوله (ﷺ) فهو في حَيِّز الذّم والإنكار، وما كان واقعا تحت عُموم ما نَدب اللّه إليه وحَضَّ عليه اللّه أو رسوله فهو في حيز المدح، وما لم يكن له مثال موجود كنَوْع من الجُود والسخاء وفعْل المعروف فهو من الأفعال المحمودة، ولا يجوز أن يكون ذلك في خلاف ما وَردَ الشرع به»[1].

١. وەك كتێبی (البدع والنهي عنها لابن الوضاح أبي عبد الله محمد بن وضاح بن بزيع المرواني القرطبي (ت ٢٨٧هـ) (ص ٧ بۆ ٢٤٧).) کە لە زیاتر لە سیی هامیشیدا هەروەها بنواڕە: هامش رقم (٣) كتاب معرفة السنن والآثار للبيهقي (١٢٤/٥). هامش رقم (٩) كتاب أمالي ابن بشران (٦١/١). هامش رقم(٧) كتاب الأربعون حديثا للآجري (ص ٩). هامش رقم (٢) كتاب معجم الصحابة لابن قانع: (٢٢١/٥). هامش رقم(٢) كتاب معجم ابن الأعرابي: (١٦/٤). هامش رقم(١)، كتاب مساوئ الأخلاق للخرائطي (٢٠٥/٢). هامش رقم(٣) قيام رمضان لمحمد بن نصر المروزي (٢٠/١). هامش رقم(٢) كتاب فوائد محمد بن مخلد (ص ٦). هامش رقم (١)كتاب فضائل الصلاة للفضل بن دكين (ص ٢٧٤). هامش رقم(٤) كتاب الزهد لوكيع بن الجراح البصري: (٣٥٧/١). هامش رقم(١) كتاب تاريخ داريا لعبد الجبار الخولاني: (١ / ١٤١). هامش رقم (١) كتاب حديث أبي محمد الفاكهي: (ص ١٣٣).

## راڤەی فەرمودەی: « من أحدث في أمرنا هذا.. ».

یەکێکی تر لەو بەڵگانەی کە هەندێك دەیهێننەوە لەسەر نا دروستی دابەشکردنی داهێنراو بۆ باش و خراپ، فەرمودەی صەحیحی پێغەمبەر (ﷺ): «من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد »[1]، بە بەڵگە دەهێننەوە، کە بێگومان ئەم فەرمودەیە: « من أحدث في أمرنا هذا » تەقیید و پەیوەست کراوە بە قەیدی «ما ليس منه»، پاشان وەڵامی شەرتەکە هاتووە، کە دەفەرموێت: «فهو ردٌّ» أي فهو مردود، واتە: « هەر کەسێك داهێنراوێك لە ئیسلامدا بهێنێتە دی ئەو داهێنراوەی لە نێو چوارچێوەی ئیسلامدا جێگەی نەبێتەوە ئەوا داهێنراوەکە بە سەریدا دەدرێتەوە».

کەواتە مەفهومی موخالەفەی فەرمودەکە وەهای لێ دێتەوە: « من أحدث في أمرنا وكان المحدثُ منه فهو مقبول»، بۆیە شێخی (إعانة الطالبين) (**السيد أبو بكر بن السيد محمد شطا الدمياطي ثم المكي الشافعي الشهير بالسيد البكري المتوفى١٣١٠هـ**) لە شێخی(**ابن حجر المكي**) وە نەقڵی کردووە لە شەرحی ئەو فەرمودەدا ئیمامی شافیعی(رحمة الله عليه) فەرمویەتی: « ما أحدث وخالف كتاباً أو سنةً أو إجماعاً أو أثراً فهو البدعة الضالة، وما أحدث من الخير ولم يخالف شيئا من ذلك فهو البدعة المحمودة » پاشان شێخی (إعانة) دەفەرموێت: « والحاصل أن البدع الحسنة متفق على ندبها، وهي ما وافق شيئاً مما مر، ولم يلزم من فعله محذور شرعي. ومنها ما هو

---

١. (رواه البخاري في صحيحه عن أم المؤمنين سيدتنا عائشة (رضي الله عنها): (٢ / ٩٥٩) برقم(٢٥٥٠).

فرض كفاية، كتصنيف العلوم »[1]. كە لە پێشتریشەوە ئەم دەقەمان نەقڵ کردووە.

لە نمونەی بیدعەتی خراپ: دەستکاری کردنی بەندێکە لە بەندەکانی شەریعەت وەك تەئخیرکردنی نوێژەکان لە کاتی دیاری کراو بە بێ هۆیەکی شەرعی، ئەو بیدعەتە خراپەش بۆ یەکەم جار کاربەدەستان دایدەمەزرێنن وەك ئەم فەرمودەی حەزرەت (ﷺ) روونی کردووەتەوە وەك ئیمامی (البیهقی) لە (السنن الکبری) یدا ریوایەتی کردووە لە (القاسم بن عبد الرحمن بن عبد الله بن مسعود عن أبيه عن جده (رضي الله عنهم) مرفوعاً: «ستكون بعدي أمراء يؤخرون الصلاة عن مواقيتها، ويحدثون البدعة..»[2]. لە (مسند)ی ئیمامی ئەحمەدیشدا هاتووە بەم شێوە: « عن عبد الله بن صامت عن أبي ذرٍ قال قال لي رسول الله (ﷺ): يا أبا ذر إنه سيكون عليكم أمراء يؤخرون الصلاة عن مواقيتها فإن أنت أدركتهم فصل الصلاة لوقتها..»[3].

هەروەها زانای پایە پەرز ئیمام (**الحافظ عبد الرحمن بن إسماعيل الشافعي المتوفى ٦٥٦هـ**) ناسراو بە (الحافظ أبو شامة الدمشقي) دەفەرموێت: «فالبدع الحسنة متّفقٌ على جواز فعلها، والاستحباب لها، ورجاء الثواب لمن حسنت نيته فيها، وهي كُلُّ مبتدَعٍ موافقٍ لقواعد الشريعة، غير مخالفٍ لشيء منها، ولا يلزم من فعله محذورٌ شرعيٌّ، وذلك نحو: بناء المنابر والرُّبَط والمدارس وخانات السبيل وغير ذلك، من أنواع البر التي لم تعد في الصدر الأول، فإنه

١. بنواڕە: إعانة الطالبين على حل ألفاظ فتح المعين: للسيد البكري: (١ / ٣١٣).

٢. السنن الكبرى للبيهقي بتحقيق محمد عبد القادر عطا (٣ / ١٢٤)برقم(٥٠٩٧).

٣. قال المحقق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح وهذا إسناد حسن مسند أحمد بن حنبل (١٦٩/٥)برقم(٢١٥٢٨).

موافقٌ لما جاءت به الشريعة من اصطناع المعروف والمعاونة على البر والتقوى»[1]. واتە: « زانایان یەکدەنگن لە سەر دروستی ئەنجامدانی داهێنراوی چاك، وە پێیان وایە کارێکی موستەحەبب و پەسەندە، رەجاش وایە لای خوای گەورە (جل جلاله) کە پاداشتی لە سەر بداتەوە ئەگەر کەسێك بە نییەتێکی باش هەستابێت پێی، چونکە بیدعەتی چاك بریتی یە لە هەر داهێنراوێك کە موافیق بێت بۆ یاساکانی شەریعەت، وە پێچەوانەی هیچ یاسایەکی شەرعی نەکات، هەروەها هیچ قەدەغەلێکراوێکی شەرع نەیەتەکردن لە جێبەجێکردنیدا، لە نمونەی دروستکردنی مینبەری مزگەوتەکان، ریباتەکان (خانەقاه) قوتابخانەکان، جێگای حەسانەوە لە رێگاکاندا و جگە لەمانەش لە جۆرەکانی خێرو چاکە کە لە سەرەتای ئیسلامدا نەبوبێت و پاشتر داهێنرابێت، ئەم جۆرە داهێنراوانە تێکڕایان رێك و موافیقن لە تەك ئەو ئامانجانەی کە شەریعەتی ئیسلام بۆی هاتووە کە بریتی یە لە چاکە خوازی و یارمەتیدانی یەکتر لە سەر چاکە و خودا پەرستی ».

پاشان دەفەرموێت: « وقد قال الإمام (**أبو سليمان الخطابي**) (رحمه الله تعالى) في شرح قوله (ﷺ): « كل محدثة بدعة»: هذا خاصٌ في بعض الأمور دون بعض، وهي شيء أحدثَ على غير مثال أصلٍ من أصول الدين، وعلى غير عبادته وقياسه، وأما ما كان منْها، مَبْنيّاً على قواعد الأصول، ومردوداً إليها، فليس بدعةً، ولا ضلالةً، والله أعلم»،[2] واتە: « ئیمام (أبو سليمان الخطابي) (رحمه الله تعالى) لە شەرحی فەرمودەکەی پێغەمبەردا(ﷺ): «

١. (الباعث على إنكار البدع والحوادث) للحافظ أبي شامة بتحقيق: عثمان أحمد عنبر:(ص ٢٣).

٢. الباعث على إنكار البدع والحوادث للحافظ الدمشقي: (ص ٢٤).

هەموو داهێنراوێك بیدعەتە» فەرمویەتی: « ئەم فەرمودەیە تایبەتمەندە بە هەندێ کاری داهێنراوەوەو هەندێکی تر ناگرێتەوە، کە بریتیی یە لە هەر شتێکی داهێنراو کە بە پێچەوانەی هاوێنەی ئەصڵێك لە ئەصڵەکانی ئایین بێت، واتە بە پێچەوانەی (بەڵگە شەرعییەکان)، هەروەها پێچەوانە بێت لەگەڵ بنەماکانی بەندایەتی یاخود قیاس کردن لە سەریان، بەڵام ئەگەر لە خودی بنەڕەت و ئەصڵەکانی ئایین بوو، یان دامەزرابوو لە سەر بنەڕەت ویاساو ئەصڵەکانی، وە دەکرا بگێڕدرێتەوە لە یەکچووندا بۆ سەر یەکێك لەو ئەصڵانە، ئەوە نە بیدعەتە و نە گومڕاییشە، والله أعلم ».

دواتر دەفەرموێت: « قلت: ومن هذا الباب إقراره (ﷺ) بلالاً (رضي الله عنه) على صلاته ركعتين بعد كل وضوء، وان كان هو (ﷺ) لم يشرع خصوصية ذلك بقولٍ ولا فعلٍ، وذلك لأن باب التطوع بالصلاة مفتوحٌ إلا في الأوقات المكروهة، ومن ذلك إقراره (ﷺ) الصحابي الآخر على ملازمة قراءة (قل هو الله أحد) دون غيرها من السور». واتە: « دەڵێم: ئا لەم بابەیە (واتە داهێنراوی چاك) دانپێدانان و ئیقراری حەزرەت (ﷺ) بۆ کارە داهێنراوەکەی بیلالی حەبەشی(رضي الله عنه) کە بریتی بوو لە داهێنانی دوو رکاعەتی پاش دەستنوێژ، با ئەویش (ﷺ) تایبەتمەندییەکی لەو رووە تەشریع نەکردووە نە بە ووتەو نە بە کردار، چونکە دەرگای کردەوەی خۆبەخشی و تەتەووع لە نوێژکردندا کراوەیە، مەگەر لە هەندێ کاتدا کە نوێژکردن تیایدا کەراهەتی هەیە، هەروەها لەم جۆرەیە ئیقراری پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هاوەڵێکی تری لە سەر بەردەوامبوون و مولازەمەی بە تەنها بۆ خوێندنی سورەتی (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) نەك سورەتەکانی دیکەی قورئان ».

ئينجا دەفەرموێت: « وأمّا البِدَعُ المستقبحة فهي التي أردنا نفيها بهذا الكتاب، وإنكارها، وهي كل ما كان مخالفاً للشريعة، أو ملتزماً لمخالفتها، وذلك منقسمٌ الى محرّم، ومكروه، ويختلف ذلك بإختلاف الوقائع، وبحسب ما به من مخالفة الشريعة، تارة ينتهي ذلك الى ما يوجب التحريم، وتارة لا يتجاوز صفة كراهة التنزيه، وكل فقيه موفّق يتمكّن بعون الله من التمييز بين القسمين مهما رسخت قدمه في إيمانه وعلمه..»[1].

واتە: « بەڵام داهێنراوە ناشیرینەکان ـ کە ئەم کتێبەمان داناوە لە بەر رەتکردنەوەی داهێنراوە خراپەکان و بەرپەرچدانەوەیان ـ بریتییە لە هەر شتێك پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامەوە داهێنرابێت، یاخود ئیلتیزامێك دروستبکات کە خاوەنەکەی بە پێچەوانەی شەریعەتەوە هەڵس و کەوت بکات، کە ئەویش دەکرێت بە دوو بەشەوە: بیدعەتی حەرام و بیدعەتی مەکروە، وە بە پێی خودی موخالەفەکەوەو جۆری روداوەکە حوکمەکەشی دەگۆڕدرێت، بە پێی جۆری ئەو سەرپێچییەی کە بەرانبەر شەریعەت ئەنجام دراوە، وە جاری واهەیە لە بەشی کەراهەتی تەنزیهی دەرناچێت، وە هەر زانایاکی شارەزا لە فیقهی ئیسلامیدا ئەتوانێت بە تەوفیق و یارمەتی خودا و بە چاوی بەصیرەت جیاکاری بکات لە نێوان هەردوو بەشەکەدا بە پێی قوڵداچوونی ئەو زانایە لە ئیمان و زانستدا».

---

١. الباعث على إنكار البدع والحوادث للحافظ أبي شامة الدمشقي: (ص ٢٤ـ ٢٥).

## ڕاڤەی فەرمودەی: « كل بدعة ضلالة.. ».

پێشەوای بەرزی ئیسلام (**الفقيه المحدّث شهاب الدين أحمد ابن حجر المكي الهيثمي الشافعي المتوفى ٩٧٤هـ**) لە (الفتاوى الحديثية)دا دەفەرموێت: « كل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار » محمول على المحرَّمةِ لا غير » واتە: « ئەو فەرمودەیە تایبەتمەندە بە داهێنراوی حەرامەوە نەك باقی داهێنراوەكانی دی»[1].

هەروەها (**ابن تيمية أحمد بن عبد الحليم الحراني المتوفى ٧٢٨هـ**) كە یەكێك بووە لە زانایانی چەرخی هەشتەمی كۆچی ولە نێو زانایانی خەلەف هەژماركراوە و بە مەزهەب حەنبەلی بووە_ با ئەوانەی كە بەردەوام تەقلیدی دەكەن كتێبی (**منهاج السنة النبوية**)ی بخوێننەوە كە تیایدا دانی ناوە بە تەقسیمی بیدعەت بۆ باش و خراپ، وەك بە روونی هەستی پێدەكرێت لە پێناسەی بیدعەتی شەرعیدا كە دەڵێت: « إن البدعة الشرعية التي هي ضلالةٌ، هي: ما فُعِلَ بغيرِ دليلٍ شرعيّ، كاستحباب ما لم يحبه اللهُ، وإيجاب ما لم يوجبْهُ اللهُ، وتحريم ما لم يحرِّمْهُ اللهُ، فلا بد مع الفعل من اعتقادٍ يُخالف الشريعة »[2]، واتە: « بیدعەتی شەرعیی كە گومڕاهیی بێت بریتی یە: لەو كارەی كە بكرێت بە بێ بوونی هیچ بەڵگەیەكی شەرعی، وەك بە چاك زانینی كردەوەیەك كە خوای گەورە بە چاكی دانەنابێت، یاخود بە واجیب كردنی كارێك كە پەروەردگار بە واجیبی دانەنابێت، یاخود قەدەغەكردن و حەرام كردنی كارێك كە خودا بە حەرامی دانەنابێت،

---

١. بنوارە: (الفتاوى الحديثية: مطلب في الاجتماع للموالد والأذكار.. ومطلب في تفريق البدعة وأنها تعتريه الأحكام الخمسة لابن حجر الهيتمي: ص ١٥٠ ـ ١٥١).

٢. منهاج السنة النبوية لابن تيمية بتحقيق: د. محمد رشاد سالم: (٨ / ٣٠٨).

هەروەها بەمەرجێك خاوەنی بیدعەتەكە لە كاتێكدا ئـەنجامی داهێنراوەكـە دەدات دارای بیرو باوەڕێك بێت بە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلام».

كەواتە: بۆمان روون بویـەوە كـە (ابـن تیمیـة) یـش مـەرجی هەیـە بـۆ ناونانی بیدعـەت بـە گـومڕایی، وە بـە پێـی مـەفهومی دەقەكـەی هـەركات یەكێك لەو مەرجانە هاتەدی لە داهێنراوەكەدا: « كأن استحب عمـلا قبيحـا عند الله تعالى، أو أوجب على الناس عملاً لم يوجبه الله تعالى عليهم، أو حرّم علـيهم شـيئاً كـان مباحـا في شـرع الله تعـالى »، ئـەو كـات داهێنراوێكـی نـا دروسـت دەبێـت و خاوەنەكـەی بـەرەو گـومڕایی دەبـات، بـەڵام ئەگـەر داهێنراوەكە گومڕایی نەبوو بەڵكو ئەنجامدرا بە پێـی عومـومی بەڵگەیـەكی شەرعی، یان موافیقی یاساكانی (وجـوب) یـان (اسـتحباب) بـوو، هـەروەها ئـەوەی خـودا حـەرامی كردبـوو داهێنراوەكـە حـەڵاڵی نـەكردبوو، وە بـە نییـەتێكی چـاك ئەنجامـدرا، ئـەوا بیدعـەتێكی چـاكە بـە پێـی مـەفهومی دەقەكەی سەرەوەی..بەڵام زۆر بەداخەوە كێشـەی زۆرێـك لـەو بەڕێزانـەی كە ئەمڕۆ كاری داهێنـراوی چـاك بـە خـراپ دەزانـن، یـان تێنەگەشـتنە لـە بەڵگەو عیبارەتی زانایان، یاخود خۆبەهەڵەدا بردنە وموكابەرەی حەقیقەت و راستییەكانە، خوا پەنامان بدات.

## مەبەست لە فەرمودەی «كلُّ بدعة ضلالة.. » حوكمێكی گشتی و كوللیی و رەها نییە

بەو پێیەی كە رابوورد دەتوانین بڵێین: مەبەسـت لـە فـەرمودەی (كـل بدعة ضلالة) حوكمێكی گشتی و كوللیی و رەها نییـە. بـەڵكو عیبارەتەكـە لە بەكارهێنانە مەجازیەكانە، وەك ئایەتەكەی قورئان وایە كە لـە وەصـفی

ئـەو بـا ڕەشـە بـەهێزەدا کـەخوای گـەورە بـە هۆیـەوە تۆڵـەی لەقـەومی حەزرەتی هود(علیه السلام) سـەندەوە، دەفـەرمووێت: ﴿تُـدَمِّرُ كُـلَّ شَـيْءٍ بِـأَمْرِ رَبِّهَـا﴾[1] واتـە: « باڕەشـەکە هـەموو شـتێك تێـك و پێـك دەدات بـە فەرمانی پەروەردگاری»، بێگومان خـۆ هـەموو شـتێکی نەفەوتانـد، بـەڵکو تەنیا بیّ باوەڕەکـانی لـەناوبردو لـە ناوچـەی ئەحقافیشـدا بـە تایبـەت کـە دۆڵێکەو کەوتووەتە ولاّتی یەمەنەوە[2].

هەروەها هەمان (مجـاز) واتـە بـەکارهێنانی وشـەی (کـل) و مەبەسـت پێی(جزء) بێت[3] مەبەستن لەو جۆرە فەرموودانەدا.

**فەرمودەی «کل بدعة ضلالة.. » لە بابی ( حذف المضاف )ە بە پێی رای هەندێکی تر لە زانایانی تەفسیر و فەرمودەو زامانەوانی.**

دروستیشە بگوترێت: فەرمودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لـە بـابی (حـذف الصفة) یە، واتە: تەئویلی فەرمودەکە بەم شێوەیەی لێدێتەوە: (کـل بدعـة قبیحة ضلالة) واتە: هەر بیدعـەتێکی خراپـە کـە شـەرع بەناشـرینی بزانـی گومڕایی یە بەم جۆرە داهێنراوی چاك لە داهێنراوی خراپ جیا دەبێتـەوە. بەڵگەشمان بۆ ئەم واتایە ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَكَـانَ وَرَاءَهُـمْ مَلِـكٌ يَأْخُـذُ كُـلَّ

---

١. (سورة الأحقاف: ٢٥).

٢. بنـواڕە: (المستصـفى في علـم الأصـول للغزالـي: (٢/ ٩٨)، الجـامع لأحكـام القـرآن للقـرطبي: ٢٠٦/١٦، شرح النووي على صحيح مسلم: (١٥٥/٦، ١٤٤/٧)، تفسير الجلالين بحاشـية الشـيخ أحمد الصاوي: (٦٧/٤).

٣. یاخود یاسای: (العام المراد به الخاص) وەك لـە کتێبـە ئوصـولیەکاندا باسـکراوە واتـە: ئـەو دەقانـەی کـە بـە گشـتی هـاتوون بـەلاّم تـەنیا چـەند حاڵـەتێك تیایانـدا مەبەسـتە،، بنـواڕە: (المستصفى للغزالي: (٢ /٩٨– ١٠٢). جمع الجوامع لابن السبكي: (٢/ ٤).

سَفِينَةٍ غَصْبًا﴾[1] یە، کە زاهیری ئایەتەکە ئەوە باسدەکات لەسەر زوبانی حەزرەتی (خَضِرْ علیە السلام) کە لەو شارەدا پادشایەك هەبووە هەموو کەشتییەکی بردووەو پەلاماری داوە، کە بێگومان ئەو پادشایە پەلاماری هەموو کەشتییەکی نەئەدا، بەڵکو تەنها کەشتییەکی دەبرد کە ساغ و بێ عەیب بوایە، کەواتە (صفة) تێك لادراوە وەك (صالحة) یان(سلیمة) یان (جیدة) لە پاش (سفینة) کە (موصوف)ەکەیە، چونکە (سیاق)ی کەلامەکە واتاکەی دەیگەیێنێت، بۆیە واتای ئایەتەکە بە ئیجماعی زانایانی تەفسیر بەم جۆرەیە: (یأخذ کل سفینةٍ صالحةٍ أو سلیمة غصباً)، لەو زانایانە: (**القرطبي**) و (**ابن كثير**) (رحمهما الله) باسیان کردووە [2].

هەر لەبەر ئەوەش بوو کە حەزرەتی (خضر علیە السلام) کەشتییەکەی عەیب دارکرد، چونکە دەیزانی ئەو پادشایە کەشتییەك نابات کە عەیب دار بێت [3]، کەواتە: (تەقدیری) فەرموودەکەی حەزرەتیش (ﷺ) لە ڕووی واتاوە بەم شێوەی لێدێتەوە(کل بدعة قبیحة ضلالة).

ئەم جۆرە عیبارەتانە لە زمانی عەرەبیدا پێی دەگوترێت: (**باب حذف الصفة أو النعت**)، وەزانایانی زانستی (النحو) بۆ ئەو بابە بەو ئایەتەی

---

١. (سورة الكهف:٧٩).

٢. تفسير الجامع لأحكام القرآن للقرطبي: (١١/٣٦) و تفسير القرآن العظيم لابن كثير:(٣/١٢٠).

٣. (الجامع لأحكام القرآن للقرطبي: (١١ / ٣٤ـ٣٥)، تفسير البيضاوى مع حاشية شيخ زاده الحنفي: (٣/ ٢٧٢)، تفسير الجلالين بشرح الصاوي: (٣/٢٠)، مواهب الرحمن في تفسير القرآن للعلامة عبد الكريم المدرس: (٥/٢٨٥.٢٨٤).

سەرەوەو هاو وێنەکانی نمونەیان هێناوەتەوە،[1]، هەروەها بە فـەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە حەزفی صـیفەتی تیـادا کـراوە نمونـەیان هێناوەتـەوە وەك دەفـەرموێت: ‹ لا صـلاة لجـار المسـجد إلا في المسجد › [2] واتـە: (لا صلاة كاملةً أو مقبولةً موجودةٌ إلا في المسجد) هەروەها ستایشی هەندێك لە عەرەب بۆ حەزرەتی عومەر (رضي الله عنه) کـە دەیـانگووت پێـی: « کـان والله رجلًا...) واتە: (كان رجلا عظيمًا، كريما، شجاعا فاضلا أو نحو ذلـك)، یـاخود حـەزرەتی عـەلی (رضـي الله عنـه) دەربـارەی حـەزرەتی عومـەر دەیگووت: « سمعته يخطب فكـان الخطيـب..» مەبەسـتی ئـەوەبوو (فكـان الخطيب البارع أو الفصيح) وهكذا[3].

هەروەها زانای زمانەوانی (**أبـي الفـتح ضـياء الـدين الموصـلي**) لـەم رووەوە دارشتەکانی لابردنی صیفەتمان بۆ بـاس دەکـات کـە پێویسـتە قەرینەیـەك هەبێت دەلالەت لەسەر ئەو مەحزوفە بکات، یـان لـە پـێش عیبارەتەکـەوە یاخود لە دوای عیبارەتەکە، یاخود قەرینەیەکی دەرەکی هـەبێت، کـە بـێ ئـەو حـەزفکراوە واتاکـە نـا شایسـتە بێـت، وە نمونـەی بـۆ هەرسـێکیانی هێناوەتەو وەك دەفەرموێت: «..وكذلك تقول (سألناه فوجدناه إنساناً) أي إنسانا سمحاً أو جواداً أو ما أشبهه فعلى هذا ونحوه تحذف الصفة فأمـا إن عريت عن الدلالة عليها من اللفظ أو الحال فإن حذفها لا يجـوز، وقـد تأملـت حذفها فوجدته لا يسوغ إلا في صفة تقدمها ما يـدل عليهـا أو تـأخر عنهـا أو

---

١. (ابن هشام الأنصاري) لە(أوضح المسالك في شرح ألفية ابن مالك) (٣ / ٣٢٢): دەفەرموێت: « ويجوز حذف النعت إن عُلِمَ، كقولـه تعالى:(يَأْخُـذُ كُـلَّ سَـفِينَةٍ غَصْـباً) أي: كـلَّ سـفينةٍ صـالحةٍ، وقول الشاعر: (فَلَمْ أُعْطَ شَيْئاً وَلَمْ أُمْنَعِ..) أي: شيئاً طائلاً..».

٢. رواه البيهقي في سننه الكبرى:(٣/٥٧) برقم(٤٧٢٤) عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

٣. بنوارە: (الخصائص لأبي الفتح ابن جني: بتحقيق: محمد علي النجار: (٢ / ٣٧١).

فهم ذلك من شيء خارج عنها، أما الصفة التي تقدمها ما يدل عليها فقوله تعالى: ﴿أَمَّا السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ فَأَرَدْتُ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَاءَهُمْ مَلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا﴾ [1] فحَذَفَ الصفةَ أي: كان يأخذ كل سفينة صحيحة غصباً، ويدل على المحذوف قوله: (فأردت أن أعيبها)، فإن عيبه إياها لم يخرجها عن كونها سفينة، وإنما المأخوذ هو الصحيح دون المعيب، فحذفت الصفة ههنا لأنه تقدمها ما يدل عليها، وأما التي تأخر عنها ما يدل عليها، فقول بعض شعراء الحماسة:

كُلُّ امرِيءٍ سَتَئِيمُ[2] مِنْهُ * الْعِرْسُ أَوْ مِنْهَا يَئِيمُ [3]

فإنه أراد كل امريء متزوج، إذ دل عليه ما بعده من قوله: (ستئيم منه أو منها يئيم)، إذ لا تئيم هي إلا من زوج، ولا يئيم هو إلا من زوجة، فجاء بعد الموصوف ما دل عليه، ولولا ذلك لما صحّ معنى البيت، إذ ليس كل امريء يئيم من عرس إلا إذا كان متزوجاً، وأما ما يفهم حذف الصفة فيه من شيء خارج عن الكلام فقول النبي(ﷺ): « لا صلاة لجار المسجد إلاّ في المسجد »[4] فإنه قد علم جواز صلاة جار المسجد في غير المسجد من غير

---

١. (سورة الكهف:٧٩).

٢. (سَتَئِيْمُ): واته: بێزار دەبێت و تاقەتی لێی دەچێت.

٣. ئەو بەیتە شیعرە (يزيد بن الحكم الثقفي) ووتویەتی لە (القصيدة الأدبية الحكمية)ەیدا کە تیایدا بەدری کوڕی خۆی ئامۆژگاری دەکات و وەسییەتی بۆ دەکات کە دەڵێت:

كُلُّ امْرِيءٍ سَتَئِيمُ مِنْه... العِرْسُ أَوْ مِنْهَا يَئِيمُ
ما عِلْمُ ذي وَلَدٍ أَيَثْكُلُهُ... أم الوَلَدُ اليَتِيمُ

بنواڕە: فصل المقال في شرح كتاب الأمثال لأبي عبيد البكري، تحقيق: د.إحسان عباس + د.عبد المجيد عابدين: (١ / ٤٦٢).

٤. أخرجه البيهقي في السنن الكبرى: (٣ / ٥٧)(٤٧٢٤). عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

هذا الحديث، فعلم حينئذ أن المراد به: الفضيلةُ والكمال، وهذا شيء لم يعلم من نفس اللفظِ، وإنما عُلِمَ من شيء خارج عنه » [1].

هەروەها لەم بابەتەیە ووتەی شاعیر: (المرقّشُ الأكبر عمرو بن سعد (ت٧٥ ق.م) كە ووتویەتی:

وَرُبَّ أسِيلَةِ الخَدَّينِ بِكْرٍ * مُهَفْهَفَةٍ لَهَا فَرْعٌ وَ جِيدُ [2]

مەبەستی لێی: (لها فرعٌ فاحمٌ و جيدٌ طويلٌ) [3]. (فاحم) و (طويل) كە هەردووكیان سیفەتی پرچەكەن و حەزف كراون و دروستیشە، چونكە سیاقی كەلام داخوازیەتی و دەلالەتی لە سەر دەكات.

( **ابن مالك** ) یش( رحمه الله ) لە (ألفيّة) كەیدا ئەوەی باسكردووە كە دروستە ( منعوت، موصوف ) یان ( نعت، صفة ) لابـبرێت بكرێت ئەگەر مەعقول بوو لە كەلامدا، بەڵام زیاتر (موصوف) حەزف دەكرێت، وەك دەفەرموێت:

وَمَا مِنَ الْمَنْعُوتِ وَالنَّعْتِ عُقِلْ * يَجُوزُ حَذْفُهُ وَفِى النَّعْتِ يَقِلّ [4]

(ابن عقيل) لە شەرحی بەیتەكەدا دەفەرموێت: « أي يجوز حذف المنعوت وإقامة النعت مقامه إذا دلّ عليه دليل نحو قوله تعالى: {أنِ اعْمَلْ سَابِغَاتٍ} [5] أي: دروعا سابغات، وكذلك يحذف النعت إذ دلّ عليه دليل

١. المثل السائر لأبي الفتح الموصلي بتحقيق: محمد محيي الدين عبدالحميد: (٢/ ٩٦ ـ ٩٧).
٢. (أسيلة الخدين) گۆنا بەرز، (مفهفهه) ناوقەد باریك، (فرعٌ): پرچ درێژ، (جيد) گەردن بەرز.
٣. شرح الأشموني على ألفية ابن مالك:(١/١٩٨)، أوضح المسالك إلى ألفية إبن مالك:(٣/٣٢٦).
٤. (ألفية ابن مالك مع شرح ابن عقيل: ٣/ ٢٠٥).
٥. (سورة سبأ: ١١).

لكنه قليل، ومنه قوله تعالى: {قَالُوا الآنَ جِئْتَ بِالْحَقِّ}[1] أي: البيّن، وقوله تعالى: {إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ}[2]. أي الناجين »[3].

**فەرموودەی : «كل بدعة ضلالة.. » دروستيشە بگوترێت: تەخصيص كراوە بە فەرموودەی ‹ من سن سنة حسنة › و هاو وێنەكانی.**

هەر بۆيە زۆرێك لە زانايانی ئيسلام لەوانە: ئيمام (**محيي الدين النووي**) لە(تهذيب الأسماء واللغات) و(شرح صحيح مسلم)يدا و ئيمامی (**القرطبي**) لە تەفسيرەكەی دا و (**ابن علان الصديقي**) لە (دليل الفالحين)ی دا فەرموويانە[4]: فەرموودەی: « كل بدعة ضلالة » تايبەتە بەبيدعەتی خراپەوە، وە هەموو بيدعەتێ ناگرێتەوە، چونكە ئەو فەرموودەيە گشتييەو تايبەتمەند وتەخصيص بووە بە فەرموودەيەكی (صحيح)ی ديكەی حەزرەت (ﷺ) كە بريتييە لە فەرموويەتی: « مَنْ سَنَّ فِى الإِسْلاَمِ سُنَّةً حَسَنَةً فَلَهُ أَجْرُهَا وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَىْءٌ...»[5].

---

١. (سورة البقرة: ٧١).

٢. (سورة هود: ٤٦).

٣. (شرح ابن عقيل على الألفية: (٣ / ٢٠٥).

٤. بنوارە: (تهذيب الأسماء واللغات للنووي: (٣/٢٢)، شرح صحيح مسلم: (٦/١٠٤-١٠٥)، الجامع لأحكام القرآن للقرطبي: (٢/٨٧)، دليل الفالحين شرح رياض الصالحين لابن علان: (١/٤٤٤).

٥. ئيمامی موسليم لە صەحيحەكەيدا (كتاب العلم دا باب من سن سنة حسنة أوسيئة) (٢/٧٠٤) برقم(١٠١٧)لە (جرير بن عبدالله) وە (رضي الله عنهما) بەچەند رێگەيەك ڕيوايەتی كردووە. كە ئەمەيش دەقەكانيەتی: « من سن في الإسلام سنة حسنة فله أجرها وأجر من عمل بها بعده من غير أن ينقص من أجورهم شيء ومن سن في الإسلام سنة سيئة كان عليه وزرها ووزر من عمل بها من بعده من غير أن ينقص من أوزارهم شيء ». وفيه عنه أيضا بلفظ: «من سن في الإسلام

له (مسند أحمد بن حنبل)دا هاتووه له (أبي هريرة)وه (رضي الله عنه) بەم دەقە: « من سن خيرا، فاستُن به، كان له أجره كاملاً، ومن أجور من استن به لا ينقص من أجورهم شيئاً، ومن استن شراً فاستن به فعليه وزره كاملاً، ومن أوزار الذي استن به لا ينقص من أوزارهم شيئا »[1].

واتە: هەر کەسێك هەرکارێکی چاکی تازەی داهێنا و دایمەزراند، با لەوەو پێشیش نەبووبێ، ئەوا پاداشتی بە تەواوەتی دەدرێتەوە هی خۆیشی و ئەوانەش کە چاوی لێ دەکەن تا ڕۆژی قیامەت بە بێ ئەوەی لە پاداشتیان کەم ببێتەوە..».

لە بەر ئەم حەقیقەتەیە لە ریوایەتەکەی ئیمامی (الترمذي)دا حەزرەت (ﷺ) دوو مەرجی دیاری کردووە بۆ ناسینەوەی بیدعەت و داهێنراوی خراپ، مەرجی یەکەم: کارە داهێنراوەکە خودی خۆی یاخود خاوەنەکەی یاخود کۆمەڵگە بەرەو (ضلالة) و گومڕاهی بەرێت، مەرجی دووەم: « لا ترضي الله ورسوله(ﷺ)» بێت، واتە: کارە داهێنراوەکە جێگەی ڕەزامەندی خوداو پێغەمبەری خودا (ﷺ) نەبێت، وەك دەفەرمووێت: «من ابتدع بدعةً ضلالةً، لا ترضي اللهَ ورسولَهُ (ﷺ)، كان عليه مثل آثام من عمل بها...الحديث» [2].

---

سنة حسنة فعمل بها بعده، كتب له مثل أجر من عمل بها ولا ينقص من أجورهم شيء ومن سن في الإسلام سنة سيئة فعمل بها بعده كتب عليه مثل وزر من عمل بها ولا ينقص من أوزارهم شيء » صحيح مسلم: (٢٠٥٨/٤) برقم (١٠١٧).

١. بنوارە: (مسند أحمد بن حنبل: (٢ / ٥٢٠) برقم (١٠٧٥٩): قال المحقق شعيب الأرناؤوط: «إسناده صحيح على شرط الشيخين ».

٢. ئیمامی (الترمذي) لە(السنن) یدا (بتحقيق: أحمد محمد شاكر وآخرين): (٤٥/٥) برقم(٢٦٧٧) لە (عوف المزني عن أبيه عن جده) (رضي الله عنهم) ڕیوایەتی کردووە، پاشان فەرموویەتی: «هذا حديث حسن ».

کەواتە: ئەگەر بیدعەتەکە لە خودی خۆیدا(ضلالة) بوو، یاخود « لا ترضي الله ورسوله (ﷺ» بوو، ئەوا « كان عليه مثل آثام من عمل بها»، خراپەو گوناهی تەواوی ئەوانەی چاویان لێ کردووە لە سەر خاوەنی بیدعەتە خراپەکە دەنوسرێت.. بە پێچەوانەیشەوە حوکمەکە پێچەوانە دەبێتەوە: واتە ئەگەر کارە داهێنراوەکە بیدعەت و داهێنراوێکی چاك بوو، یاخود لە بەر رەزامەندی خوداو پێغەمبەری خودا(ﷺ) دامەزرابوو، لە بنەڕەتدا یاخود لە رووی چۆنیەتیەیەوە، وەك چۆنیەتی(الكيفيّة) کاری ئاهەنگی مەولوودنامەی حەزرەتی رسول الله (ﷺ)، کە ئەصڵی پێکهاتەکانی هەمووی سوننەتە، بەڵام دارشتنەوەی برگەکانی بەم شێوەی ئێستا داهێنراوێکی باشە، یان وەك چۆنیەتی خوێندنی صەڵاواتی پاش بانگی پیرۆز، کە بەدەنگی بەرز دەخوێرین..هتد ئەوا داهێنراوێکی پیرۆز و چاکەو خاوەنەکە پاداشتی لەسەر وەردەگرێتەوە هی خۆیی و ئەوانەش کە چاوی لێ دەکەن تا رۆژی قیامەت.

بۆیە لە بەر ئەو حەقیقەتانەی کە رابوردن (زانایانی فیقهوفەرمودە) گوتویانە: فەرمودەی: « كل بدعةٍ ضلالة» (تەخصیص) کراوە بەو کۆمەڵە فەرمودەی کە پێشتر باسمانکردن. چونکە وەك زانایانی ئوصولْ دەڵێن: «ما من عام إلا وقد خُصِّصَ »[1] واتە: « هیچ دەقێکی گشتی نییە ئیللا تایبەتمەند کراوە»[2].

---

١. تيسير التحرير للأمير بادشاه على كتاب التحرير لابن الهمام الحنفي: (٢٠٢/١). الموافقات للشاطبي: بتحقيق: أبو عبيدة مشهور بن حسن آل سلمان: (٩٦/٨). و الإبهاج في شرح المنهاج للسبكي وولده التاج: (٢/ ١٤)،١٠ و إجابة السائل للصنعاني: (ص٣٠٩).

٢. بۆ واتاو نمونەو بەڵگەکانی ئەو قاعیدە بگەڕێرەوە بۆ لاپەڕەکانی توێژینەوەی (دانەر) بە ناونیشانی: (حُكم التخصيص بقول الصّحابي عند الأصوليين): د. حسن خالد مصطفى

## ( گۆڕینی ( کەیفییەت ) چۆنیەتی ئەنجامدانی سوننەتێك لە بەر بەرژەوەندییەکی مەبەستدار لای زانایان پێی ناگوترێت بیدعەت )

بەڵێ، گۆڕینی چۆنیەتی (الكيفية) لە بەر مەصڵەحەتێکی موعتەبەرەی مەبەستدار کارێکی باشەو هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) کاریان پێ کردووە، ئەوەتانێ خەلیفەی ئیسلام حەزرەتی عومەر(رضي الله عنه) زۆر جار بە دەنگی بەرز نزای (استفتاح ـ الثناء)ی نێو نوێژی خوێندووە، لە کاتێکدا سوننەتە بە دەنگی نزم بخوێندرێت، مەصڵەحەتەکەش بریتییە لە فێرکردنی خەڵکەکە یاخود وەبیرهێنانەوەیان، وەك لە (صحيح مسلم)دا هاتووە: «حدثنا محمد بن مهران الرازي حدثنا الوليد بن مسلم حدثنا الأوزاعي عن عبدة أن عمر بن الخطاب كان يجهر(أي في صلاته) بهؤلاء الكلمات يقول: سبحانك اللهم وبحمدك تبارك اسمك وتعالى جدك ولا إله غيرك»[1].

گۆڕینی کەیفییەتی پیادەکردنی سوننەتەکان تایبەتمەند نەبوە بە حەزرەتی عومەرەوە(رضي الله عنه) تا بگوترێت ئەو لە خولەفای راشیدینەو سوننەتی ئەوانیش سوننەتی خودی پێغەمبەرە(ﷺ)، بەڵکو هەندێك لە هاوەڵانی تری پێغەمبەریش(ﷺ) لەوانە: حەزرەتی (ابن عمر)، (ابن عباس)، (ابي هريرة) (رضي الله عنهم). چونیەتیەکەیان لە بەر هەندێ بەرژەوەندی دەستکاری کردووەو گۆڕیوەو ناشکرێت بگوترێت موبتەدیع بوون! ؟ وەك گۆڕینیان بۆ خوێندنی (التعوذ ـ أعوذ بالله من الشيطان

---

محمود المفتي، کە بڵاوکراوەتەوە لە گۆڤاری ئەکادیمی زانکۆی کۆیە، ژمارە(١٩) لە ساڵی (٢٠١١ز).

١. صحيح مسلم باب (حجة من قال: لا يجهر بالبسملة): (٢٩٩/١)برقم(٣٩٩).

الرجيم) ی ناو نوێژ له نهێنییەوه بۆ دەنگی بەرز لە کاتی پێویستدا بە مەبەستی خەڵك فێرکردن، و بەڵگەشیان تەنها قیاسکردن بووه لە سەر (البسلمة- بسم الله الرحمن الرحيم) کە دەنگ تیادا بەرز دەکرێتەوە، کە بێگومان ئەوەش دروستی قیاس و یەکساندکردن لە عیباداتدا دەسەرلمێنێت و رای (ابن تيميه)شی لە سەرە وەك پاشان باسی دەکەین.

لێرەدا جێگەی خۆیەتی جیاوازی زانایان لەو رووەوە باس بکەین وەك هاتووە لە (الموسوعة الفقهية الكويتية): لە ژێر ناونیشانی(الإسرار والجهر بالاستعاذة في الصلاة): دەڵێت: « للفقهاء في ذلك ثلاثة آراء: الأول: استحباب الإسرار. وبه قال الحنفية، وفي الفتاوى الهندية: إنه المذهب، ومعهم في هذا الحنابلة إلا ما استثناه ابن قدامة، وعلى هذا أيضا المالكية في أحد قوليهم، وهو الأظهر عن الشافعية، والدليل على استحباب الإسرار قول ابن مسعود (رضي الله عنه): أربع يخفيهن الإمام، وذكر منها التعوذ والبسملة وآمين. ولأنه لم ينقل عن النبي(ﷺ) الجهرُ. الرأي الثاني: استحباب الجهر، وهو قول المالكية في ظاهر المدونة، ومقابل الأظهر عند الشافعية، ويجهر في بعض الأحيان في الجنازة ونحوها مما يطلب الإسرارُ فيه تعليماً للسنة، ولأجل التأليف، واستحبها ابن قدامة وقال: اختار ذلك ابن تيمية. وقال في الفروع: إنه المنصوص عن أحمد، وسندهم في الجهر قياس البسملة على التسمية وآمين. الرأي الثالث: التخيير بين الإسرار والجهر، وهو قول للشافعية، جاء في الأم: كان ابن عمر رضي الله عنهما يتعوّذ في نفسه، وأبو هريرة رضي الله عنه يجهر به» [1].

---

١. بۆ زانینی ئەو دەقە و سەرچاوەکانی بگەڕێرەوە بۆ: الموسوعة الفقهية الكويتية: صادرة عن وزارة الأوقاف والشئون الإسلامية بالكويت: (٤ / ١٢-١٣).

ئەمە حەقیقەتێکە و وەهابیەکانیش دانیان پێدا ناوە، لەم رووەوە (عادل بن محمد بن فرحان البحيري الشمري) دەڵێت: « وكذلك لو فعل خلاف الأفضل لأجل بيان السنة وتعليمها لمن لم يعلمها كان حسنًا، مثل أن يجهر بالاستفتاح أو التعوذ أو البسملة ليعرف الناس أن فعل ذلك حسن مشروع في الصلاة، كما ثبت في الصحيح أن عمر بن الخطاب جهر بالاستفتاح، فكان يكبر ويقول: "سبحانك اللهم وبحمدك، وتبارك اسمك، وتعالى جدك، ولا إله غيرك". قال الأسود بن يزيد: صليت خلف عمر أكثر من سبعين صلاة، فكان يكبر، ثم يقول ذلك. رواه مسلم في "صحيحه"، ولهذا شاع هذا الاستفتاح حتى عمل به أكثر الناس. وكذلك كان ابن عمر وابن عباس يجهران بالاستعاذة، وكان غير واحد من الصحابة يجهر بالبسملة» [1].

بۆیە پێم وایە بە پێی ئەو دەقانە ئەم دەکرێتە قاعیدە: هەرکات بەرژەوەندی بینرایەوە دروستە چۆنیەتی سوننەت گۆڕان بێت بە سەریدا، نەك ئەصڵی سوونەتەکە، وەك ئەو نمونانەی کە باسمانکرد، هەروەها وەك خوێندنی ویردەکانی پاش نوێژ بە تەواوی و بە دەنگی بەرز بە ئەندازەی پێویست و بە هێمنی، بە مەبەستی فێرکردن و وەبیرهێنانەوە. (والله تعالى أعلم).

---

١. مفهوم أهل السنة والجماعة للبحيري: (ص ٢٩٢).

**فەرموودەی: « مَنْ سَنَّ سُنَّةً حَسَنَةً.. » دەقە لە سەر شایستەیی داهێنراوی چاك.. تاوتوێ كردن و شیتەڵكاری رێچكەی جیاواز لەو حەقیقەتە**

رەنگە بگوترێت: ئەم فەرمودەیە لە كاتێكدا بووە كە یەكێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) دەستپێشخەری كرد بە ئەنجامدانی صەدەقەیەك پاشان صەحابیەكانی دی چاویان لێكردوو دەستگیرۆیی كۆمەڵە هەژارەكەیان كرد وەك لە سەرەتای فەرمودەكەدا هاتووە، لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ راستە هۆكاری فەرمودەكە ئەو روداوە بوو، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەندە كردارەكەی ئەو صەحابیەی پێ خۆش بوو، حوكمێكی گشت گیری راگەیاند وفەرمووی هەركەسێك هەركارێكی چاكە دابمەزرێنێت.. هتد. ئەگەر نا حەزرەت(ﷺ) رووی دەكردە خودی كابرای دەسپێشخەر بۆ چاكەكە و دەیفەرموو « كردەوەیەكی چاكت دامەزراند بۆیان، وە پاداشتی هەموویانت دەست كەوت !» بە لام فەرمووی: « مَنْ سَنَّ سُنَّةً حَسَنَةً..»، « من سنّ خيراً..»، ئەمەیش روون و ئاشكرایە لای شارەزایانی زمان، كەواتە حوكمی فەرمودەكە تایبەتمەند نییە بەو كات و ساتەوە، هەر لە بەر ئەو راستییەشە زانایانی فیقهو ئوصوڵی فیقهی ئیسلامی بنچینەیەكیان باسكردووە فەرمویانە: « العبرة بعموم اللفظ لا بخصوص السبب) أو (العبرة بعموم الألفاظ لا بخصوص الأسباب» [1].

---

١. ئیمام (حجة الإسلام الغزالي لە (المستصفى) بتحقيق: محمد عبد السلام عبد الشافي: (ص٢٣٦) دەفەرموێت: « سبب ورود العام على سبب خاص لا يسقط دعوى العموم، كقوله (ﷺ) حيث مر بشاة ميمونة: « أيما إهاب دبغ فقد طهر »، وقال قومٌ: يسقط عمومه وهو خطأ، نعم يصير احتمال التخصيص أقرب ويقنع فيه بدليل أخف وأضعف، وقد يعرف بقرينة اختصاصه بالواقعة كما إذا قيل: كلّم فلاناً في واقعة، فقال: والله لا أكلمه أبداً، فإنه يفهم

واتــە: « عیــبرەت یــان ئیعتیبــار لــە کــار کــردن بــە دەقــی حوکمــە شەرعییەکانی کیتاب و سوننەت، بریتییــە لـە وەی کـە گشـت گـیر بکـرێن، نـەك تایبەتمەنـد بکـرێن تـەنها بـە هۆکارەکانـەوە»، وەك زۆرێکـی تـر لـەو حوکمانەی کە وارید بووە لە قورئـان و سـوننەتدا، هۆکارێـك یـان روداوێـك بووتە هۆ بـۆ دابـەزینی حوکمەکـە پاشـان واجیـب بـووە لـە سـەر تێکـڕای موســڵمانان کــە کــردەوەی پێبکــەن، وەك حــەرام کردنــی شــەراب و مسئەلەکانی (ظهار) و(طلاق) و هتد.

## وەڵامدانەوە و بەتاڵکردنەوەی تەئویلی وەهابیەکان بۆ فەرمودەی: ‹ من سنّ سنة حسنة.. › لە هەشت رووەوە.

هەنـدێك ناحـاڵی لـە لوغـەت و زمـانی عەرەبیـدا و نـەزان لـە زانسـتی تەوفیق لە نێوان دەقەکاندا لە وەهابیەکان موکابەرەی حەقیان کردووە لـە بەرانبەر واتای راست و دروسـت و ئاشـکرای ئـەو فـەرمودەدا، بۆیـە پـاش ئـەوەی کــە نــەیانتوانیوە تانــە بــدەن لــە راســتیی ســەنەد و مــەتنی فەرموودەکە، هەستاون تـەئویلێکی غەڵـەت و بـێ ئەساسـیان کـردووە بـۆ واتای دەستەواژەی « مَن سنَّ» وگوتویانە: مەبەست لێی: «من عمل بسنةٍ

بالقرينة أنه يريد ترك الكلام في تلك الواقعة لا على الإطلاق، والدليل على بقاء العموم أن الحجة في لفظ الشارع، لا في السؤال والسبب »، وفي (الإبهاج في شرح المنهاج) للإمام تقي الدين السبكي وولده التاج بتحقيق: جماعة من العلماء: (٢/ ١٨٥) « فالصحيح الذي عليه الجمهور وبه جزم في الكتاب ان العبرة بعموم اللفظ لا بخصوص السبب »، وقال الشيخ ابن تيمية في (مجموع الفتاوى بتحقيق: عبد الرحمن بن محمد بن قاسم العاصمي النجدي): (٣١/٤٤): «العبرة بعموم اللفظ لا بخصوص السبب عند عامة العلماء».

حسنة للنبي (ﷺ)...» واتە: «هەرکەسێك کردەوە بکات بە سوننەتێکی چاکی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوا.. فله أجرها..».

## ئەم رێچکەو بۆچوونە نامۆیە بەتاڵە لە هەشت رووەوە:

١ـ ئەصلْ لە کەلامدا عەدەمی تەئویلە، واتە وەختێك تەئویل دروستە کە مانای زاهیری دەقەکە نەگونجاوبێت، بەڵام لێرەدا گونجاوە لە تەك بەڵگەکانی شریعەتدا.

٢ـ لا دانە لە مەنهەجییەتی خۆیان کە تەئویل نەکردنی دەقەکانە.

٣ـ ئەو تەئویلە بە پێچەوانەی راڤەکارانی فەرمودەکەیە لەوانە: (النووي، العسقلاني، القارئ، البدر العيني، القسطلاني، الكرماني، ..هتد».

٤ـ ئەو تەئویلە بە پێچەوانەی سیاقی فەرمودەکەیە چونکە لە کاتێکدا ئەوەی فەرموو پێغەمبەر (ﷺ) کە یەکێك لە هاوەڵانی خۆی هەستا بە ئەنجامدانی کارە چاکەکە،پێغەمبەریش (ﷺ)، فەرمووی: هەرکەسێك کارێکی چاك دابمەزرێنێت و خەڵکی چاوی لێ بکەن..هتد.

٥ـ ئەو تەئویلە بە پێچەوانەی راڤەی زانایانی شارەزای زمانەوانی یە بۆ ووشەی (سَنَنَ) کە بە واتای دانان و دامەزراندن هاتووە. (صَنَعَ) (وَضَعَ) (شَرَعَ) (فَعَلَ)(حَدَثَ). نەك (عَمِلَ). لە زمانی یاساوانانیشدا (سن القوانين) واتە (وضع القوانين).

٧ـ به هۆی چەند فەرموودەیەکی تری صەحیحەوە دەزانین کە واتای (سنَّ) بەمانای (دامەزراندنە) نەك (کردن) وەك فەرموودەی (ابن مسعود) بۆ قابیل کە لە صەحیح دا هاتووە: « فإنه أول من سنّ القتل » [١].

٨ـ بە گوێرەی ئەو تەئویلە سەقەتە باتیڵە بێت، نیوەی دووەمی خودی ئەو فەرمودە پێچەوانە دەبێت لە تەك نیوەی یەکەمیدا، چونکە ئەگەر واتای: « من سن سنة حسنة..» وەها بێت: « هەر کەسێك کردەوە بکات بە کردەوەیەکی چاکەی پێغەمبەر (ﷺ).. » ئەوا دەبێت واتای نیوەی دوووەمی فەرمودەکەش « ومن سن سنة سيئة..» ئاوا بێت: « هەر کەسێك کردەوە بکات بە کردەوەیەکی خراپی پێغەمبەر(ﷺ)..» کە ئەمەش نەك هەر غەڵەتە بەڵکو کوفریشە ! (والعياذ بالله تعالى من سوء الأدب والاعتقاد).

بۆیە پێشەوا (المحدث أبو الحسن المباركفوري) لە (مرعاة المفاتيح)دا دەفەرموێت: « إن وضع السنن وتأسيسها من باب التعليم المنتفع به » [٢]، واتە: داهێنان و دامەزراندنی ڕێگەو سوننەتی باش تێکڕای لە بابی فێرکردنی موسڵمانانە بە کاری باش و بە سوود.

---

١. متفق عليه من حديث ابن مسعود (رضي الله عنه) بنوارە: صحيح البخاري (٣ / ١٢١٣) برقم (٣١٥٧) وصحيح مسلم (٣ / ١٣٠٣) برقم (١٦٧٧).

٢. مرعاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح لأبي الحسن المباركفوري: (١ / ٣٠٧)

## چەند فەرموودەیەکی هاوواتا و مەبەست و هاو ئامانج لە تەك فەرموودەی: « من سن سنة حسنة.. ».

هەروەها لە نمونەی ئەو فەرمودانەی کە جەخت دەکەنەوە لە سەر گشتگیری حوکمەکان، ئەم فەرمودانەی لای خوارەوەن کە شەواهیدن لە سەر ئەوانەی رابوورد:

١ـ عن جرير بن عبد الله (رضي الله عنه) قال رسول الله (ﷺ): « لا يسنُّ عبدٌ سنةً صالحةً يعمل بها من بعده إلا كان له مثل أجر من عمل بها لا ينقص من أجورهم شيء، ولا يسن عبدٌ سنةَ سوءٍ يعمل بها من بعده، إلاّ كان عليه وزرها ووزر من عمل بها لا ينقص من أوزارهم شيء» [1].

٢ـ عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): « ما من داعٍ يدعو إلى هُدى، إلا كان له أجره وأجور من تبعه لا ينقص ذلك من أجورهم شيئا».[2]، واتە: هیچ کەسێك نییە کە بانگەشە بکات بۆ کارێکی باش داهێنراوێکی چاك، ئەوا ئەو کەسە پاداشتی خۆی و ئەوانەش کە چاوی لێدەکەن وەردەگرێتەوە بە بێ ئەوەی کە لە پاداشتی چاولێکارانی کەم ببێتەوە.. وە بە پێچەوانەیشەوە بێگومان تاوانی خۆشی ئەوانەش کە چاوی لێ دەکەن هەڵدەگرێت، وەك ئیمامی (مالك) لە کتێبی (الموطأ)یدا لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: « ما من داع يدعو إلى هدى إلا كان له مثل أجر من اتّبعه، لا ينقص ذلك من أجورهم شيئا، وما

١. رواه أحمد في المسند (٤/٣٦٢) برقم (١٩٢٢٩) ومسلم في صحيحه (٤/٢٠٥٨)برقم (١٠١٧).
٢. رواه أبو نعيم في حلية الأولياء وطبقات الأصفياء: (٩/٣٠٥).

من داعٍ يدعو إلى ضلالة إلا كان عليه مثل أوزارهم لا ينقص ذلك من أوزارهم شيئا»[1].

٣ـ عن عبد الله بن مسعود (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال: « مَنْ دَلَّ عَلَى خَيْرٍ فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ فَاعِلِه»[2]. واته: « هەرکەسێك هەر کارێکی خێر و چاکە، نیشانی خەڵکی بدات، ئەوا پاداشتی هەموو ئەو کەسانەی کە چاوی لێدەکەن لەو دامەزراوە باشەیدا لە بۆ دەنوسرێت ».

٤ـ عن ابن مسعود (رضي الله عنه) عن رسول الله (ﷺ) قال: « لا تقتل نفس ظلماً، إلا كان على ابن آدم الأول كفلٌ من دمها، لأنه أولُّ من سن القتل»[3]. واته: «هیچ کەسێك نی یە کە بە ستەمەم بکوژرێت ئیللا بکوژی یەکەم کە (قابیل)ە، بەشێکی لەو تاوانەدا هەیە، چونکە ئەو یەکەم کەس بوو ئەو داهێنراوە خراپەی داهێنا کە کوشتن بوو».

## رای پێشەوا (شيخ الإسلام محيي الدين النووي) لە دابەشکردنی کارە داهێنراوەکاندا

ئیمام (محيي الدين النووي) لە (شرح صحيح مسلم) دا ئەو فەرمودەیەی بە یەکێك لە یاساو بنچینەکانی ئیسلام داناوە بۆیە لە شەرحیدا دەفەرموێت: « وهذا الحديث من قواعد الإسلام، وهو أن كل من ابتدع شيئا من الشر كان عليه مثل وزر كل من اقتدى به في ذلك العمل مثل

---

١. الموطأ برواية يحيى الليثي بتحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي: (٢١٨/١) برقم (٥٠٩).

٢. رواه مسلم في صحيحه (١٥٠٦/٣) برقم (١٨٩٣).

٣. متفق عليه من حديث ابن مسعود (رضي الله عنه) بنوارە: صحيح البخاري (١٢١٣/٣) برقم (٣١٥٧) وصحيح مسلم (٣/ ١٣٠٣) برقم (١٦٧٧).

عمله إلى يوم القيامة، ومثله: « من ابتدع شيأ من الخير كان له مثل أجر كل من يعمل به إلى يوم القيامة »، وهو موافقٌ للحديث الصحيح: « من سن سنة حسنة ومن سن سنة سيئة » وللحديث الصحيح: « من دلّ على خير فله مثل أجر فاعله»، وللحديث الصحيح: « ما مِنْ داعٍ يدعو إلى هدى..وما من داع يدعو إلى ضلالة..» والله أعلم »[1].

## راى پێشەوا (المفسّر أبو عبد الله القرطبي) دەربارەی داهێنراو لە عیباداتدا

ئیمامی (القرطبي) مەرجی هەیە بۆ داهێنراو لە عیبادەتدا ئەوەش بریتییە لە پێویستی بەردەوام بوونی داهێنەر لە سەر کارە داهێنراوەکەی بۆ ئەوەی وەك بەنی ئیسرائیلی لێ نەیت کە کۆمەڵێك کاری چاکیان دامەزراند بەڵام هەندێکیان پابەند نەبوون پێیەوەو لە سەر ئەو کارەیان خوداش رەخنەی لێ گرتن، وەك دەفەرموێت: « ينبغي لمن ابتدع خيراً أن يدوم عليه، ولا يعدل عنه إلى ضده، فيدخل في الآية. وعن أبي أمامة الباهلي – واسمه صدى بن عجلان – قال: أحدثتم قيام رمضان ولم يكتب عليكم، انما كتب عليكم الصيام، فدوموا على القيام إذ فعلتموه ولا تتركوه، فان ناسا من بني اسرائيل ابتدعوا بدعا لم يكتبها الله عليهم، ابتغوا بها رضوان الله فما رعوها حق رعايتها، فعابهم الله بتركها فقال: (ورهبانية ابتدعوها ما كتبناها عليهم الا ابتغاء رضوان الله فما رعوها حق رعايتها) »[2].

---

١. شرح النووي على صحيح مسلم: ١١/ ١٦٦ باب بيان إثم من سن القتل برقم(٦٧٧).
٢. تفسير القرطبي: (١٧ / ٢٦٣-٢٦٤).

## راى پێشەوا ( حافظ الإسلام العسقلاني ) لە دابەشكردنى كارە داهێنراوەكاندا

هەروەها (الحافظ العسقلاني) لە (فتح الباري) يدا لە شەرحى فەرمودەى پێغەمبەر (ﷺ) كە فەرمويەتى: (قابيل) بەشێكى هەيە لە رۆژى قيامەتدا لە تاوانى كوشتارى تەواوى ئادەميزادا، چونكە ئەو يەكەم كەس بووە كە كردەوەى ناپەسەندى كوشتنى دامەزراندووە، دەفەرموێت: « فيه: أن من سنّ شيئا كُتب له، أو عليه» [1] واتە: لەم فەرمودەوە ئەوە وەردەگيرێت كە هەر كەسێك هەر كارێك دابمەزرێنێت و دايبهێنێت يان لە بۆى دەنوسرێت ئەگەر داهێنراوەكەى باش بێت، ياخود لە سەرى دەنوسرێت ئەگەر داهێنراوەكەى خراپ بێت ».

## راى ( القاضي الشوكاني ) لە دابەشكردنى كارە داهێنراوەكاندا

هەروەها ئيمام (القاضي أبو عبد الله محمد بن علي الشوكاني المتوفى ١٢٥٠هـ) لە (نيل الأوطار من أحاديث سيد الأخيار شرح منتقى الأخبار)دا عيبارەتەكەى (الحافظ العسقلاني) بە تەواوى نەقڵ كردووە، بەڵام نيسبەتى نەداوەتەوە پاڵى [2].

١. فتح الباري شرح صحيح البخاري للحافظ العسقلاني (المتوفى: ٨٥٢هـ)، بتحقيق: عبد العزيز بن عبد الله بن باز ومحب الدين الخطيب: (١٢ / ١٩٣).

٢. بنوارە: نيل الأوطار من أحاديث سيد الأخيار شرح منتقى الأخبار للشوكاني: مع تعليقات محمد منير الدمشقي: (٧ / ١٢٠).

## راى (الأمير الصنعاني) له دابەشكردنى كاره داهێنراوەكاندا

هەروەها ئیمامى (الصنعاني) لـه شـەرحى ئـەو فـەرمودەدا: « مَنْ دَلَّ عَلَى خَيْرٍ فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ فَاعِلِهِ » دەڵێت: ووشـەى (خـەیر) كـه پێغەمبـەر (ﷺ) بەكاریهێناوه له فەرمودەكەیدا خێرى دونیاو قیامەت دەگرێتەوه به بێ جیاكارى وەك دەفەرموێت: «ولفظ (خيرٍ) يشمل الدلالة على خير الـدنيا والآخرة، فَلِلّهِ درُّ الكلام النبوي، ما أشملَ معانيه، وأوضح مبانيـه، ودلالتـه على خير الدنيا والآخرة »[1].

## راى پێشەوا (الحافظ ملا علي القارئ الحنفي) له دابەشكردنى كاره داهێنراوەكاندا

هەروەها له بەر ئەم راستییەیە (الحافظ علي بن سلطان محمد القـارئ) له شەرحى ئەو فەرموودەدا پێناسەى بیدعەتى گومڕایى (ضلالة)ى كردووه بـەوەى (مـا أنكـره أئمـة المسـلمين) واتـه: ئـەو داهێنـراوەى كـه ئیمامـه بەرزەكانى موسڵمانان به نا دروستیان زانیوه، پاشان دەفەرموێت: « وقُيِّدَ البدعـةُ بالضـلالة، لإخـراج البدعـة الحسـنة » واتـه: ووشـەى (بیدعـەت) لـه فەرمودەكەدا تەقیید وبەستراوەتەوه به صیفەتێك كه بریتییـه لـه ووشـەى (ضـلالة)، بـۆ ئـەوەى بیدعـەتى جـوان و چـاك لـه حـوكمى فەرمودەكـه دەربچێت، پاشان دەڵێت: « لا يرضـاها الله ورسـوله(ﷺ) » صـفةٌ كاشـفةٌ

١. (سبل السلام شرح بلوغ المرام للصنعاني بتحقيق: محمد عبد العزيز الخولي: (٤/ ١٧٠).

للضـلالة أو احترازيـةٌ للبدعـةِ »[1]. واتـه: قەیـدی دووەمـی: (لا یرضـاها الله ورسوله(ﷺ) » یاخود صیفەتی (بِدعـة) کەیـە لـە حاڵـەتێك کـە وەسـفدار بکرێـت بـە (ضـلالة)، واتـه: داهێنراوێکـی گـومڕایی کـە ئـەو کـات خـوداو پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) پێـی ڕازی نـابن، یـاخود ئـەو دەسـتەواژەیە: (لا یرضاها الله ورسوله(ﷺ) » قەیدێکی ئیحتیرازییە بۆ ووشەی بیدعەکـە لـە داهێنراوێك کە (یرضاها الله ورسوله)، کە ئەوکات دەبێتـە قەیـدی دووەمـی (بیدعەت)، واتـه: ئەگـەر بیدعەتەکـە (ضـلالة) نـەبوو، یـاخود(یرضـاها الله ورسوله(ﷺ» بوو، ئەوا بیدعەتەکە (ضلالة) و گومڕایی نابێـت، بـەڵکو بـە پێچەوانەوە چاك و پاداشتی دەبێت.

## ڕای پێشەوا (المحدث عبد الحي بن عبد الحليم اللكنوي) لە دابەشکردنی کارە داهێنراوەکاندا

هەروەها بە درێژی: (العلامة المحدث عبد الحي بن عبد الحليم اللّكنـوي المتوفى ١٣٠٤هـ) لـە (التعليـق الممجّـد)دا بـە سـەر کتێبـی (الموطـأ)دا بـە بەڵگەی زیاتر و نمونەی زۆرتر ئەو حەقیقەتـەی ئاشـکراو نومایـان کـردووە کە هەموو بیدعەیەك مەرج نییە خراپ بێت[2].

لەمەی کە ڕابوورد دەردەکـەوێت کـە بیدعەیـەك خراپـەو خاوەنەکـەی لێیەوە گوناهبار دەبێت کە:

---

١. مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح للحـافظ مـلا علي بـن سـلطان محمـد القـارئ الحنفـي، بتحقيق: جمال عيتاني:(١/٣٧٨).

٢. بنوارە: (التعليق المُمَجَّد لموطّأ الإمام محمد على موطأ مالك بن أنس برواية محمد بن الحسـن: لعبد الحي اللكنوي، بتحقيق الدكتور تقي الدين الندوي: (١ / ٣٥٥).

یەکەم: کارێکی خراپ و گومڕایی بێت. دووەم: خوا و پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی ناڕازی بن.

کەواتە لە ڕووانگەی (مفهوم المخالفة)ی[1] ئەم فەرموودەیشەوە دیسانەوە بۆمان دەرکەوت کە کاری(بیدعەت) لە سەر دووبەشە: هێندێکی(ضلاله)یەو هێندێکی تری بە پێچەوانەوە ڕێ پێشاندەرو جوان و چاکەخوازییە.

## بە پێی فەرموودەکەی حەزرەتی عومەر ( نعمت البدعة هذه ) لە بابی عیباداتیشدا بیدعەتی حەسەنە هەیە

هەروەها ئەگەر بیدعەت و کاری نوێ و دامەزراندن و داهێنراو لە هەر بوارێکدا تەنانەت لە عیباداتیشدا هێندێکی چاك نەبوایە حەزرەتی عمر (رضي الله عنه) نەی دەفەرموو: « نعم البدعة هذه» [2] واتە: چەند بیدعەیەکی چاکە، لەکاتێکدا کە بینی حەزرەتی (أبي)ی کوڕی (کعب)

---

١. مەفهومی موخالفە: لای جومهوری زانایان کردەوەی پێ دەکرێ بەچەند مەرجێکی دیاری کراوە، بنوارە بۆ درێژەی ئەو باسە: (المستصفى من علم الأصول للغزالي: (٢/١٩١)، جمع الجوامع لابن السبكي:(١/٢٤٥).

٢. تەواوی فەرمودەکە وەك لە (صحيح البخاری)دا هاتووە: « عن عبد الرحمن بن عبد القاري أنه قال: خرجت مع عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) ليلة في رمضان إلى المسجد، فإذا الناس أوزاعٌ متفرّقون، يصلي الرجل لنفسه، ويصلي الرجل فيصلي بصلاته الرهط، فقال عمر: إني أرى لو جمعتُ هؤلاء على قارئ واحدٍ، لكان أمثل، ثم عزم فجمعهم على أبي بن كعب، ثم خرجتُ معه ليلة أخرى والناس يصلون بصلاة قارئهم، قال عمر(رضي الله عنه): (نعم البدعة هذه) والتي ينامون عنها أفضل من التي يقومون، يريد آخر الليل، وكان الناس يقومون أوله». بنوارە: (صحيح البخاري بتحقيق د. ديب البغا(٢ / ٧٠٧) برقم(١٩٠٦).

(رضي الله عنه) بەئیمامەت خەڵکی کۆکردووەتەوەو نوێژی تەراویحیان بۆ دەکات بە بیست رکاعەت، لەکاتێکدا پێشتر صەحابیەکان هەریەکە بۆ خۆی و بە شێوازو و ژمارەیەك دەیانکرد: « أوزاعٌ متفرقون » وەك لە فەرمودەکەدا هاتووە، بۆیە وەك زانایان دەفەرموون: خۆ ئەو کارە کارێکی بیدعە بوو، بەلاَم بیدعەیەکی حەسەنە و چاك بوو، بۆیە حەزرەتی عومەریش(رضي الله عنه) هەر کە ئەو کارە تازە داهێنراوە چاکەی بینی بە بیدعەیەکی چاکی زانیی ودەمەودەست تەئیدو پشتگیری لیٚ کرد[1]، بۆیە هەموو ئەصحاب پێی رازی بوون وئیجماعێکی(سکوتی) لەسەر ئەو بیدعەتە جوان و چاکە دامەزرا[2]. وەك لە بەشێکی تایبەتدا لەمەودا دەیان نمونە دەهێنینەوە لە سەر بیدعەت لە عیباداتدا وتێکڕای زانایانی ئیسلامیش کاریان پیٚ کردووە.

## رای پێشەوا (الحافظ ابن عبد البر المالكي) لە دابەشکردنی کارە داهێنراوەکاندا

ئا لێرەدا (الحافظ ابن عبد البَرّ النمري المالكي(ت٤٦٣هـ) لە کتێبی: (الاستذكار)یدا لە شەرحی فەرمودەکەی حەزرەتی عومەردا: (نعمت البدعة): دەفەرموێت: « ما كان من بدعةٍ لا تخالف أصل الشّريعة والسنة،

١. بنوارە: (إحياء علوم الدين لحجة الإسلام الإمام الغزالي: (١/ ٢٠٢و ٢٧٧). و الجامع لأحكام القرآن للقرطبي المفسر:(٢/٦-٨٧).

٢. بنوارە: (كفاية الأخيار في حل غاية الاختصار لأبي بكر الحصني: (٥٤/١)، التاج الجامع الأصول للشيخ منصور علي ناصف: (٢ /٦٦).

فتلك نعمت البدعة»[1] واته: هەر بيدعەت و داهێنراوێك بە پێچەوانەی دامەزراوو دەقێكی شەريعەت و سوننەتەوە نەبێت ئەوە بيدعەتێكی جوان و پەسەندە.

## رای پێشەوا (سلطان العلماء عز الدين بن عبد السلام الشافعي) لە دابەشكردنی كارە داهێنراوەكاندا

هەروەها ئيمامی پايە داری ئوصولّی (عز الدين بن عبد السلام الشافعي) ناسراو بە (سلطان العلماء) لە (قواعد الأحكام في مصالح الأنام) دا بە درێژی ئەو راستيانەی روونكردووەتەوە، فەرمويەتی: بيدعەت بريتييە لە ئەنجامدانی كارێك كە لە عەهدی پێغەمبەردا (ﷺ) نە بوويێت، پاشان ئەوەی سەلماندووە كە مەرج نييە هەركارێك ئەو سەردەمە نەكرابێت ئيدی حوكم بكرێت بە دروستنەبوونی، بۆيە فەرمويەتی: ئەو داهێنراوو بيدعەتانەی كە پاش ئەو چەرخە داهێنراوون دەكرێن بە پێنج بەشەوە واتە: (البدعة الواجبة والبدعة المحرمة والبدعة المندوبة و البدعة المكروهة والبدعة المباحة) وە پێويستە بۆ ناسينەوەی هەر بەشێكيان داهێنراوەكە بدرێتە بەر پێنج ياساو بنچينەكانی ئەحكامی شەرعيی كە بريتين لە: (قواعد الوجوب وقواعد التحريم و قواعد المندوب و قواعد الكراهة و قواعد الإباحة)، پاشان (رەحمەتی خودای لە سەر بێت) بە جوانی نمونەی دروستی لە سەر هەر پێنج بەشەكە هێناوەتەوەو وەك دەفەرموێت: « فصل في البدعة: البدعة فعل ما لم يعهد في عصر رسول الله

---

١. (الاستذكار لمذهب علماء الأمصار فيما تضمنه الموطأ من المعاني والآثار لابن عبد البرّ: بتحقيق: سالم محمد عطا، محمد علي معوض: (٢ / ٦٧).

(ﷺ) وهي منقسمة إلى: بدعة واجبة، وبدعة محرمة، وبدعة مندوبة، وبدعة مكروهة، وبدعة مباحة، والطريق في معرفة ذلك: أن تعرض البدعة على قواعد الشريعة، فإن دخلت في قواعد الايجاب فهي واجبة، وإن دخلت في قواعد التحريم فهي محرمة، وان دخلت في قواعد المندوب، فهي مندوبة، وإن دخلت في قواعد المباح، فهي مباحة، و(للبدع الواجبة) امثلة: أحدها: الاشتغال بعلم النحو الذي يفهم به كلام الله وكلام رسول الله (ﷺ)، وذلك واجب، لأن حفظ الشريعة واجب ولا يتأتى حفظها إلا بمعرفة ذلك وما لا يتم الواجب إلا به فهو واجب، المثال الثاني: حفظ غريب الكتاب والسنة من اللغة، المثال الثالث: تدوين اصول الفقه، المثال الرابع: الكلام في الجرح والتعديل لتمييز الصحيح من السقيم، وقد دلت قواعد الشريعة على أن حفظ الشريعة فرض كفاية فيما زاد على القدر المتعين، ولا يتأتى حفظ الشريعة إلا بما ذكرناه. و(للبدع المحرّمة) أمثلة منها: مذهب القدرية ومنها مذهب الجبرية ومنها مذهب المرجئة ومنها مذهب المجسمة والرد على هؤلاء من البدع الواجبة، و(للبدع المندوبة) أمثلة منها: احداث الربط والمدارس وبناء القناطر، ومنها: كلُّ إحسان لم يُعْهَدْ في العصر الأول، ومنها: صلاة التراويح[1]، ومنها الكلام في دقائق التصوف، ومنها الكلام في الجدل في جمع المحافل للاستدلال في المسائل إذا قصد بذلك وجه الله سبحانه، و(البدع المكروهة) أمثلة منها: زخرفة المساجد ومنها تزويق المصاحف واما تلحين القرآن بحيث تتغير الفاظه عن الوضع العربي، فالأصح أنه من البدع المحرّمة، و(للبدع المباحة) أمثلة منها: المصافحة عقيب الصبح والعصر، ومنها التوسع في اللذيذ من

---

١. واته: ئەنجامدانی بیست رکاعەتی نوێژی تەراویح بە جەماعەت لە مزگەوتدا، کە حەزرەتی (أبي بن کعب(رضي الله عنه)دایمەزراندو و حەزرەتی عومەریش(رضي الله عنه) ئیقراری کردو و فەرمووی: « نعمت البدعة هذه» وەك لە شوێنی خۆیدا بە درێژی روونمان کردووەتەوە.

المآكل والمشارب والملابس والمساكن، ولبس الطيالسة، وتوسيع الاكمام، وقد يُختلف في بعض ذلك، فيجعله بعضُ العلماء من البدع المكروهة، ويجعله آخرون من السنن المفعولة على عهد رسول الله (ﷺ) فما بعده، وذلك كالاستعاذة في الصلاة والبسملة»[1].

## راى پێشەوا (شهاب الدين أبو العباس القرافي الأصولي المالكي) لە دابەشكردنی كارە داهێنراوەكاندا

هەروەها پێشەوای ئوصولّی: (أبو العباس شهاب الدين القرافي أحمد بن إدريس المالكي المتوفى ٦٨٤هـ) له كتێبه ناوازەكەی خۆیدا (الفروق): لە دووسەدو چواردەهەمین جیاوازیەكاندا لە سەر باسی (الْفَرْقُ بَيْنَ قَاعِدَةِ مَا يَحْرُمُ مِنْ الْبِدَعِ وَيُنْهَى عَنْهُ وَبَيْنَ قَاعِدَةِ مَا لَا يُنْهَى عَنْهُ مِنْهَا) وەك مامۆستاكەی (العز بن عبد السلام) ئەمیش تەقسیمی (خُماسي) پێنجینەیی بۆ داهێنراوەكان كردووە، واتە: بیدعەتی كردووە بە پێنج بەشەوە، وەك جۆرەكانی ئەحكامی شەریعەتی ئیسلام: (واجب ومندوب ومباح ومكروه حرام)، وە بۆچوونی هەندێك لە زانایانی پێش خۆیی لەو رووەوە راستكردووەتەوە و دەفەرموێت: « والحقُّ التفصيل وهو أنها خمسة أقسام (الأول): واجبٌ، وهو ما تناولته قواعد الوجوب وأدلته في الشرع، (الثاني): مُحَرَّمٌ، وهو ما تناولته قواعد التحريم وأدلته في الشرع، (الثَّالِثُ) مَنْدُوبٌ، وهو ما تناولته قواعد الندب وأدلته في الشرع، (الرَّابِعُ) مَكْرُوهٌ، وهو ما تناولته قواعد الكراهة وأدلتها في الشرع، (الْخَامِسُ): مُبَاحٌ، وهو ما تناولته

---

١. بنوارە: (قواعد الأحكام في مصالح الأنام للعز بن عبد السلام، دراسة وتحقيق: محمود بن التلاميد الشنقيطي: ٢/ ٢٠٧ ـ ٢١٠).

قواعد المباح وأدلته في الشرع..» پاشان به دووړو درێژی نمونـەی شـەرعی واقیعی هێناوەتەوە لە سەر هەر پێنج بەشەکەی بیدعەت[1].

## لێکدانەوەی بۆچوونی پێشەوا (أبو إسحاق الشاطبي المالكي) لە دابەشکردنی کارە داهێنراوەکاندا

ئیمام (أبو إسحاق الشاطبي)کە یەکێکە لە زانائوصولیەکانی مەزهـەبی ئیمامی مالیك ئەو تەقسیمە پێنج بەشیەی (بیدعەتی) لە ئیمـامی (القـرافي) و مامۆسـتاکەیەوە (العـز بـن عبـد السـلام) نـەقلێ کـردووە، لـە کتێبەکـەی (الاعتصـام)، پاشـان ویسـتویەتی تـەوفیق بخاتـە نێـوان رای ئەوانـەی کـە بیدعەت دابەش دەکەن، و رای ئەوانەی کە دابەشی ناکەن، وەك (ابـن أبـي زيد المالكي) کە پێی وایە هەمووی هەر خراپە، بـەو واتایـەی کـە داهێنـراو پێـی گـوترا بیدعــەتی شــەرعی ئیـدی تەقسـیم ناکرێـت، بۆیـە ئیمـامی (الشاطبي)یش لایەنگری ئـەم بۆچـونەیە، پاڵپشـتی بۆچوونەکەیشـی بـەوە دەکات کە بیدعەت لە حەقیقەتدا بۆیە خراپە چـونکە وەك دەڵێـت: «أن لا يدلّ عليها دليلٌ شرعيٌ، لا من نصوص الشرعِ، ولا من قواعـده، اذ لـو كـان هنالك ما يدل من الشرع علـى وجـوبٍ او نـدبٍ او إباحـةٍ لمـا كـان ثـمّ بدعـة، ولكان العمل داخلاً في عموم الأعمال المأمور بها أو المخير فيها »[2] واتە: لە راستیدا بیدعەت وەختێك خراپە، کە نابێت بەڵگەیەکی شـەرعی پشـتگیری بێت و ئاماژەی بۆ بکات، نە لە دەقەکانی شەرع، نە لە یاساو بنچینەکانی،

١. بنوارە: (الفروق مع هوامشه (أنوار البروق في أنواع الفروق) لأبي العباس القرافي بتحقيق: خليل المنصور: ٤/٣٤٥ ـ ٣٤٨).
٢. (الاعتصام للشاطبي: ١/ ١٩١ـ ١٩٢).

چونكه ئەگەر لـەو رووە هێمایـەك هـەبێت پاڵپشـتی داهێنراوەكـە بێـت بـە واجیب بوون، یاخود مەندووب یاخود موباح، ئەوا ئەو داهێنراوە شەرعییەو بیدعەت نییـە، وە خـودی كـاركردن پێـی خـۆی دەبینێتـەوە لـە عومـومی كردەوە چاكەكاندا كە فەرمانی پێكراوە یاخود ئیختیاری تیایاندا خراوەتە دەستی بەندەكان». كە بێگومان ئەم بۆچونەی (أبو إسحاق الشاطبي)یش هەمان بۆچونی ئەوانەیە كە تەقسیمی بیدعەتیان كردووە، بەڵام پێدەچێت (أبو إسحاق) وئەوانەیش پاش ئەو ئـەم دەسـتەواژەی ئـەویان كـردووە بـە دەسكەلاو لە هەموو موناسـەبەیەكدا ئامـاژەی بـۆ دەكـەن كـە هیچـیان لـە تەقسیمی (الفقهاء والأصوليين) بۆ كاری داهێنراو نەگەشتوون.

چونكه بیدعەت راستەو خۆ نابێتـە بیدعـەتی شـەرعیی و خـراپ هـەتا نەدرێت لە ترازوی ئەحكامی شەریعەتی ئیسلام و حوكمی حەرام بوونی بـۆ نەدرێت، بەڵكو بیدعەت یەكەم جار زمانەوانییە، پاشان دەبێتـە زاراوەیـی، ئەگەر نا دەبوایە هەموو داهێنراوەكانی پاش چەرخی حەزرەتی پێغەمبـەر (ﷺ) هەموو رەد بكەینەوە، ئەمەیش هیچ كەس نەیگوتووەو بۆی ناچێتە سەر ئەگەر دەعوای بكات، بۆیە وەك توێژەرێك لە زانستی ئوصوڵی فیقهدا پێموایە هیچ جیاوازییەكی جەوهەری نییە لە نێـوان هـەردوو بۆچـونەكەدا، لـە كاتێـدا كـە ئیمـامی (الشـاطبي)یـش پێـی وایـە ئەگـەر داهێنراوەكـە بەڵگەیەكی شەرعیی لە دەقـەكان یـاخود یـەكێك لـە قاعیـدە گشـتییەكانی شەریعەت گرتییەوە ئەوا پێی ناگوترێت بیدعەت، واتە: بیدعەتی زاراوەیـی نـەك بیدعـەتی زمانـەوانی، بـەڵام ئەوەنـدە هەیـە بـە رای مـن ئیمـام (أبـو إسحاق الشاطبي) وهاو شێوەكانی لە مەبەستی ئیمـام (عـزّ الـدين بـن عبـد السلام) و ئیمام (شهاب الدين القرافي) و هاوشیوەكانیان لـە پـێش ئـەوان و دوای ئەوان نەگەشتوون لە دابەشكردنی بیدعەت بۆ ئەو پێـنج بەشـەی كـە

باسكران واته: (البدعة الواجبة والبدعة المحرمة والبدعة المندوبة و البدعة المكروهة و البدعة المباحة)، كه بێگومان وەك ووتمان كاری داهێنراو ناكرێت به پێنج بەشەوە لە سەرەتاوە، واته: هەر كارێك لە سەرەتاوە پێش ئەوەی بدرێت لە كێشانەی یاساكانی پێنج حوكمەكەی شەریعەتی ئیسلام، ئەم كارە داهێنراوە دە گونجێت و مومكینە واجیب بێت، یان حەرام یان مەكروه یان مەندووب یان موباح، بەڵام كە جێگیر بوو داهێنراوەكە چ جۆرە داهێنراوێكە ئەوكات بێگومان لای هەموان حوكمەكەی ئاشكرا دەبێت كە یان حەرامە ئەگەر یاساكانی تەحریم بیگرێتەوە، یاخود مەكروهە، ئەگەر یاساكانی كەراهەت بیگرێتەوە، یاخود واجیبە ئەگەر یاساكانی ووجوب بیگرێتەوە، یاخود مەندووبە ئەگەر یاساكانی مەندووب بیگرێتەوە، یاخود مەكروهە ئەگەر یاساكانی كەراهەت بیگرێتەوە، لە سەرەتاوە تا خەڵكی حوكمەكەی دەزانێت دەشێت پێی بگوترێت بیدعەیەكی حەسەنە یان واجیبە یان موندوبە، بەڵام پاش بەرفراوانبوون و مەشهوور بوونی ئەم مەبەستە چیتر بەو كارە داهێنراوە ناگوترێت بیدعەتێكی واجیب، یان مەندووب یان موباح، بەڵكو تەنها دەگوترێت كارێكی واجیب یان مەندووب یان موباح، مەگەر بەكارهێنانی ووشەی بیدعەت تەنها لە زمانەوانیدا بێت.

بۆیە چەندین سەدەیە زانایان فەرمویانە: (ئاهەنگی مەولوودنامە كارێكی مەشرووع و پەسەند و موستەحەببە)، بەڵام لە سەرەتادا دەیانگوت (داهێنراوێكی چاكە یان داهێنراوێكی جوانە) وەك لە توێژینەوەی لە چاپدراوماندا (مەولوودنامەی پێغەمبەر (ﷺ) لە روانگەی شەریعەتی ئیسلامەوە) بە تەفصیل روونمانكردووەتەوە، بەڵام رەنگە ئاسایی بێت بگوترێت فڵانە كردەوە بیدعەیەكی حەرامە یان بیدعەیەكی

مەکروهە، چونکە عادەتەن ووشەی بیدعەت زیاتر بۆ لایەنی خراپە بەکار هێنراوە لە زاراوەدا، بۆیە ئیمامی (الشاطبي) و (ابن الحاج) وهاو وێنەکانیان خۆیانیان لێوە پاراستووە، تەنها لە زاراوە شەرعییەکەیدا بەکاریان هێناوە، بۆیە گومانی تیادا نییە کە لە دینداری و وەرعیانەوە بووە، بەڵام نەیانپێکاوە، ئەگەر چی پاداشت دەدرێنەوە لە سەر ئیجتیهادەکەیان (إن شاء الله).

بەڵام جێگەی سەرسوڕمانە ئیمام (أبو إسحاق الشاطبي) لە گەڵ ئەوەدا کە توند بووە لە مەسئەلەی داهێنراودا، نەقڵی کردووە لە ئیمامی (مالك بن أنس)وە (رضي الله عنه) کە دەربارەی حوکمی خوێندنەوەی قورئان لە مزگەوتەکاندا فەرموویەتی: « لم يكن بالأمر القديم، وإنما هو شيء أُحدث، ولم يأتِ آخر هذه الأمة بأهدى مما كان عليه أولها، والقرآن حسنٌ »[1]. لە ریوایەتێکی تریدا هاتووە: «أترى الناس اليوم أرغب في الخير ممن مضى؟»[2] واتە: خوێندنی قورئان کارێکی لە مێژ نییە وداهێنراوێکی تازەیە، وە ئاخیری ئەم ئوممەتە هەرگیز باشتر ناهێنێت لەوەی کە ئەووەڵ هێناویەتی، بەڵام قورئان خوێندن باشە ».

پاشان ئیمام (أبو إسحاق الشاطبي) لە بەر ئەوەی کە بۆ خۆی مالیکی مەزهەب بووە و تا ئەندازەیەکیش نالێم (تەعەصووب)، بەڵام (رەحمەتی خوای لێ بێت) شێوازێك لە زێدە لایەنگیری نا پێویستی تیادابووە بۆ مەزهەبەکەی، هەستاوە بە گێڕانەوەی کۆمەڵێك تەئویلات کە هیچیان لە دەقەکەی ئیمامی مالیکدا وەرناگیرێت، کە باشتر وابوو بهاتایەتە سەر

---

١. الاعتصام لأبي إسحاق الشاطبي: (٢ / ٣٠).

٢. الموافقات. للشاطبي: بتحقيق: مشهور حسن: (٧ / ٢١٢).

بۆچوونی ئیمام و سەرمەزهەبەکەی (رەحمەتی خودایان لە سەر بێت) کە لە ئەوەڵدا پێی وابووە خوێندنەوەی قورئان لە مزگەوتدا بیدعەتە، پاشان کە بۆی دەرکەوتووە موسڵمانان بە زۆری لە نێو مزگەوتدا قورئان دەخوێننەوە، فەرمویەتی داهێنراوێکی چاکە، کەواتە بە پێی ئەم دەقەی کە ئیمامی (الشاطبي) بۆ خۆی ریوایەتی کردووە ئیمامی مالیکیش کە سەرمەزهەبی بووە پێی وابووە بەشێکی بیدعەت چاکە و مەرج نییە هەرشتێك لە زەمانی پێغەمبەردا(ﷺ) نەکرابێت ئیدی دروست نەبێت، بێگومان کۆبوونەوەش بۆ ئاهەنگی مەولوودنامەی پێغەمبەر(ﷺ) هەر لەو نمونەیە.

## رای پەسەند لە دابەشکردنی کارە داهێنراوەکاندا بریتییە لە رای ئوصوڵییەکان کە دابەشیان کردووە بۆ پێنج بەش

بۆیە دابەشکردنی بیدعەت بەو شێواز و مەرجانەی کە پێشتر باسمانکرد بۆ پێنج بەش ئەمەیان راستەو لە تەك مەقاصیدی شەریعەتی ئیسلامدا گونجاوەو بەو شێوازەش دەتوانین تەوفیق بخەینە نێو بەڵگەکانی کیتاب و سوننە، هەروەها کاربکەین بە بەڵگە داهێنراوە چاکەکانی تر وەك: (الإجماع، القياس، الاستحسان، الاستصحاب، سد الذريعة، العرف، شرع من قبلنا، المصلحة المرسلة، عمل أهل المدينة، قول الصحابي) کە لای زانایانی ئوصوڵی فیقە بە بەڵگەی سەربەخۆ هەژمارکراون، بە تایبەت یەکەم و دووەمیان، ئەوانیتریش هەر مەزهەبێکی

فیقهـی هەنـدێکیانی بـە بەڵگـەی شـەرعی دانـاوە وە مەشـهورن لای شارەزایانی ئوصولی فیقه بە: (الأدلة المختلف فیها) (١).

هەر لە بەر ئەوەیش بووە کە بیدعەت لە زاراوەی شەرعیدا تایبەتمەنـد کراوە بـە داهێنـراوی ناشـیرین، یـاخود بـە داهێنراوێـك دەگوترێـت کـە لـە بەرانبەر سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) پەیدا بوبێت، واتـە: سـوننەتێکی لـە بەرانبەر هەڵبگیرێت، کە بێگومان خراپەو نا دروستە.

## رای پێشەوا (خاتمة المحدثین أبو عبد الله محمد بن عبد الباقي بن یوسف الزرقاني المصري المالکي المتوفی ١١٢٢هـ) لە دابەشکردنی بیدعەت

بۆیە موفتی مالیکەکان لە (مکة المکرمة) (الشیخ محمد علي بن حسین بن إبراهیم المکي المالکي المتـوفی١٣٦٧هــ) لـە (تهـذیب الفـروق والقواعـد السنیة في الأسرار الفقهیة علی أنـواء الفـروق لأبـي العبـاس القـرافي المتـوفی ٦٨٤هـ) نەقڵی کردووە لە ئیمام (خاتمة المحدثین أبو عبد الله محمد بن عبد الباقي بن یوسف الزرقاني المصري المالکي المتوفی ١١٢٢هـ) یەوە کـە لـە (شـرح الموطـأ) یـدا فەرمویـەتی: «تنقسـم البدعـة إلی الأحکـام الخمسـة، و(حدیث کل بدعة ضلالة) عامٌ مخصوص، والبدعة لغةً مـا أحـدث علـی غـیر مثال سَبَقَ، وتطلـق شـرعاً: علـی مقابـلِ السُّـنة، وهـي مـا لم تکـن في عهـده (ﷺ) » پاشان دەڵێت: « وغیر واحدٍ من الشافعیة منهم: (الإمـام النـووي) و(العز بن عبد السلام) شیخ الأصل [أي شیخ القرافي] ففـي (العزیـزي) علـی (الجامع الصغیر) عن (العلقمي) قال النووي: البدعة (بکسر الباء) في الشـرع:

---

١. بنوارە: (نهایة السول شرح منهاج الوصول لجمال الـدین الإسـنوي: (٢/٢٣٥) الإبهـاج في شـرح المنهاج للسبکي وولده التاج: (١/٤١)، علم أصول الفقه، لعبد الوهاب خلاف: (ص ٢٢).

هي إحداث ما لم يكن في عهد رسول الله (ﷺ)، وهي منقسمةٌ إلى حسنة وقبيحة، وقال (ابن عبد السلام) في آخر (القواعد): البدعة منقسمة إلى واجبة ومحرمة ومندوبة ومكروهة ومباحة، قال: والطريق في ذلك أن تعرض البدعة على قواعد الشريعة..الخ»[1]. وەك لە پێشتر عیبارەتەکانیانمان نەقڵ کرد.

## رای پێشەوا (الحافظ المقرئ المؤرخ أبو شامة الدمشقي شيخ النووي عبد الرحمن بن إسماعيل بن إبراهيم الشافعي المتوفى ٦٥٦هـ) لە دابەشکردنی کارە داهێنراوەکاندا

هەروەها ئیمامی پایەدار (أبو شامة الدمشقي عبد الرحمن بن إسماعيل الشافعي المتوفى ٦٥٦هـ) لە گەڵ ئەوەدا کە زۆر بەرهەڵستکاری بیدعەتی شەرعیی بووە و کتێبێکی تایبەتمەند بە بیدعەتە خراپەکانەوە نوسیوە بە ناونیشانی: (الباعث على إنكار البدع والحوادث)، بەڵام کەسایەتییەکی سەربەخۆیەو توێژینەوەکانی بابەتیانە بووە و لە مەسئەلەی داهێنراودا رای زانایانی دابەشکاری هەڵبژاردووە، پێی وابووە بیدعەت چاك و خراپی هەیە، وەك لە سەرەتای ئەم بەشەدا عیبارەتەکەیمان بە وەرگێڕانەوە نەقڵکرد کە فەرمویەتی: « البدع الحسنة متّفقٌ على جواز فعلها، والاستحباب لها، ورجاء الثواب لمن حسنت نيته فيها، وهي كُلُّ مبتدَعٍ موافقٍ لقواعد الشريعة، غير مخالفٍ لشيء منها، ولا يلزم من فعله محذورٌ شرعيٌّ، وذلك نحو: بناء المنابر والربَطِ والمدارس وخانات السبيل وغير

---

١. بنوارە: (تهذيب الفروق و القواعد السنية في الأسرار الفقهية للشيخ محمد علي بن حسين المكي المالكي بهامش الفروق للقرافي بتحقيق: خليل المنصور: (٤/ ٣٤٨).

ذلك، من أنواع البرّ التي لم تعهد في الصدر الأول، فإنه موافقٌ لما جاءت به الشريعة من اصطناع المعروف والمعاونة على البر والتقوى»[1].

پاشان نمونەی داهێنراوی چاك و جوانی بە داهێنانی ئاهەنگی پڕ بەرەكەتی مەولوودنامەی حەزرەتی پێغەمبەری(ﷺ) هێناوەتەوە، هەروەها زۆر مەدح و ستایشی پادشای هەولێری (أبو سعيد مظفر الدين المتوفى ٦٣٠هـ)ی كردووە وەك دەفەرموێت: « ومن أحسن ما ابتدع في زماننا من هذا القبيل: ما كان يفعل بمدينة أربل (جبرها الله تعالى) كل عام في اليوم الموافق ليوم مولد النبي (ﷺ) من الصدقات والمعروف وإظهار الزينة والسرور فان ذلك مع ما فيه من الإحسان إلى الفقراء مشعرٌ بمحبة النبيّ (ﷺ)، وتعظيمه وجلالته في قلب فاعله، وشكرِ الله تعالى على ما منَّ به من إيجاد رسوله الذي أرسله رحمةً للعالمين (ﷺ) وعلى جميع المرسلين، وكان أوّل من فعل ذلك بالموصل الشيخ عمر بن محمد الملا أحد الصالحين المشهورين، وبه اقتدى في ذلك صاحب(أربل) وغيره، (رحمهم الله تعالى)» پاشان چەند نمونەیەكی هێناوەتەوە لە سەر داهێنراوە جوانەكان لە ئیسلامدا كە هیچیان لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) نەبووە دەقێكیشیان لە سەر نییە، بەڵام بە ئیجماعی زانایانی ئیسلام داهێنراوی باش و پێویستن، وەك دەفەرموێت: « ومما يُعَدُّ أيضا من البدع الحسنة: التصانيف في جميع العلوم النافعة الشرعية على اختلاف فنونها، وتقرير قواعدها، وتقيسمها، وتقريرها، وتعليمها، وكثرة التفريعات وفرض المسائل التي لم تقع وتحقيق الأجوبة فيها وتفسير الكتاب العزيز وأخبار النبوة والكلام على الأسانيد والمتون وتتبع كلام العرب نثره ونظمه وتدوين كل

---

١. (الباعث على إنكار البدع والحوادث للحافظ أبي شامة: تحقيق: عثمان أحمد عنبر(ص ٢٣).

ذلك واستخراج علوم جمة منه كالنحو والمعاني والبيان والأوزان، فذلك وما شاكله معلومٌ حسنُه، ظاهرةٌ فائدتُه، معينٌ على معرفة أحكام الله تعالى وفهم معاني كتابه وسنة رسول الله، وكل ذلك مأمورٌ به، ولا يلزم من فعله محذورٌ شرعي»، پاشان پێناسەی داهێنراوی خراپ و ناشیرین لە ئیسلامدا دەکات ونمونەیان لە سەر دەهێنێتەوەو دەفەرموێت: « وأما البدع المستقبحة فهي: التي أردنا نفيها بهذا الكتاب، وإنكارها، وهي كل ما كان مخالفاً للشريعة، أو ملتزماً لمخالفتها، وذلك منقسمٌ الى محرّم، ومكروه، ويختلف ذلك بإختلاف الوقائع، وبحسب ما به من مخالفة الشريعة، تارة ينتهي ذلك الى ما يوجب التحريم، وتارة لا يتجاوز صفة كراهة التنزيه، وكل فقيه موفّق يتمكّن بعون الله من التمييز بين القسمين مهما رسخت قدمه في إيمانه وعلمه..»[1]. وەك لەمەو پێش لە سەرەتای ئەم بە شەدا دەق و وەرگێڕاوەکەیمان باس کرد.

## رای زانای هاوچەرخ (د. مصطفى ديب البغا)
## لە دابەشکردنی کارە داهێنراوەکاندا

هەروەها پسپۆڕ و زانایانی سەردەم دکتۆر (مصطفى ديب البغا) لە لێکۆلێنەوەکەیدا لە سەر (صحيح البخاري) لە شەرحی هەمان فەرمودەکەی حەزرەتی عومەر (رضي الله عنه) دا (نعم البدعة هذه)، هۆکارەکانی ناوبردنی ئەو کارەی بە (بیدعەت) باس کردووە وەك دەفەرموێت: « سمّاها بدعة، لأنها لم يسنّها رسول الله (صلى الله عليه وسلم)، وقال (نعم البدعة هذه)، ليدلّ على فضلها، وأن من البدع ما هو مستحسنٌ ومقبولٌ، إن كان يندرج

١. الباعث على إنكار البدع والحوادث للحافظ أبي شامة: (ص ٢٤ـ ٢٥).

تحت مُسْتَحْسَنٍ في الشرع »[1]. واته: « بۆیه ناوی برد به (بیدعەت) چونكه له سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بەو شێوازه دانەمەزرابوو، هەروەها ووشەی (نِعْم)ی بەكار هێنا، بۆ ئەوه بوو بزانرێت فەزڵی ئەنجامدانی تەراویح به جەماعەت و به بیست ركاعەت، هەروەها بۆ ئەوەبوو كه موسڵمانان بزانن كه بەشێك له داهێنراوەكان دروست و جوان و چاكه وپاداشتی لەسەر وەردەگیرێت، به مەرجێك جێگەی ببێتەوه له بازنەی جوانەكاندا له شەریعەتی ئیسلامدا».

ئاشكرایه ئەو داهێنراوەی حەزرەتی (أبي بن كعب) له بابی عیبادەتیش بوو، له بری ئەوەی لێی توڕه بێ خەلیفەی ئیسلام پێی گوت ئای چ داهێنراوێكی چاكه كردارەكەی ئوبەی (رضي الله عنه)، ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَذِكْرَى لِمَنْ كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾[2].

## رای( أبو العباس تقي الدين ابن تيمية الحراني الحنبلي المتوفى ٧٢٨هـ ) دەربارەی كاری داهێنراو و دابەشكردنی ( بیدعەت )

خوێنەری ئازیز: وەهابیەكان لێرەدا وەك كابرای شیعەیان لێ قەوماوه كه گوتبووی: (دڵێكم به وەیسی قەرەنی خۆش بوو.. كەچی ئەویش سوننی دەرچوو..!) بۆیه تەناتەت له زانا پاشكەوتوانی حەنبەلیەكان واته: (متأخري الحنابلة) كه بریتییه له (أبو العباس أحمد ابن تيمية الحراني) دانی به دابەشكردنی بیدعەتدا ناوه لای زانایان كه كردوویانه به دوو جۆر (البدعة الحسنة، والبدعة السيئة)، وەك لەمەو پێشیش له

---

١. بنواڕه: (تحقيقات الدكتور مصطفى ديب البغا على صحيح البخاري: (٢ / ٧٠٧).

٢. (سورة ق: ٣٧).

سەرەتای ئەم بەشەدا نەقڵی عیبارەتەکەیمان کرد لە (منهاج السنة) کەیدا، کە تیایدا گوتویەتی: « إن البدعة الشرعية التي هي ضلالةٌ، هي: ما فُعلَ بغيرِ دليلٍ شرعيٍّ، كاستحباب ما لم يحبه اللهُ، وإيجاب ما لم يوجبْهُ اللهُ، وتحريم ما لم يحرِّمْهُ اللهُ، فلا بد مع الفعل من اعتقادٍ يُخالف الشريعة»[1].

هەروەها لە (الفتاوى)کانیدا و لە کتێبی (درء التعارض)یدا دانی ناوە بەوەی هەموو داهێنراوێك مەرج نییە داهێنراوی خراپ بێت، بەڵکە هەندێك داهێنراو هەیە پێی دەگوترێت بیدعە بەڵام بیدعەیەکی چاکە، پاشان نەقڵی عیبارەتەکەی ئیمامی شافیعی کردووە کە تەقسیمی بیدعەتی کردووە بە دوو بەشەوە: بیدعەتی چاك و بیدعەتی خراپ وەك دەڵێت: « إن ما خالف النّصوص فهو بدعة باتفاق المسلمين، وما لم يعلم أنه خالفها فقد يسمى بدعة، قال الشافعي: (رضي الله تعالى عنه): البدعة بدعتان: بدعة خالفت كتابا أو سنة أو إجماعا أو أثرا عن بعض أصحاب رسول الله (ﷺ) فهذه بدعة ضلالة وبدعة لم تخالف شيئا من ذلك فهذه قد تكون حسنة لقول عمر: نعمت البدعة هذه هذا الكلام أو نحوه رواه البيهقي بإسناده الصحيح في المدخل» [2].

لێرەشدا لە (مجموع الفتاوى)یدا عیبارەتێکی تری نەقڵ دەکەین بۆ زیاتر دڵنیایی لەو بابەتە، کە تیایدا بە پێویستی زانیوە ئەوە روون بکاتەوە کە بیدعەتی چاك پێویستە یەکێك لە متمانە پێدراوەکانی ئەهلی عیلم بە چاکی بزانێت، وە بەڵگەیەك لە بەڵگە شەرعییەکان پاڵپشتی ئەو داهێنراوە جوانە بکات، وەك دەڵێت: « البدعة الحسنة لابد أن يستحِبَّها

١. بنوارە: منهاج السنة النبوية لابن تيمية بتحقيق: د. محمد رشاد سالم: (٨/٣٠٨)

٢. مجموع الفتاوى (بتحقيق أنور الباز وعامر الجزار: (٢٠/١٦٣). ودرء تعارض العقل والنقل لابن تيمية: تحقيق: محمد رشاد سالم (١/١٤٠).

أحدٌ من أهل العلم الذين يقتدى بهم، ويقوم دليلٌ شرعي على استحبابها» [1].

خۆ ئاشكرایە زۆرێك لە ئەهلی عیلم و جێگەی متمانەی موسڵمانان كارە داهێنراوە چاكەكانیان پێ كارێكی جوان و موستەحەب بووە لەوانەش شێوازی رێكخستنی مەولوود نامەی پێغەمبەر (ﷺ).

شایەنی باسە بەڵگەی پاڵپشت كە (ابن تيمية) بە پێویستی زانیوە: دەكرێت ئەو بەڵگەیە مەفهومی ئەدیللە یاخود عوموومی ئەدیللە بێت، چونكە بەڵگەی شەرعی وەك هەموو زانایانی ئوصوڵی فیقهی ئیسلامی فەرموویانە: مەرج نییە تەنها دەقی كیتاب و سوننەت بێت، بەڵكو یان (منطوق) یان (مفهوم) یان (ظاهر) یان (نصّ) یان (إجماع) بە هەردوو بەشی (صريح) و (سكوتي)یەوە، یان (قياس)ێكی صەحیحە، یان (استصحاب)ی ئەصڵە، یان (استحسان)ە، یان (عُرف وعادة)ە یان (شرع من قبلنا)یە، یان(سد الذريعة)یە یان عوموومی بەڵگەكان پشتگیری و تەئكیدی حوكمەكە دەكەن، یان (القواعد الفقهية) دەیگرێتەوە یان (القواعد الأصولية) یاخود (براءة الأصل) كە ئەصڵ لە شتەكاندا ئیباحەیە مادام دەقێك نەبێت حەرامی كردبێت. لێرەدا وەك ئاشكرایە (ابن تيمية) فەتوای زانایەكی باوەڕپێكراویشی خستووەتە پاڵ ئەو بەڵگانەی كە دروستە خەڵكی ئیعتیمادیان لە سەر بكات، ئەمەش راستە، چونكە قورئان لە دوو جێگەدا دەفەرموێت: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ [2] واتە: « لە هەر كارو مەسئەلەیەك كە حوكمی دروستی شەریعەتتان نەزانی

---

١. (مجموع الفتاوى: لابن تيمية: ٢٧/ ١٥٢).

٢. (سورة النحل:٤٣)،(سورة الأنبياء:٧).

دەربارەی ئەوا پرسیار بکەن لە ئەهلی عیلم لە زانایان »، ئەم دوو دەقەی قورئان بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە فەتوای زانایان بەڵگە و بورهانە بۆ موسڵمانان، تەنانەت یەکێ لە زانایانی مەزهەبە باوەڕپێکراوەکان کە فەتوایان دا لە مەسئەلەیەکدا پێویست نییە داوای بەڵگەیان لێ بکرێت، وەك زانایان باسیان کردووە لەوانە: (أبو عمرو ابن الصلاح الشهرزوري) لە (أدب المفتي والمستفتي)، ئیمام (محيي الدين النووي) لە (آداب الفتوى)، وە ئیمام (جلال الدين السيوطي) لە (أدب الفتيا)دا جگە لە مانیش[1].

هەروەها لە دەقێکی تریدا (ابن تيمية) دانی بە تەقسیمی زانایاندا ناوە بۆ بیدعەتی چاکە و بیدعەتی خراپە، پێی وایە کە هەر داهێنراوێك نەچوە خانەی واجبوون یا خود ئیستیحبابەوە، ئەوە بەو داهێنراوە دەگوترێت داهێنراوێکی خراپ، کە بە کۆدەنگی زانایان داهێنراوێکی گومڕاکارە، پاشان دەڵێت: بەڵام ئەو زانایانەی کە پێیان وایە فڵانە داهێنراو داهێنراوی حەسەنەیە، ئەوە مەبەستی لەو داهێنراوانەیە کە بەڵگەیەکی شەرعی پاڵپشتی لێ بکات، واتە وەك بەڵگە گشتییەکان(عموم الأدلة) یاخود (قياس الأشباه). چونکە ئەگەر بەڵگەو دەقێکی راستەو خۆی لە سەر بێت لە بنەڕەتدا پێی ناگوترێت داهێنراو، بەڵام هەر داهێنراوێك نە لە خانەی واجبدا جێگەی بوویەوە نە لە خانەی موستەحەبدا، ئەوا هیچ کەسێك لە موسڵمانان پێیان وا نییە کە داهێنراوێکی چاکەو مرۆڤ بە هۆیەوە لە پەروەردگاری نزیك دەبێتەوە، وەك دەڵێت: « وكل بدعة ليست واجبة ولا مستحبة فهي بدعة سيئة، وهي ضلالة

---

١. بنوارە: فەصڵی تەمهیدی دانەر لە بەشی توێژینەوەی تێزی دوکتۆرا: (الفتاوي الأصولية والقرآنية: د. حسن خالد مصطفى محمود المفتي، (ص١٦- ٤٣) کە تیایدا ئەو مەسئەلەمان بە بەڵگەو سەرچاوەکانیەوە بە درێژی روونکردووەتەوە.

باتفاق المسلمين، ومن قال في بعض البدع: إنها بدعة حسنة، فإنما ذلك إذا قام دليل شرعي أنها مستحبة، فأما ما ليس بمستحب ولا واجب، فلا يقول أحد من المسلمين: إنها من الحسنات التي يتقرب بها إلى الله »[1].

ئاشكرايە (منطوق) و (مفهوم)ی ئەم دەستەواژەی (ابن تيمية)يش بەڵگەيەكی ترە لە سەر ئەوەی كە بڕوای بە داهێنراوی چاك و داهێنراوی خراپ هەبووە، كە ئەمەش تەقسيمی فوقەهای ئيسلامە بۆ داهێنراوەكان بە شێوازێكی گشتی.

## ڕاڤەی ئايەتی پيرۆزی:
## ﴿وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا..﴾

خوای گەورە فەرمويەتی: ﴿ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِمْ بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَآتَيْنَاهُ الْإِنْجِيلَ وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلا ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا فَآتَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾[2].

هەندێ كەس چەواشەكاری دەكەن، وا دەگەێنن لە خەڵكێكی داماو كە ئەو ئايەتە پيرۆزەی سەرەوە بەڵگەيە لە سەر خراپی كاری داهێنراو بە هەموو جۆرێك!

لە وەڵامدا دەڵێين: هەرچەندە ئەو ئايەتە پيرۆزە لە بابی (شرع من قبلنا)يە، لە گەڵ ئەوەشدا بە پێچەوانەی واتاو مەبەستی وەهابيەكانەوەيە، واتە بەڵگەيە لە سەريان. چونكە بەڵگەی ڕاستەوخۆيە

---

١. مجموع فتاوى ابن تيمية، دراسة وتحقيق: عبد الرحمن بن محمد بن قاسم (١٤/٣٠).

٢. (سورة الحديد: ٢٧).

لە سەر پێویستی بەردەوام بوون لە سەر داهێنراوی چاك، بە تایبەت لە بابی عیباداتدا، وە رەخنەکە رووبەڕووی خودی داهێنراوەکان نەبووەتەوە بەڵکو رووبەرووی ئەو کەسانە بووەتەوە کە بەردەوام نەبوون لە سەر داهێنراوەکانیان.

لەم رووەوە ئیمامی ئەهلی تەفسیر (أبو عبد الله القرطبي) ئەفەرموێت: هەرکەسێك کارێکی تازەی چاکی داهێنا پێویستە وازی لێ نەهێنێت و بەردەوام بێت لەسەری، بۆ ئەوەی وەك هەندێك لە نەوەی ئیسرائیلی بەسەر نەیەت کە خوای گەورە لە قورئاندا عیتاب و ڕەخنەی لێ گرتن لە سەر ئەوەی کە هەندێ جۆری عیبادەتی سەختیان داهێنا کە لەسەریان واجب نەکرابوو، بەڵکو خۆیان لەبەر ڕەزامەندی خوا لەسەر خۆیان فەرز کردبوو بەڵام پەیمانەکەیان شکاندو ڕیعایەتی ئەو کارانەیان نەکرد و بەردەوام نەبوون لە سەری وەك دەفەرموێ: ﴿وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا﴾[1] بەڵام ئەوانەی پەیمانەکەیان نەشکاندو بەردەوام بوون لەسەر ئەو کارە داهێنراوە چاکانەیان خوای گەورە ئەفەرمووێت: بێ بەشمان نەکردن لە پاداشی چاکە ﴿فَآتَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾، وەك بە درێژی دەفەرموێت: « وروى سفيان الثوري عن عطاء بن السائب عن سعيد بن جبير عن ابن عباس في قوله تعالى: (ورهبانية ابتدعوها) قال: كانت ملوك بعد عيسى بدّلوا التوراة والانجيل، وكان فيهم مؤمنون يقرؤون التوراة والانجيل ويدعون إلى دين الله تعالى، فقال أناس لملكهم: لو قتلت هذه الطائفة. فقال المؤمنون: نحن نكفيكم أنفسنا. فطائفة قالت: ابنوا لنا

١. (سورة الحديد: ٢٧).

أسطوانة ارفعونا فيها، وأعطونا شيئا نرفع به طعامنا وشرابنا ولا نرد عليكم. وقالت طائفة: دعونا نهيم في الارض ونسيح، ونشرب كما تشرب الوحوش في البرية، فإذا قدرتم علينا فاقتلونا. وطائفة قالت: ابنوا لنا دورا في الفيافي ونحتفر الآبار ونحترث البقول فلا ترونا. وليس أحد من هؤلاء إلا وله حميم منهم ففعلوا، فمضى أولئك على منهاج عيسى، وخلف قوم من بعدهم ممن قد غيّر الكتاب فقالوا: نسيح ونتعبد كما تعبد أولئك، وهم على شركهم لا علم لهم بإيمان من تقدم من الذين اقتدوا بهم، فذلك قوله تعالى: (ورهبانية ابتدعوها ما كتبناها عليهم إلا ابتغاء رضوان الله) الآية. يقول: أبتدعها هؤلاء الصالحون (فما رعوها) المتأخرون (حق رعايتها) (فآتينا الذين آمنوا منهم أجرهم) يعني الذين ابتدعوها أولا ورعوها (وكثير منهم فاسقون) يعني المتأخرين، فلما بعث الله محمدا (ﷺ) ولم يبق منهم إلا قليل، جاءوا من الكهوف والصوامع والغيران فآمنوا بمحمد (ﷺ). الثالثة: وهذه الاية دالة على أن كل محدثة بدعة، فينبغي لمن ابتدع خيرا أن يدوم عليه، ولا يعدل عنه إلى ضده، فيدخل في الآية. وعن أبي أمامة الباهلي – واسمه صدى بن عجلان – قال: أحدثتم قيام رمضان ولم يكتب عليكم، انما كتب عليكم الصيام، فدوموا على القيام إذ فعلتموه ولا تتركوه، فان ناسا من بنى اسرائيل ابتدعوا بدعا لم يكتبها الله عليهم ابتغوا بها رضوان الله فما رعوها حق رعايتها، فعابهم الله بتركها فقال: (ورهبانية ابتدعوها ما كتبناها عليهم الا ابتغاء رضوان الله فما رعوها حق رعايتها). الرابعة: وفى الآية دليلٌ على العزلة عن الناس في الصوامع والبيوت، وذلك مندوب إليه عند فساد الزمان وتغير الاصدقاء والاخوان»[1].

---

١. (سوره الحج: ٣٢).

## بەشێك لە داهێنراوەكانی خەلیفە راشیدەكانی ئیسلام
## ( رضي الله عنهم أجمعين )

لەسەر ئەم بنەڕەتانەیە دەبینین موسڵمانانی سەلەفی صالّح(ڕەزای خوایان لەسەربێ)كاری تازەیان بەچاك زانیوە لە هەردوو بواری(دین و دونیا)دا وەهەر كات زانیبیتیان بەرژەوەندی دینی پیرۆزی ئیسلامی تێدایە بەئەنجامیان گەیاندووە، وەهەرگیز دوو دڵ نەبوون لە هێنانەدی(إبداع)ی كاری چاك، با ئەوكارە چاكە لەسەردەمی حەزرەتیشدا(ﷺ) نەبووبێ، وەك(كۆكردنەوەی ئایەتە پیرۆزەكانی قورئان)لە سەردەمی حەزرەتی (الصديق)دا (رضي الله عنه)[1]، یان كارە چاكسازیەكان و داهێنراوە جوانەكانی حەزرەتی (فاروق) (رضي الله عنه) لەسەردەمی خیلافەتیدا لەنموونەی وقفی زەوی (سَواد العراق)لە سەر موسڵمانانی ناوچەكە[2]، هەروەها زیادكردنی سزای(حەددی) مەی خۆر لە(چل) دارەوە بۆ(هەشتا) دار، ئەوەبوو دوای راوێژكردنی بە حەزرەتی عەلی (رضي الله عنه)

---

١. ئیمامی(البخاري) لە (صحيح)یدا (١٧٢٠/٤) رقم(٤٤٠٢) لە (زيد بن ثابت الأنصاري)ەوە (رضي الله عنه) ڕیوایەتی كردووە، وە بۆ درێژەی ئەو بابەتە بنواڕە: (تفسير القرطبي): (٤٩/١ ـ ٥٠)، تاريخ التشريع الإسلامي للشيخ محمد خضري بك: (ص٧٦–٧٧).

٢. فقه الملوك الرتاج المرصد عبد العزيز بن محمد الرحبى البغدادي الحنفي المتوفى ١٢٠٠ هـ، على خزانة كتاب الخراج للقاضي أبي يوسف: (١٩٤/١ ـ ٢١٣)، رسائل الفاروق(رضي الله عنه)، جمع وتخريج: عبد اللطيف الجبري: (ص ٢١٤–٢١٧)، تأريخ التشريع الإسلامي للشيخ محمد خضري بك: (ص ٩٠).

فەرمووی: « لعمري ما يصلح لهم إلاّ الشدة والفقر»[1]، واتە: « بە گیانی خۆم مەگەر توندی و هەژاری چاك و سازیان بكات».

هەروەها داهێنانی (ئەنجومەنی راوێژكاری) بۆ هەڵبژاردنی خەلیفەی ئیسلام كە لە شەش كەس پێكی هێنان، وە تەنها ماوەی سێ رۆژ مۆڵەتی پێ دان كە بریتی بوون لە پێشەوایان حەزرەتی: (عثمان، علي، زبير، سعد، طلحة، عبد الرحمن ی كوری عوف)، ئەوەبوو لە نێو خۆیاندا حەزرەتی عوسمانیان هەڵبژارد (رضي الله عنهم)[2].

هەروەها دامەزراندن و داهێنانی سیستەمی(ديوان الجيش) بەمەبەستی موچەدان بە موجاهیدانی ئیسلام بە رەچاوخستنی جیاوازی لە نێوانیاندا چونكە فەرمووی: « لا أَجْعلُ مَنْ قاتَلَ رَسُولَ الله (ﷺ) كَمَنْ قاتَلَ مَعَهُ »[3]، واتە: من بەش و موچەی ئەوانەی كە وەختی خۆی لە دژی حەزرەت (ﷺ) دەجەنگان وەك ئەوانە دانا نانێم كە لەخزمەتیدا لە دژی كوفر دەجەنگان، هەروەها حەزرەتی عومەر (رضي الله عنه) مزگەوتی پێغەمبەری(ﷺ) فراوانكردو لە تەنیشت خانوەكانی (مروان)ەوەو خانوەكەی حەزرەتی (العباس) خستە سەر، هەروەها كۆڵەكەو سەقفەكەیشی تەخت كرد، وەك (الحافظ ابن حبان) دەیگێڕێتەوەو

---

١. بنوارە: (فتوح الشام للواقدي: (١/ ١٠٩)، تاريخ الطبري: (٤/ ٢٢٢)، رسائل الفاروق: (ص: ٥٤)، ئیمامی (مسلم)یش لەو ڕووەوە چەند فەرموودەیەكی ڕیوایەتكردووە لەصەحیحەكەیدا بنوارە: (صحيح مسلم بشرح النووي باب حد الخمر: (١١/ ٢١٥-٢١٦).

٢. بنوارە: (تاريخ الطبري: ٥/ ١٢-١٣، رسائل الفاروق(رضي الله عنه): ص ٢٢٥-٢٢٦).

٣. (الرتاج المرصد (فقه الملوك) للبغدادي: (١/٣١٨-٣٢٣)، والطبقات الكبرى لابن سعد الزهري: (٣/٢١٦)، وتاريخ الطبري: (٥/٢٢-٢٣)، حياة الصحابة للكاندهلوي: (٢/٢١٩). وتاريخ التشريع الإسلامي للشيخ محمد خضري بك: (ص٩٠).

دەفەرموێت: «زاد عمر (رضي الله عنه) في مسجد رسول الله (ﷺ) زاد فيه من ناحية دار مروان، وأدخل فيه دار العباس وسوى أعمدته وسقفه» [1].

کەسیش پێی نەگووت: ئەی خەلیفەو پێشەوای موسڵمانان: ئەمەی تۆ دەیکەیت بیدعەتەو دروست نییە چونکە ئەساس و چواردەوری ئەو مزگەوتە پێغەمبەر دیاری کردووە (ﷺ) نابێ بیگۆڕیت! چونکە ئەوان (رضي الله عنهم) دانشمەند وفەقیه بوون، دەیانزانی هەندێ داهێنان نەك هەر دروستە، بەڵکو واجب وپێویستیشە. ئەم کارانەی حەزرەتی عمر (رضي الله عنه) تێکرایان کاری تازەو بیدعەت بوون، بەڵام بیدعەتێکی چاك و پڕ حیکمەت.

هەروەها گۆڕینی جێگەی بەردەکەی مقامی حەزرەتی ئیبراهیم(عليه السلام) لە جێگەی ئەصڵی خۆیەو کە لکابوو بە دیواری کەعبەوە بۆ ئەم جێگەی ئێستای، ئەم گۆڕانکارییە لە لایەن حەزرەتی عومەرەوە بوو(رضي الله عنه)، بە مەستی ئەوەی کە خەڵکی باشتر بتوانن تەواف بکەن و بە جوانتر نوێژی دوو رکاعەتی مقام بە ئەنجام بگەیێنن، وەك (الحافظ ابن كثير) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: « وقد كانَ ملتصقاً بجدار البيت حتى أخَّرَهُ عمرُ بن الخطاب (رضي الله عنه) في إمارته، إلى ناحية الشرق بحيث يتمكن الطواف منه، ولا يشوشون على المصلين عنده بعد الطواف، لأن الله تعالى قد أمرنا بالصلاة عنده..» [2].

هەروەها کۆکردنەوەو نوسینەوەی قورئانی پیرۆز لە حەوت نوسخەداو پاشان بڵاوکردنەوەی لە لایەن حەزرەتی(عثمان ذي النّورين)وە (رضي الله

١. (الثقات لابن حبان: بتحقيق: السيد شرف الدين أحمد: (٢ / ٢١٩).
٢. تفسير القرآن العظيم لابن كثير: (١ / ٤٧١).

عنه) وه به ئیشارەتی جوانی حەزرەتی (حذیفة بن الیمان) (رضي الله عنه)[1]، بیدعەیەکی پێویست وواجب بوو.

هەروەها دامەزراندنی (بانگی سێیەم) [2] لە ڕۆژانی هەینیدا بە فەرمانی حەزرەتی عثمان (رضي الله عنه) لە(الزوراء)دا، کە جێگایەکی بەرز بوو لە شاری مەدینەی مونەووەره[3].

---

١. پێشەوا بوخاری لە صەحییحەکەیدا (١٩٠٨/٤) برقم(٤٧٠٢)، لە حەزرەتی ئەنەسەوە (رضي الله عنه) ریوایەتی کردووە، کە ئەمەش دەقەکەیەتی: «حدّثنا ابن شهاب أن أنس بن مالك حدّثه: أن حذيفة بن اليمان قدم على عثمان، وكان يغازي أهل الشام في فتح إرمينية وأذربيجان مع أهل العراق، فأفزع حذيفةَ اختلافُهم في القراءة، فقال حذيفة لعثمان: يا أمير المؤمنين" أدرك هذه الأمة قبل أن يختلفوا في الكتاب اختلاف اليهود والنصارى". فأرسل عثمان إلى حفصة: أن أرسلي إلينا بالصحف ننسخها في المصاحف، ثم نردها أليك، فأرسلت بها حفصة إلى عثمان، فأمر زيد بن ثابت وعبد الله بن الزبير وسعيد بن العاص وعبد الرحمن ابن الحارث بن هشام فنسخوها في المصاحف، وقال عثمان للرهط القريشيين الثلاثة: إذا اختلفتم أنتم وزيد بن ثابت في شيء من القرآن فاكتبوه بلسان قريش، فإنما نزل بلسانهم، فافعلوا، حتى إذا نسخوا الصحف في المصاحف ردَّ عثمانُ الصحف إلى حفصة، وأرسل إلى كل أُفُق بمصحف مما نسخوا، وأمر بما سواه من القرآن في كل صحيفةٍ أو مصحفٍ أن يُحْرَقَ » بۆ درێژەی ئەو باسە بنوارە: تفسير القرطبي: (٥١/١)، و تاريخ التشريع الإسلامي: ص٧٨).

٢. بەو شێوە هاتووە لە صەحیحدا، مەبەست لە سێ بانگ: بانگی یەکەم: بریتییە لەو بانگەی کە حەزرەتی عوسمان دایمەزراند بۆ خۆ ئامادەکردن خەڵکی، بانگی دووەم: بریتییە لە بانگی نیوەڕۆ بۆ ئامادەبوون بۆ نوێژ، بانگی سێیەم: بریتییە لە قامەتکردن بۆ نوێژەکە، قامەتیش بە بانگ ناوبراوە چونکە وەك ئەو وایە لە تێکڕای ئەحکامە فیقهییەکاندا، هەرچی بۆ ئەم دروست بێ بۆ ئەمیش دروستە لە تێکڕای سوننەتەکاندا، هەر لە بەر ئەوەشە کە هەردووکیان بە (الأذانين) لە زاراوەی فەرموودەدا ناویان هاتووە، واتە: دوو بانگەکە.

٣. ئیمامی بوخاری لە سائیبی کوڕی زەیدەوە (رضي الله عنه) ریوایەتی کردووە کە دەفەرموێت: « إن الذي زاد التأذين الثالث يوم الجمعة عثمان بن عفان (رضي الله عنه)، حين كَثُرَ أهلُ المدينة، ولم يكن للنبي (ﷺ) مؤذنٌ غيرُ واحدٍ، وكان التأذين يوم الجمعة حين يجلسُ الإمام يعني على المنبر». بنوارە: (صحيح البخاري(١ / ٣٠٩) برقم(٨٧١). بۆیە ئیمامی

هـەروەها حـەزرەتی عثمـان بـوو(رضـي الله عنـه) کـە بـۆ یەکـەم جـار (الأروقة) ریواقەکانی چواردەوری مزگەوتی حەرامی دروسـت کـردووە وەك ئیمامی (الزرکشي) دەفەرمویت: « وکان عثمانُ أولّ مَنْ اتَّخذ الأروقةَ ». [1]

ئەمـەو زۆر داهێنـراوی تـریش کـە پـاش پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) دامەزراوە لە لایەن صەحابەکانەوەو دوای ئـەوانیش، کەسـیش نـەیگوتووە ئەوە بیدعەیەکی خراپەو خاوەنەکەی گومڕا بووە، بـە پێچـەوانەوە دۆعـای خێریان بۆ خاوەنەکانی کردووە..خۆ ئەم زیادکردنانە تێکڕایـان لـە بەشـی عیباداتەو دروستیش بووە.

---

(القرطبي) لە تەفسیرەکەیدا (١٠١/١٨). دەفـەرمویت: « وفي الحـديث الصـحيح: أن الاذان كـان على عهد رسول الله (ﷺ) واحداً، فلما كان زمن عثمان زاد الاذان الثالث على الـزوراء، وسمـاه في الحديث ثالثاً، لأنه أضافه إلى الإقامة، كما قال عليه الصلاة والسلام: «بين كل أذانين صـلاةٌ لمن شاء» يعني الاذان والاقامة». بۆ بەڵگەکانی ئەو کـارە داهێنـراوە بنـوارە بـۆ: مسـائل مـن الفقة المقارن (القسم الأول)، (أحكام تتعلق بالعبادات) للأستاذ الدكتور هاشم جميـل: (١٧٤/١ فما بعدها).

١. إعلام الساجد بأحكام المساجد للإمام الزركشي، بتحقيق: أبو الوفا المراغي: (ص ٥٧).

## فەصڵی دووەم
## چوارچێوە وحوکمی قیاس و پێکگرتن لە عیباداتدا
## لە ئوصوڵی فیقهی ئیسلامیدا

پێشەکی پێویستە بزانیین کە زانایانی ئوصولی فیقهی ئیسلامی لە بارەی مەجالی قیاس کردن لە عیباداتدا هەندێك رای جیاوازیان هەیە، بەڵام جیاوازیەکانیان رووکەشییە و قابیلی تەوفیقە، بەم پێیەی لای خوارەوەیە وبە یارمەتی خودا باسی دەکەین:

### ( رای یەکەم )
### قیاس لە عیباداتدا دەکرێت، بەڵام بە کەمی و بەشێوەیەکی سنووردار

کۆمەڵێك لە ئوصولیەکان پێیان وایە قیاس دەکرێت لە عیباداتدا، بەڵام بە کەمتر بە بەراوورد لە تەك قیاسکردن لە بابی معاملات و مناکحات و کفارات و..هتد، لەوانە:

پێشەوا (**القاضي أبو بكر ابن العربي المالكي**)یە لە کتێبی (المحصول في أصول الفقه)یدا لە مەڕ وەڵامدانەوەی قیاسێکی حەنەفیەکان لە عیبادەتی زەکاتدا دەفەرموێت: مەجال و مەودای قیاس کردن لە عیباداتدا تەسکەو کەمە، واتە دەکرێت بەڵام مەیدانەکەی کەمە، بە پێچەوانەی (معاملات و مناکحات..هتد) کە مەیدانی قیاس تیایاندا زۆر و بەرفراوانە. وەك دەفەرموێت: « ونطاق القياس في العبادات ضيق، وإنما ميدانه المعاملات

والمناكحات وسائر أحكام الشرعيات»[1]. ئەگەر قیاس لە عیباداتدا نا دروست بوایە بە موتڵەقا ئەم پێشەوایە نەیدەفەرموو: (ضیقٌ) بەڵکو دەیفەرموو: (باطلٌ) یان (حرام) یان (ممنوع).

هەروەها پێشەوا (**أبو المعالي إمام الحرمين عبد الملك الجويني الشافعي**) هەمان رای یە، ئەوەتانێ لە کتێبەکەیدا (البرهان في أصول الفقه) لە باسی (الطهارة)دا فەرمویەتی: « ثم هذا الضربُ الذي يفضى الكلام إليه يضيقُ نطاقُ القياس فيه، فليس للناظر أن يؤسّس في هذا الضرب أصلاً يتخيّل فيه مثل هذا المعنى الذي تكلّفنا نظم العبارة (منه) لمعتبره بالقاعدة الثانية، والسبب فيه ان هذا يدق مدرك النظر، فلا يستقل بالتطرُّق إليه القُوى البشريةُ، ولا ينبغي أن يؤتى الإنسان عن خداع، فإن مجال الظنون متسعٌ لما يظهر ويدق، فإنا لم نؤمر بربط الحكم لكل مظنون »[2].

هەروەها پێشەوا (**الأمير محمد بن إسماعيل الصنعاني الزيدي المتوفى ١١٨٢هـ**) لە (إجابة السائل)یدا تەئکیدی لە سەر ئەوە کردووە کە مادام واتاو مەرجەکانی قیاس هاتبێتە جێگە قیاس درووستە بە بێ جیاوازی و لە هەموو بابێکدا، جگە لە ئەحکامی تەعەببودی ئەویش ئەگەر بە دەقێکی راستەوخۆ دیاری بێت، ئەو کات قیاسیان لە سەر ناکرێت، وەك دەفەرموێت: « واعلم أنّ التحقيق أنّ القياس لم يقم الدليل على التعبّد به إلاّ فيما كانت علّته منصوصة بأي طرق النص، كما يأتي تحقيقه وغيرها من المسالك الآتية ستعلم أنه لم يقم عليها دليل التعبد بالعمل به ويأتي إن شاء

---

١. المحصول في أصول الفقه، للقاضي أبي بكر ابن العربي المالكي: بتحقيق: حسين علي اليدري: (ص ٩٥).

٢. البرهان في أصول الفقه للإمام الأصولي أبي المعالي إمام الحرمين عبد الملك الجويني الشافعي، بتحقيق د. عبد العظيم محمود الديب: (٦١٢/٢).

الله تحقيقه وقد بسطناه في رسالتنا المسماة الاقتباس في معرفة الحق من أنواع القياس، ولما اختلف في جريان القياس في الأحكام كلها أو عدمه أشرنا بقولنا:

وليس بالجاري في الأحكام * جميعها في نظر الأعلام

فإن ما معناه منها يجهل * فليس في باب القياس يدخل

في قوله: (وليس بالجاري) متوجه إلى القيد، أعني لفظ (جميعها) والمراد: أن القياس لا يكون جارياً الاستدلال به في إثبات كُلِّ حكمٍ شرعيّ، لأنه قد تقرَّرَ: أن من الأحكام ما لم يدرك معناه الذي هو الداعي والمفضي للحكم، بل قد يكون تعبُّدياً، والذي في كتب الأصول مسألتان: إحداهما: هذه، وهو أنه اختلف في جريان القياس في جميع الأحكام الشرعية، والمختار نفيه، لأنه ثبت في الأحكام ما لا يعقل معناه كفرض الدية على العاقلة، وإجراء القياس في مثله تعذّر، لما عرف من أن القياس فرع تعقُّل المعنى المعلَّلِ به الحكمُ في الأصل، وهذا ذكره ابن الحاجب والعضُد. قلت: وهذه المسألة قليلة الجدوى عديمة الفائدة إذ قد عُلم أنها إن تكاملت شرائط القياس وارتفعت موانعه كان دليلاً على أي مسألة، وإلا فليس بدليلٍ، لفوات شرائطه أو وجود موانعه. والمسألة الثانية: أنه هل يجري القياس في الحدود والكفارات؟ فقال الجمهور: يجري فيهما، وقالت الحنفية لا يجري فيهما. واستدل الجمهور: بأن دليل التعبُّد بالقياس شامل لهما، فإذا عقل المعنى وجب فيه الحكمُ بالقياس، كما قيس القتل بالمثقّل على القتل بالمحدّد، و(كما قيس) قطع النباش على قطع السارق، فالعلة والحكم فيهما معلومان،

وأما ما لا يعلمان فيه، فلا يجري فيه القياسُ، وكذلك اختلف في جريانه في الأسباب أو لا؟ والكلام فيه مستوفى في المطوّلات..» [1].

هەروەها پێشەوا (**القاضي محمد بن علي الشوكاني الزيدي**)یش لە (إرشاد الفحول)یدا لە سەر باسی پێنجەم (ما لا يجري فيه القياس) هەمان ڕای هەیە کە جگە لەو حوکمانەی کە (معقولة المعنى)نییە، قیاس دروستە لە هەموو بابێکی عیباداتدا، لە نمونەی بابەکانی (الأسباب، الحدود، الكفارات..هتد)، تەنانەت نەقڵی کردووە بە بەڵگەوە: لەو شتانەشدا کە (معقولة المعنى)ش نین، بەشێك لە زانایان پێیان دروستە قیاس کردن تیایاندا[2].

تەنانەت پێشەوا (**أبو إسحاق الشاطبي المالكي**) کە پێیی وایە قیاس لە عیبادات دا دروست نییە، چونکە تەعەبوودییە، ئینکاری ئەوەی نەکردووە کە لە زۆرێك بابی عیباداتدا قیاس درووستە بە هەمان شێوەی عادات و نەریتەکان و دەگەڕێتەوە بۆ بابی مەصلەحەت، وەك دەفەرموێت: « وأما العاديات وكثيرٌ من العبادات أيضا، فلها معنى مفهوم، وهو ضبط وجوه المصالح" إذ لو ترك الناسُ والنظرَ لانتشر، ولم ينضبط، وتعذر الرجوع إلى أصل شرعي، والضبط أقرب إلى الانقياد ما وجد إليه سبيل، فجعل الشارع للحدود مقادير معلومة، وأسباب معلومة لا تتعدي، كالثمانين في القذف،

---

١. أصول الفقه إجابة السائل شرح بغية الآمل للأمير الصنعاني تحقيق: القاضي حسين بن أحمدالسياغي و الدكتور حسن محمد مقبولي الأهدل: (ص ١٧٥ـ١٧٦).

٢. بنواڕە: إرشاد الفحول، الفصل الخامس: فيما لا يجري فيه القياس للقاضي الشوكاني المتوفى ١٢٥٠هـ بتحقيق: الشيخ أحمد عزو عناية: (٢/١٤٣ـ١٤٥).

والمئــة وتغريــب العــام في الزنــا علــى غــير إحصــان، وخــصّ قطــع اليــد بالكوع..الخ»[1].

هەرچـەندە ئیمـامی (الشـاطبي) لـە هەنـدێك جێگـەی تـردا جیـاوازی نەخستووەتە نێوان عادات و عیبادات، ئـەوەتانێ لـە مەسـئەلەی ئەسـبابی عـادی و ئەسـبابی عیبادەتیـدا دانـی نـاوە بـەوەدا کـە جیـاوازی نییـە لـە نێوانیاندا، بۆ سەلماندنی رای خۆی دەفەرموێت: « فلا فارق بـين العاديـات والعباديات»[2].

هەروەها لە بارەی ئەوەوە کە ئەصڵی غەشکردن سەرچاوەی لـەوەوە گرتــووە کــە موکەللــەف تیایــدا رووبکاتــە موســەببەب نــەك خــودی سەبەبەکە[3]، هەتا کارەکەی شەرعی بێت، لەم رووەیشەو ئیمامی شاطيبي جیاوازی ناخاتە نێوان عادات وعیباداتەوە وەك دەفەرموێت: « وهــو أصــل الغــش في الأعمــال العاديــة، نعــم والعباديــة، بــل هــو أصــل في الخصــال المهلكة..»[4].

---

١. الموافقات لأبي إسحاق الشاطبي، بتحقيق: مشهور حسن: (٥ / ٢٣٠).

٢. الموافقات للشاطبي: (٢/٤٦٣).

٣. موسـەببەب، بـە (ئیسـمی مـەفعوول) بریتییـە لـەو ئەسـەرەی کـە پەیدا دەبێت لـە خـودی سەبەبەکەوە لە کاتی موباشەرەی دەست بەکاربوونی کەسەکەوە بە کارەکەیەوە بە ویسـت و ئیرادەی خودا (جل جلاله).

٤. الموافقات للشاطبي: بتحقيق: مشهور حسن: (٢/٤٨١).

## ( رای دووەم )
## قیاس لە عیباداتدا دەکرێت بە شێوەیەکی ڕەها

زۆرێك لە زانایانی ئوصولی فیقهی ئیسلام پێیان وایە قیاس دەکرێت بە ڕەهاو موتڵەق لە هەموو بابێکدا بە بێ جیاوازی، لەوانەش لە بابی عیباداتدا، ئەم راو بۆچوونە لە زانایانی سەلەفەوە سەرچاوەی گرتووە، لەوانە:

پێشەوا (**التابعي الجليل سالم بن عبد الله بن عمر بن الخطاب، القرشي العدوي أحد فقهاء المدينة السبعة ومن سادات التابعين وعلمائهم وثقاتهم** )( **رضي الله عنه** ) پرسیاریان لێکرد دەربارەی جەمع کردنی نوێژی نیوەڕۆ لە تەك عەسردا لە کاتی سەفەردا، ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: بەڵێ دروستە، بە قیاس لە سەر دروستی جەمع کردن لە عەرەفەدا. (أخرج الإمام مالك عن ابن شهاب: أنه سأل سالم بن عبد الله: هل يجمع بين الظهر والعصر في السفر؟ فقال نعم لا بأس بذلك، ألم تر إلى صلاة الناس بعرفة»[1]. وأخرجه الحافظ عبد الرزاق في المصنّف عنه كذلك[2]، والحافظ البيهقي في السنن الكبرى بسنده عن ابن شهاب[3]. وأخرجه كذلك الحافظ ابن عبد البر النميري القرطبي في الاستذكار[4].وأخرجه كذلك في التمهيد وأضاف: « فهذا سالم قد نزع بما

١. الموطأ برواية يحيى الليثي: (١/١٤٥)برقم(٣٣٢).
٢. مصنف عبد الرزاق: (٢/٥٥٠)برقم(٤٤١٤).
٣. السنن الكبرى للبيهقي بتحقيق: محمد عبد القادر عطا: (٣/١٦٥)برقم(٥٣٣٠).
٤. الاستذكار لابن عبد البر المالكي: (٢/٢٠٦-٢٠٧)برقم(٢٩٨).

ذكرنـا، وهــو أصـل صـحيح لمـن ألهـم رشـده ولم تمـل بـه العصـبية إلى المعاندة»[1].

## رای پێشەوا حەزرەتی شافیعی ( رضي الله عنه ) لەم رووەوە

شایەنی باسـە (**الحـافظ البيهقـي**) نـەقڵی کـردووە لـە پێشـەوا حـەزرەتی شافیعی یەوە(رضي الله عنه) کە بە سەنەدێکی صـەحیح ریوایـەت دەکات لـە حـەزرەتی جـابرەوە(رضـي الله عنــە) کـە پێغەمبــەر(ﷺ) لــە ڕۆژی عەرەفەدا پاش زەوالی ڕۆژ خوتبـەی دا و پاشـان هـەردوو نوێـژی نیـوەڕ و عەسری پێکەوە کۆکردووەتـەوە، وەك دەفەرموێت: « عن جابر قـال: فـراح رسول الله (ﷺ) يوم عرفـة حـين زالـت الشـمس فخطـب، ثـم صـلّى الظهـر والعصر معا » أخرجه مسلم من حـديث حـاتم بـن إسماعيـل عـن جعفـر بـن محمد، عن أبيه» پاشان پێشەوا (البيهقي) لە ئیمـامی شـافیعییەوە نـەقڵی کردووە کە فەرمویەتی هەندێك لە زانایـان بـۆ کۆکردنـەوەی نویـژەکان لـە سەفەردا قیاس لە سەر کۆککرنەوەی پێغەمبەر(ﷺ)دەکەن لـە عەرەفـە و موزدەلیفەدا. ئەم قیاسەشـی پێـی بـاش بـووەو بـۆ خۆشـی ئـەو قیـاس و تەشبیهەی بە سەنەدی صەحیح لە حەزرەتی (سالم بن عبد الله)وە (رضـي الله عنه)، ریوایەت کردووە، وەك دەفـەرموێت: « قـال الشـافعي في القـديم: ولقد شبّه بعضُ الفقهاء الجمع بـين الصـلاتين في السـفر بالمزدلفـة، وعرفـة، ورآه شبيها بهما ثم قال: أخبرنا مالك بن أنس، عن ابن شـهاب قـال: سـألت

---

١. التمهيد لابن عبد البرّ: (١٢ / ٢٠٣).

سالم بن عبد الله عن الجمع بين الصلاتين في السفر؟ فقال: لا بأس بذلك. ألم تر إلى صلاة الناس بعرفة؟»[1].

ئەمەی کە رابووورد هەمووی فەرمودەو ریوایەتی زانایانی سەلەف بوو لە سەر دروستی قیاس لە عیباداتدا.

**( رای أبو العباس ابن تيمية لە قیاسکردن لە عیباداتدا )**

تەنانەت (أبو العباس ابن تيمية الحراني)یش بۆ سەلماندنی دروستی جەمع لە سەفەردا پشتی بەستووە بە کۆمەڵێك بەڵگەی دروست، لەوانە ئەم ریوایەتەی کە (ابن شهاب) لە (سالم بن عبد الله)وە ریوایەتی کردووە، پاشان بە صەراحەت قیاسەکەی لە عیباداتدا پێ دروست و شایستەیە چونکە وەك دەڵێت ئەو قیاسە کاری زانایانی سەلەفەو بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە جەمعی نوێژەکان تایبەتمەند نییە تەنها بە عەرەفەوە وەك دەڵێت: « قلت فهذا استدلال من السلف بجمع عرفة على نظيره، وأن الحكم ليس مختصاً، وهو جمع تقديم للحاجة في السفر »[2].

هەروەها لە زانایانی ئیسلام پێشەوا (**تاج الدين ابن السبكي الشافعي**(ت٧٧١هـ) لە (الأشباه والنظائر)دا قیاسی کەفارەتی کوشتنی عەمدی کردووەتە سەر پێویستی کەفارەتی کوشتنی بە هەڵە، وەك دەفەرموێت: « قتل العمد يوجب الكفارة قياسًا على الخطأ، وهو قياس أولى، لأنه إذا

١. معرفة السنن والآثار للبيهقي: (١١/٥)برقم(١٦٨٠).

٢. مجموعة الرسائل والمسائل لابن تيمية: (٢ / ٣٢).

وجـب في الخطـأ فالعمـد أولى. وقـال أبـو حنيفـة: لا يجـب إذ لا قيـاس في الكفارات »[1].

هەروەها پێشەوا (**أبو الحسن علي بن البعلي الحنبلي**) ناسـراو بـە (**ابـن اللحـام الحنبلي**) لە كتێبی (المختصر)یدا پێی وایـە کـە قیـاس لـە هـەموو بابێکـدا دروستە عیبادەت و جگە لەویش، وەك دەڵێت: «مسألةٌ: يجرى القياس فـى العبادات والأسباب والكفارات والحدود والمقدرات عنـد أصـحابنا والشـافعية خلافا للحنفية»[2].

هەروەها پێشەوایانی (**آل تيمية**) لە حەنبەلیەکان واتە: (**عبد السلام و عبـد الحليم وأحمـد بـن عبـد الحليم بـن تيميـة**) کـە مەشـهورن بـە (آل تيميـة). ئـەو حەقیقەتـەیان بـاس کـردووە کـە لای حەنبەلیـەکان وەك شـافیعیەکان و مالیکیەکان و (القاضي أبو يوسف) لـە حەنەفیـەکان: قیـاس درووسـتە لـە هـــەموو بابێکـــدا وەك لـــە (المســـودة لآل تيميـــة)دا هـــاتووە کـــە ئەمـــە دەقەکەیەتی: « مسألة يجوز اثبـات الحـدود والكفـارات والابـدال والمقـدرات بالقياس، وبه قالت الشافعية، خلافا للحنفية الا أبا يوسف، فقد حُكـي عنـه كقولنـا، ومنصـوص الشـافعية كقولنـا، وقـد رد (الشـافعي) علـيهم وأبـان تناقضـهم بكـلام مبسـوط ذكـره عنـه الجـويني، وعنـدهم (الحنفيـة) يثبـت بالاستدلال. وهذا يعود الى تنقيح المناط، وحكى القاضي(الحنبلي) عـنهم أن التقدير لا يثبت الا بتوقيفٍ أو اتفـاق. قـال وعنـدنا يثبـت بـذلك وبالقيـاس. وكلام أحمد في الحدود والكفـارات علـى مـا ذكـره القاضـي. قـال فـى روايـة المروذي فيمن سرق من الذهب أقل من ربع دينار أقطعه، قيل لـه: ولم قـال

---

١. الأشباه والنظائر للإمام تاج الدين ابن السبكي الشافعي المتوفى ٧٧١هـ: (٢/١٧٧).

٢. المختصر في أصول الفقه على مذهب الإمام أحمد بن حنبل للإمام أبي الحسن البعلي الحنبلي، بتحقيق: د. محمد مظهربقا: (ص ١٥١).

لأنه لو سرق عروضا قومتها بالدراهم كذلك اذا سرق ذهبا أقل من ربع دينار قومته بالدراهم، فقد أثبت القطع بالقياس، وكذلك نقل عنه الميموني فى النصراني اذا زنى، وهو محصن يرجم. قيل: لِمَ ؟ قال: لأنه زان بعد احصان، ونقل عنه جعفر بن محمد فى يهودي مرّ بمؤذن وهو يؤذن، فقال كذبت. قال: يقتل لأنه شتم. وبعض هذه النصوص قد تكون من باب تحقيق المناط ولا خلاف فيه. مسألة ذكرها الجوينى بعد القياس في المقدرات فى قياس طهارة النجاسة على طهارة الحدث، وهل هما تعبد أو معقولتا المعنى أو أحدهما دون الاخرى. مسألة يجرى القياس في الأسباب عندنا ومنع منه قومٌ.. »[1].

## ( راى سێیەم )
## قیاس کردنیان پێ نادروستە

ئەمەش گوتەی هەندێکی کەمە لە زانایانی خەلەف: کە فەرموویانە: (لا قیاس في العبادات) واتە: قیاس لە عیباداتدا نییە، بەو پێیەی کە ئەصڵ لە عیباداتدا توعەببودییەو حیکمەتەکانی نازانرێت ئیتر ناکرێت قیاسیان لە سەر بکرێت! ئەمەش تەنها بەڵگەیە کە لەسەری ئەو قاعیدەیان دامەزراندووە.

---

١. المسودة في أصول الفقه عبد السلام + عبد الحليم + أحمد بن عبد الحليم آل تيمية، بتحقيق: محمد محيي الدين عبد الحميد (ص ٣٥٦-٣٥٧).

## تاوتوێکردنی ئەم رایەو هەڵوەشاندنەوەی لە چەند روویەکەوە

بەڵێ راستە هەندێك لە زانایانی خەلەف ئەو دەستەواژەیان بەکارهێناوە، بەڵام پێویستە گوفتوگۆی لەسەر بکرێت، پێشەکی ئەوە عیبارەتی هەندێکە لە زانایانی خەلەفە، نە دەقێکی قورئانە و نە سوننەتە ونە ئیجماعەو نە رای زانایانی سەلەفی صالحیشە، چونکە ئەوانەی رەخنە دەگرن لە قیاس لە عیباداتدا بە موتڵەقا جگە لە قورئان و سوننەت زۆر گرنگی نادەن بە بەڵگەکانی تر، بۆیە مافیان نییە جگە لە قورئان وسوننەت بەڵگە بهێننەوە لە گەڵ ئەمەشدا:

١- چونکە واتاکەی موتڵەق و رەها نییە و مەبەستییان لەوە نەبووە کە بە هیچ شێوەیەك دروست نییە، بەو بەڵگانەی کە پێشتر باسمان کردن لە راکانی یەکەم ودووەمدا.

٢- کەواتە ئوصولیەکان کۆ دەنگ نین لە سەر ئەو عیبارەتە، واتە عیبارەتی: (لا قياس في العبادات) بە بەڵگەی ئەو جیاوازیانەی کە باسمان کرد لە راکانی یەکەم و دووەم دا.

٣- ئەوانەش کە وایان فەرمووە لە زانایان مەبەستیان ئەوە نییە بە رەهاو موتڵەق قیاس لە عیباداتدا ناکرێت، بەڵکو مەبەستیان ئەوەیە بە کەمی دەکرێت، چونکە وەك گوتوویانە ئەصڵ لە عیباداتدا تەعەببودییە، (الأصل في العبادات التَّعَبُّدُ)، واتە عیللەت و حیکمەت بزانرێت یان نا، پێویستە کەسی موکەللەف عیبادەتەکە جێبەجێ بکات.

٤- یاخود مەبەست لەو دەستەواژە ئەمەیە کە قیاس لە فەرزو واجیباتی عیباداتدا دروست نییە، کە من بۆ خۆم ئەم تەئویلەم پێ دروسترە، کە پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر پێی گەشتووم، بەڵی بە کۆی

دەنگ قیاس درووست نییە لە هیچ جۆرە عیبادەتێكدا ئەگەر واجب بێت یان فەرز، واتە دروست نییە بەنموونە كە پێنج فەرزەكەی نوێژ بكرێت بە شەش فەرز، یان میقداری جۆرەكانی زەكات زیاد وكەم بكات، یاخود مەنسەك و واجیباتی حەج و عومرە زیاد بكرێت، یاخود رۆژوی تر زیاد بكات بە قیاس لە سەر مانگی رەمەزان، كەواتە واتای عیبارەتەكە بەم شێوەیە (لا قياس في واجبات العبادات أو فرائضها)، بە پێچەوانەی قیاسكردن لەو عیبادەتانەی كە سوننەت و نەفل و (تطوع)ن، كە قیاس تیایاندا دروستە، چونكە عومومی بەڵگەكان لە قورئان و سوننەت دەیانگرێتەوەو تەئیدیان دەكات، ئەم تەئویلەش زۆر پێویستە بۆ ئەوەی واتاو ڕا جیاوازەكان یەك بگرێتەوە، چونكە وەك پێشتر باسمانكرد زانایانی ئوصولی فیقهی ئیسلامی پێیان دروستە قیاس لە عیباداتدا، و نمونەی زۆریشیان لە سەرهێناوەتەوە لەوانە قیاسی حەرام كردنی شەحمی بەراز لە سەر لەحمەكەی، چونكە دەقەكە تەنها باسی گۆشتی بەراز دەكات، هەروەها واجب بوونی زەكات لە (گامێش)دا بە قیاس لە سەر زەكات لە (مانگا)دا بەو ئیعتیبارەی كە هەردووكیان لە یەك جینسن[1]،هەروەها پێویستی كەفارەت لە كوشتنی (عەمد) دا بە قیاس لە سەر كەفارەت لە كوشتنی (بەهەڵە) دا كە دەقەكەی قورئان لە سەر ئەمەیان هاتووە، وەك دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَنْ يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَأً وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلاَّ أَنْ يَصَّدَّقُوا فَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ عَدُوٍّ لَكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ

---

١. لە كتێبی: (الموسوعة الفقهية الكويتية) مادة (زكاة البقر)(١٥٨/٨): هاتووە: « وقد سوّى الفقهاء الجاموس بالبقر في الأحكام وعاملوهما كجنس واحد».

مِيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِنَ اللَّهِ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ [1] ئەمانەو زۆر نمونەی تریش کە سەرچاوەکانی فیقهی ئیسلامی لە تێکڕای مەزهەبە فیقهیەکاندا کاریان پێ کردووە، لە باسی (القیاس)دا باسیان کردووە[2]. ئاشکرایشە کە بەڵگەی قیاس لای ئوصولیەکان هەژمارکراوە لە ریزبەندی چوارەمدا واتە پاش (الکتاب والسنة والإجماع) [3].

٥ـ ئەو قاعیدەش دەفەرموێت: ئەصڵ وایە لە عیباداتدا قیاس نەکرێت، خۆ نەیفەرمووە بە موتڵەقا قیاس ناکرێت، هەر وەکو چۆن ئەصڵ وایە لە موعامەلاتدا قیاس بکرێت، مانای وا نییە کە بە موتڵەقا دروستە قیاس بکرێت لە موعامەلاتدا، کەواتە بە موقابیلی ئەم ئەصڵەوە لە هەردوو بنەماکاندا چەندین فەرع هەیە کە حوکمەکان تیایاندا بە پێچەوانەوەیە.

٦ـ پێویستیشە بزانرێت کە بۆیە قیاس درووست نییە لە عیبادەتە واجبەکاندا، چونکە خودا (جل جلالە) تێکڕای میقدار و ئەندازەی ئەو

---

١. (سورة النساء: ٩٢).

٢. الأشباه والنظائر للإمام تاج الدين ابن السبكي الشافعي المتوفى ٧٧١هـ: (١٧٧/٢).

٣. قال الإمام أبو علي أحمد بن محمد بن إسحاق الشاشي في أصوله (ص ٣٠٨): «القياس حجةٌ من حجج الشرع يجب العمل به عند انعدام ما فوقه من الدليل في الحادثة وقد ورد في ذلك الأخبار والآثار». وقال القاضي الشوكاني في إرشاد الفحول بتحقيق: أحمد عزو عناية: (٩١/٢): «الفصل الثاني: في حجية القياس، اعلم: أنه قد وقع الاتفاق على أنه حجة في الأمور الدنيوية. قال الفخر الرازي: كما في الأدوية، والأغذية. وكذلك اتفقوا على حجية القياس الصادر منه (ﷺ)، وإنما وقع الخلاف في القياس الشرعي: فذهب الجمهور من الصحابة، والتابعين، والفقهاء، والمتكلمين إلى أن القياس الشرع أصل من أصول الشريعة، يستدل به على الأحكام التي "لم" يرد بها السمع».

ئەركانەی کە واجبی کردوون لە سەر بەندەکانی بە پێی یاسای پڕ حیکمەتی خۆی دایرشتووە و واجبی کردووە، کە تواناکانی عەبدەکانی بە گشتی تیایاندا رەچاو خراوە. پاشان پێغەمبەر (ﷺ) سوننەت گەلێکی دامەزراندووە بۆ ئەو بەندانەی کە زیاتر تواناو هیممەتیان هەیە بۆ عیبادەت، پاشان بەڵگە گشتییەکانی قورئان و سوننەت بە گشتی هانی خەڵکییان داوە بۆ زێدە عیبادت لە هەموو بوارێکدا هەر خێر و عیبادەت و چاکەیەك بێت، ئەوانەی کە ئەهلی هیممەتی زیاترن لە بەندەکانی خودا پابەندن بە تێکڕای دەقەکان، چ تایبەتمەندەکان چ گشتگیرەکان، هەروەها بەردەوام بیردەکەنەوە لە دامەزراننی کاری چاك بە پاڵپشتی بە بەڵگە گشتییەکان و لە سەریشی بەردەوام دەبن، وەك لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا بە درێژی روونمان کردەوە. قیاس کردنیش لە عیباداتدا لەو چوارچێوەدا دەگیرسێتەوە. وەك پاشتر دێنە سەری..

## رای پەسەند لەم مەسئەلەدا

کەواتە بەم پێیە روون بوویەوە کە رای پەسەند ئەوەیە کە قیاس دروستە بکرێت لە زۆر شتا، بە تایبەت ئەو شتانەی کە (معقولة المعنی)ن، بەڵام لە فەرزو واجباتدا قیاس ناکرێت، لە بەر چەند حیکمەتێك کە باسمان کرد، وە رای پەسەند ئەوەیە کە سنووری قیاسکردن لە عیباداتدا بەرتەسکەو بە کەمتر دەکرێت بە بەراورد لە تەك قیاس لە معامەلات و مناکحات و..هتد. بەو پێیەش تەوفیق خرایە نێو را جیاوازەکانەوە و دەرکەوت کە جیاوازیەکە تەنها رواڵەتە نەك لە جەوهەر وناوەرۆکدا، واتە جمهوری ئوصولیەکان لە سەلەف و لە خەلەف کە دەڵێن: دروستە قیاس

ئیسلام. ئەم بیدعەتی (صلاة اللیل)ە بە جەماعەت هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) دایانهێناوەو کەسیش نەیگووتووتە خراپیان کردووە بەڵکو تا ئەمڕۆش موسڵمانان شوێکەوتەی ئەو داهێنراوە چاکەن کە کرۆکی عیبادەتیشەو پێغەمبەریش(ﷺ) بەو شێوە نەیکردووە.

پێشەوا (القرطبي) دەفەرموێت: « عن أبی أمامة الباهلي (رضي الله عنه) – واسمه صدی بن عجلان – قال: أحدثتم قیام رمضان ولم یکتب علیکم، انما کتب علیکم الصیام، فدوموا علی القیام إذ فعلتموه ولا تترکوه، فان ناسا من بنی اسرائیل ابتدعوا بدعا لم یکتبها الله علیهم ابتغوا بها رضوان الله فما رعوها حق رعایتها، فعابهم الله بترکها فقال: (ورهبانیة ابتدعوها ما کتبناها علیهم الا ابتغاء رضوان الله فما رعوها حق رعایتها)»[١].

واتە: « ئەبوو ئومامەی باهیلی (رضي الله عنه) فەرمووی بە هاوەڵانی: ئێوە شەونوێژی ڕەمەزانانتان داهێنا کە لە سەرتان فەرز نەکرابوو، کە تەنها ڕۆژووی ڕەمەزان لە سەرتان واجب کرابوو، بۆیە کە دەیکەن بەردەوام بن لە سەر داهێنراوەکەتان و وازی لێ مەهێنن، چونکە کەسانێك لە نەوەی ئیسرائیل چەند عیبادەتێکی داهێنراویان داهێنا لە بەر ڕەزامەندی خودا، کە خودا واجبی نەکردبوو لە سەریان، بەڵام پاشتر جێبەجێیان نەکردو وازیان لێ هێنا، خوای گەورەش سەرزەنشتی کردن ورەخنەی لێ گرتن بە وازهێنانیان لەو داهێنراوانەیان، و فەرمووی: (ورهبانیة ابتدعوها..».

١. الجامع لأحکام القرآن للقرطبي: (١٧/٢٦٣ـ٢٦٤)، واللباب في علوم الکتاب لابن عادل أبي حفص الحنبلي: بتحقیق: عادل أحمد عبد الموجود + علي محمد معوض، (١٨/٥٠٥).

## سەرنج و گفتوگۆیەك لەمەڕ یەکنەگرتنەوەی پەیڕەوی (ابن تیمیة) لە تەك پەیڕەوی وەهابیەکاندا لەم مەسئەلەدا!

بەڵێ ئێمە ناڵێین: دروست نییە شەونوێژ ئەنجام بدرێت بە جەماعەت چ لە رەمەزان و چ لە غەیری رەمەزاندا، چونکە بڕوامان بە داهێنراوی چاك هەیە، بەڵام ئەم نمونانە دەهێنینەوە لە بەر ئیرغام و ئیفحام و ئیبهاتی نەیارە، کە پێی وایە نابێت شتێك پێغەمبەر (ﷺ) نەیکردبێت بکرێت. ئەی خۆ پێغەمبەر(ﷺ) بە بەردەوامی تەراویحی رەمەزانیشی نەکرد سی رۆژەکە بە جەماعەت، خۆ سەحابەکانیش سی رۆژەی رەمەزانیان شەو نوێژ نەکرد لە دوای نیوەی شەو بە جەماعەت، کەچی وەهابیەکان دەیکەن و بەکاریدەهێنن بۆ ریکلام و دیعایە بۆ رژێمەکەیان! لە کاتێکدا پێویستە لە سەریان وەڵامی (ابن تیمیة)ش بدەنەوە کە پێی وایە ئەو نوێژانەی کە پێغەمبەر(ﷺ) بە بەردەوامی نەیکردووە واتە پچڕ پچڕ کردوونی وەك شەونوێژی بە جەماعەت، پێویستە نەکرێتە عادەت و بە راتبەو بەردەوامی ئەنجام نەدرێت، ئەگەر نا ئەوە بیدعەتێکی گومڕاییە، و گۆڕینی شەریعەتە، وەك دەڵێت: « وأما ليلة النصف، فقد روي في فضلها أحاديث وآثار ونقل عن طائفة من السلف أنهم كانوا يصلون فيها، فصلاة الرجل فيها وحده قد تقدمه فيه سلف وله فيه حجة فلا ينكر مثل هذا. وأما الصلاة فيها جماعة، فهذا مبني على قاعدة عامة في الاجتماع على الطاعات والعبادات. فإنه نوعان أحدهما سنة راتبة إما واجب وإما مستحب كالصلوات الخمس والجمعة والعيدين. وصلاة الكسوف والاستسقاء والتراويح، فهذا سنة راتبة ينبغي المحافظة عليها والمداومة. والثاني: ما ليس بسنة راتبة مثل الاجتماع لصلاة تطوع مثل قيام الليل أو على قراءة

قرآن، أو ذكر الله أو دعاء. فهذا لا بأس به إذا لم يُتَّخذ عادة راتبة [1]. فإن النبي (ﷺ) صلى التطوع في جماعة أحياناً ولم يداوم عليه إلا ما ذكر. وكان أصحابه إذا اجتمعوا أمروا واحدًا منهم أن يقرأ والباقي يستمعون. وكان عمر بن الخطاب يقول لأبي موسي: ذكرنا ربنا، فيقرأ وهم يستمعون. وقد روي أن النبي (ﷺ) خرج على أهل الصفة ومنهم واحد يقرأ فجلس معهم. وقد روي: في الملائكة السيارين الذين يتبعون مجالس الذكر الحديث المعروف. فلو أن قوما اجتمعوا بعض الليالي على صلاة تطوّع من غير أن يتّخِذوا ذلك عادة راتبة تُشبِه السنة الراتبة لم يُكره لكن اتخاذه عادة دائرة بدوران الأوقات مكروهٌ، لما فيه من تغيير الشريعة وتشبيه غير المشروع بالمشروع، ولو ساغ ذلك لساغ أن يُعمل صلاة أخرى وقت الضحى، أو بين الظهر والعصر، أو تراويح في شعبان.. فمن جعل شيئاً ديناً وقربة بلا شرع من الله، فهو ضال مبتدع، وهو الذي عناه النبي (ﷺ) بقوله: (كل بدعة ضلالة)، فالبدعة ضد الشرع، والشرع ما أمر الله به ورسوله، أمر إيجاب أو أمر استحباب، وإن لم يفعل على عهده كالاجتماع في التراويح على إمام واحد، وجمع المصحف، وقتل أهل الردة والخوارج، ونحو ذلك، ومالم يشرعه الله ورسوله(ﷺ) فهو بدعة وضلالة، مثل تخصيص مكان أو زمان واجتماع على عبادة فيه، كما خص الشارع أوقات الصلوات وأيام الجمع والأعياد!»[2].

ئیتر نازانم وەهابیەکان وەڵامی (ابن تیمیة) دەدەنەوە؟ یان وازدەهێنن لەو هەموو بیدعەتانەی - بە زاراوەی خۆیان - کە لە حەرەمەین

١. مجموع الفتاوى الكبرى لابن تيمية: ٢٣ / ١٣٢.
٢. مجموع الفتاوى الكبرى لابن تيمية: ٢٣ / ١٣٣ – ١٣٤.

دا دەیکەن و پێشیان وایە قوربەو تاعەتەو هیچیشی لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و صەحابەدا نەکراون؟

یان دەمارگیری مەزهەبی دەیانگرێت و پەردە پۆشی بۆ فەتواکەی دەکەن! یان پێیان وایە کە (ابن تیمیة) مەعصووم نەبوەو، جائیزە بە هەڵەدا چوو بێت وەك زۆرێك لە فەتوا کانی تری، کە زانایان لە کۆن و تازەدا وەڵامیان داوەتەوە؟ بەو پێیەش دێنەوە هۆش و پەیڕەو دەکەن لە راستە رێگەی زانایان و موجتەهیدانی ئیسلام بە درێژایی مێژووی ئیسلامی، وە هیچ ئیحراجییەکیش روویان تێناکات لە ئەنجامدانی ئەو داهێنراوەنەدا کە دایانهێناوە یان زانایانی ئیسلام دایانهێناوەو ئەوانیش دەیکەن، لەوانەش وەك ئاشکرایە شەونوێژی بەجەماعەتی پاش نیوەی شەوە کە کەناڵەکانی (سعودیة) راستەو خۆ ئەو مەراسیمە شکۆدارە دەیگوێزنەوە ساڵانە بە بەردەوامی و راتبە لە تەواوی شەوانی مانگی پیرۆزی رەمازاندا لە پاش سەعات ١٢ی شەو، عیبادەتیشەو بیدعەیشەو لە هەمان کاتدا حەسەنەشەو هیچ بەڵگەیەکی راستەو خۆشی لە سەر نییە[1] بەو شێوازەو لەوکاتەداو بە بەردەوامی و بێ پچڕان.

---

١. لە کاتێکدا لە (صحيح البخاري (٢٦٥٨/٦) برقم(٦٨٦٠)دا هاتووە لە (زيد بن ثابت رضي الله عنه) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: « أفضل صلاة المرء في بيته إلا الصلاة المكتوبة» هەروەها لە (صحيح مسلم (٥٣٩/١)برقم(٧٨١) لێیەوە دەیگێڕێتەوە بە لەفزی: « إن خير صلاة المرء في بيته إلا الصلاة المكتوبة». واتە: « باشترین نوێژی موسڵمان ئەو نوێژەیە کە لە ماڵەوەدا ئەنجامی بدات جگە لە نوێژە فەرزەکان». بەڵی هەندێك نوێژ هەیە سوننەتە بە جەماعەت بکرێت کە ئەوانە بە دەقی راستەوخۆ تەخصیص کراون. بەڵام بەڵگەی موخەصیص نییە بۆ بە جەماعەت ئەنجامدانی شەو نوێژ لە پاش نیوەی شەو و لە رەمەزاندا و ساڵانەش دوبارە بکرێتەوە، مەگەر عمومی ئەدیللەو تەقسیمی زانایانی ئیسلام بۆ داهێنراو

گواستنەوەشی بە رێگای کەناڵی ئاسمانی بۆ خۆی ئەویش بیدعەتە وپێچەوانەی زاهیری بەڵگەکانی قورئان و سوننەتە، کە هانی موسڵمانانیان داوە عیبادەت بە پەنهانی بکات بەتایبەت شەو نوێژ، بەڵام بە هەر حاڵ ئێمە تەئویلی چاکی دەکەین و دەڵێین لە بەر چاوی دوژمنە، یان لە پێناو دەعوەو چاولێکردنە، هەرچەندە وەهابیەکان بڕوایان زۆر بە تەئویل نییە، مەگەر لە جێگەیەك کە لە بەرژەوەندییان بێت!

**ئەگەر دەڵێت:** فەرمودە هەیە لە سەر ئەوەی کە صەحابە لە رەمەزاندا و لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) شەو نوێژیان کردووە! **دەڵێین:** ئەو شەو نوێژە مەبەست لێی نویژی تەراویحە، وەك (ألباني) بە روونی باسی ئەوەی کردووە کە مەبەست لە (صلاة الليل)لە رەمەزاندا (صلاة التراويح)ە، وەك دەڵێت: «تمهيد في استحباب الجماعة في التراويح، لا يشكُّ عالمٌ اليوم بالسُّنَّة في مشروعية صلاة الليل جماعةً في رمضان، هذه الصلاة التي تُعرف بصلاة التراويح لأمور ثلاثة..» [1].

بۆ چاکەو خراپە، کە بێگومان ئەمە لە بەشە چاکەکەیە وپێویستە وەهابیەکان دانی پێدا بنێن.

١. صلاة التراويح للألباني (ص١٠).

## ( سیازدەهەم )

### داهێنانی خوێندنەوەی بەردەوامی سورەتی ئیخلاص لە داوی سورەتی ( الفاتحة ) لە نوێژی جەماعەتدا لە لایەن هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە( ﷺ )

بە پێی زانیاری (بەندە) دوو ریوایەت هەیە لە بارەی داهێنانی خوێندنەوەی تەنها سورەتی ئیخلاص(قل هو الله أحد) بە بەردەوامی لە لایەن هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە(ﷺ)لە دوای خوێندنی سورەتی فاتیەی نێو نوێژە فەرزەکان و بە جەماعەت لە لایەن هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە (ﷺ)، لە کاتێکدا کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ خۆی وەهای نەدەکرد، بەڵام کە هەواڵیان پێدا کە فڵانە هاوەڵی ئەو کارەی داهێناوە، رەخنەی لێ نەگرت و نەیفەرموو چۆن داهێنان دەکەیت لە عیباداتدا، یان چۆن عیبادەتێك دەکەیت کە من نەمرکربێت یان نەمگوتبێت! بەڵکە بە یەکێکیانی فەرموو: «هەواڵی بدەنێ کە خودا خۆشی دەوێت»، بەوی تریشیانی فەرموو: «خۆشویستنی تۆ بۆ ئەو سورەتی ئیخلاص تۆی خستە بەهەشتەوە». کە ئەمە دەقی هەردوو فەرموودەکەیە:

١ـ أخرج الشيخان عن أم المؤمنين سيدتنا عائشة(رضي الله عنها): أن النبي (ﷺ) بعث رجلاً على سرية وكان يقرأ لأصحابه في صلاته فيختم بـ {قل هو الله أحد} . فلما رجعوا ذكروا ذلك للنبي (ﷺ) فقال: « سلوه لأي شيء يصنع ذلك ». فسألوه فقال: لأنها صفة الرحمن، وأنا أحب أن أقرأ بها، فقال النبي (ﷺ): «أخبروه أن الله يحبه»[١].

٢ـ أخرج البخاري عن ثابت عن انس رضي الله عنه قال: كان رجل من الانصار يؤمهم في مسجد قباء وكان كلما افتتح سورة يقرأ بها لهم في الصلاة

١. صحيح البخاري (٦/٢٦٨٦)برقم(٦٩٤٠) وصحيح مسلم (١ / ٥٥٧)برقم(٨١٣).

مما يقرأ به افتتح {قل هو الله أحد. حتى يفرغ منه، ثم يقرأ سورة أخرى معها، وكان يصنع ذلك في كل ركعة فكلمه أصحابه فقالوا إنك تفتتح بهذه السورة ثم لاترى أنها تجزئك حتى تقرأ بأخرى فأما أن تقرأ بها وأما أن تدعها وتقرأ بأخرى فقال ما أنا بتاركها إن أحببتم أن أؤمكم بذلك فعلت وإن كرهتم تركتكم وكانوا يرون أنه من أفضلهم وكرهوا أن يؤمهم غيره فلما أتاهم النبي (ﷺ) أخبروه الخبر فقال (يافلان مايمنعك أن تفعل مايأمرك به أصحابك وما يحملك على لزوم هذة السورة في كل ركعة). فقال إني أحبها فقال (حبك إياها ادخلك الجنة »[1].

شايەنی باسە ئەم فەرموودەیەی دووەم بەڵگە نییە لە سەر دروستی نوێژ بە بێ خوێندنی سورەتی فاتیحە، ئەو بۆچوونە وەك (القاضي الشوكاني) دەفەرموێت وەڵام دراوەتەوە كە دەڵێت: « وأجيب بأن الراوي لم يذكر الفاتحة للعلم بأنه لا بد منها فيكون معناه افتتح سورة بعد الفاتحة أو أن ذلك قبل ورود الدليل على اشتراط الفاتحة »[2]. واتە: « وەڵامی دراوەتەوە بەوەی كە راوی فەرموودەكە باسی سورەتی فاتیحەی لە سەرەتادا نەكردووە، چونكە زانیار بووە پێی، بۆیە پێویستی نەكردووە باسی بكات، یاخود ئەم رووداوە پێش واجب بوونی خوێندنی سورەتی فاتیحە رووی داوە ».

هەروەها مەبەست لەم دوو فەرموودە ئەوە نییە كە باشتر وابێت كە لە دوای سورەتی (فاتیحە) لە ركاعەتەكانی یەكەم و دووەمدا تەنها سورەتی (ئیخلاص) بخوێ‌ندرێت، بەڵكو مەبەست لێیانەوە درووستی

---

١. صحيح البخاري (١/٢٦٨)برقم(٧٤١).

٢. نيل الأوطار من أحاديث سيد الأخيار شرح منتقى الأخبار للقاضي محمد بن علي الشوكاني: مع تعليقات محمد منير الدمشقي (٢/٢٥١).

ئەوكارەیە بۆیە (الإمام ابن رجب الحنبلي) لە راڤەی فەرموودەكەدا دەفەرموێت: «ویدل على أنه ليس هو الأفضل " لأن أصحابه استنكروا فعله وإنما استنكروه لأنه مخالف لما عهدوه من عمل النبي (وأصحابه في صلاتهم " ولهذا قال له النبي: « ما يمنعك أن تفعل ما يأمرك به أصحابك؟»[1].

كەواتە تەنانەت لە سەردەمی خۆشەویستیشدا (ﷺ) دروست بووە داهێنان لە عیباداتدا بە مەرجێت لە جۆری فەرز و واجبات نەبێت. نەك تەواوكاری واجیبات.

**ئەگەر دەڵێت:** ئەوە ئیقراری پێغەمبەری(ﷺ) لە سەرە؟ **دەڵێین:** راستە، بەڵام قسەی ئێمە لە سەر ئەوەیە كە:

١ـ ئاشكرایە لە فەرموودەكانەوە كە بەر لە ئیقرارەكەی پێغەمبەر(ﷺ) خودا داهێنراوەكەی لێ وەرگرتووە.

٢ـ پێغەمبەریش(ﷺ) ئیقراری لە سەر بیدعەتە چاكەكەی ئەو دوو هاوەڵەی خۆی كردووە.

٣ـ هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) سەربەخۆ داهێنانیان كردووە لە هەندێك عیباداتدا و پێغەمبەریش(ﷺ) ئینكاری نەكردوون و بەڵكو دەستخۆشی لێ كردوون. (وهذا هو المطلوب وبالله التوفيق).

---

١. فتح الباري في شرح صحيح البخاري للإمام زين الدين أبي الفرج عبد الرحمن ابن شهاب الدين البغدادي ثم الدمشقي الشهير بابن رجب، تحقيق: أبو معاذ طارق بن عوض الله بن محمد ـ لابن رجب (٤ / ٤٧١).

## هۆکار لە خوێندنەوەی سورەتە کورتەکان لە تەراویحدا لە لایەن زۆربەی زانایانی پێشینە بە تایبەت لە کوردستاندا

جێگەی ئاماژەشە کە چونکە لە ئەصڵدا سووننەت نییە تەواو کردن و خەتمی قورئـان لـە نوێـژی تـەراویح دا، بـەڵکو ئـەویش لـە داهێنـراوە چاکەکانە، وەك بە درێژتر لەمەودوا باسی دەکەین، بۆیە زۆرێك لە زانایانی گـەورەی پـێش ئێمـە لـە کوردسـتان ودەرەوەی کوردستانیشـدا لـە رەمەزانانـدا لـە پـاش خوێنـدنی سـورەتی فاتیحـە تـەنها سـورەتێکی بچووکییان دەخوێند بە تایبەت سورەتی ئیخلاص و پاشان دەچوون بە کڕنووشدا، ئەو کارەیان هـەم لـە بـەر جێبـەجێ کردنـی ئەصـڵی سـوننەت بووە، هەم لە بـەر مەحەببـەتیان بـووە بۆ ئـەو سـورەتە کـە بچووکە بە قـەبارە، بـەڵام سـێ یـەکی قورئانـە بـە پاداشـت، هـەروەها لـە بـەر ئاسانکارییان بووە بۆ موسڵمانان.

ئـەو حەقیقەتـە زانـای پێشـەوا (أبـو بكـر ابـن العربـي) لـە (أحكـام القرآن)یدا لە شەرحی ئەو فەرموودەی پێشـوودا روونـی کردووەتـەوە وەك دەفەرموێت: « فكان هذا دليلاً على أنَّه يجوز تكرار سورة في كل ركعة، وقد رأيت على باب الأسباط فيما يقرب منه إماماً من جملة الثمانيـة والعشـرين إماماً، كـان فيـه يصـلي التراويح في رمضـان بـالأتراك، فيقـرأ في كـل ركعـة بالحمد لله، وقـل هـو الله أحـد، حتـى يـتمَّ التراويـحُ تخفيفـاً علـيهم ورغبـة في فضلها، وليس من السُّنَّة ختمُ القـرآن في رمضـان، حسـبما ذكرنـاه في شـرح الحديث والمسائل » [1].

---

١. أحكام القرآن للحافظ أبي بكر ابن العربي المالكي: (١٦٨/٨).

## ( چواردەهەم )

## داهێنانی دەرسی ڕۆژانی هەینی بە بەردەوامی لە لایەن پێشەوا ( عکرمە )وە بە فەرمانی حەزرەتی ( ابن عباس ) ( رضي الله عنهم )

حەزرەتی (ابن عباس) (رضي الله عنهما) لە مەڕ دامەزراندنی عیبادەت و کاری چاکدا بە خۆیەوە نەوەستاوە، ئەوەتانێ فەرمان دەکات بە حەزرەتی (عکرمة) کە هەموو ڕۆژێکی هەینی (جومعە) بە بەردەوامی یەك جار ئامۆژگاری موسڵمانان بکات، ئەگەر حەزی کرد با بیکات بە هەفتەی دوو جار، لای زۆریەکەی سێ جار، بۆ ئەوەی تۆشی بێتاقەتی نەبن، وەك لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە: «عن عكرمة عن ابن عباس قال: حدِّثْ الناسَ كلَّ جمعة مرةً، فإن أبيتَ فمرتين، فإن أكثرتَ فثلاث مرار..» [1].

ئەو دامەزراوە چاکە تا ئەمڕۆش لە زۆرێك لە مزگەوتەکاندا بەیانیانی ڕۆژی هەینی، یان پاش نوێژی عەسری ئەو ڕۆژ پیادە دەکرێت لە لایەن مامۆستایانی مزگەوتەکانەوە، موسڵمانانیش پێیان داهێنراوێکی باش بووە، چونکە بەڵگە گشتییەکانیش تەئیدی دەکەن، با بەڵگەو دەقی ڕاستەوخۆشی لە سەر نەبێت جگە لە ووتەی صەحابی.

بەتایبەت ئەو وەعز و ئامۆژگاریانە لە سەردەمی حەزرەتی شێخ حەسەنی بەصریدا (١١٠ك) (رحمه الله) بەرەوی پێ دراو مەدرەسەی گەورەی تەصەووف لە بەصرەو دونیای ئیسلامدا بۆ ئەو مەبەستە دامەزرا[2]، وەختێکیش لە بارەی ئەو چیرۆکانەوە کە ئامۆژگاری

---

١. صحيح البخاري: (٥ / ٢٣٣٤)برقم(٥٩٧٨).

٢. بۆ زانینی ووردەکاری و درێژەی ئەو باسە بگەڕێرەوە بۆ هەردوو دانراوی لە چاپدراوی (دانەر): تەصەووف لە بنچینەو ناوەڕۆکدا: (ل ٢ بە دوواوە). جیهادی ئەهلی تەصەووف بە

موسڵمانانی پێ دەکرد پرسیاریان کرد لە (الشيخ حسن البصری) فەرمووی: «نعم البدعة» واتە: ئای چەند داهێنراوێکی چاکە، کە تەنها (چونیەتیەکە) (الكيفيه) داهێنراو بووە، نەك ئەصڵی ئامۆژگاری چونکە بەڵگە گشتییەکان تەئیدی دەکەن، وەك (الحافظ العسقلاني) دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێت: « وكذا قول الحسن في القصص: نعم البدعة" لأن الوعظ مشروعٌ »[1].

## ( پازدەهەم )

## داهێنانی نزای ( التثويب ) لە لایەن حەزرەتی بیلالەوە ( رضي الله عنه ) پێش ئیقراری پێغەمبەر( ﷺ ). پاشان داهێنانی ئاگادارکردنەوەی خەلیفەی ئیسلام لە پاش بانگ و پێش قامەت بەتایبەت لای حەنەفیەکان

یەکێکی تر لە دامەزراوە چاکەکان بریتییە لە نزای ئاگادارکردنەوەی بانگوێژ بە (التثويب) واتە بە: (الصلاة خير من النوم) [2] لە بانگی بەیانیادا، بەڵی پێغەمبەر(ﷺ) پاشان ئیقراری لەسەر فەرموو، بەڵام وەك ریوایەت کراوە بۆ یەکەم جار حەزرەتی بیلال(رضي الله عنه) دایمەزراندووە بەم چەندین ریوایەت وەك:

---

درێژایی مێژووی ئیسلامی: سەر باسی (کورتەیەك دەربارەی سەرهەڵدانی قوتابخانە خزمەتگوزاریەکانی ئەهلی تەصەووف ل ١٤ـ٢٠.

١. فتح الباري في شرح صحيح البخاري للعسقلاني: (١ / ١٦٣).

٢. (التثويب) بە واتای (الإقامة)ش هاتووە: (قد قامت الصلاة)، هەروەها بە واتای (الصلاةَ الصلاةَ..)و هەر، دەستەواژەیەکی تریش کە هانی موسڵمانان بدات بۆ خۆئامادەکردن بۆ نوێژ، بەڵام لای خەڵکی وادەزانن تەنها بە واتای (الصلاة خير من النوم) هاتووە کە ئەوەش دەقیق نییە لە رووی زمانەوانی و زاراوەی فەرمودەوە.

١ـ أخرج الحافظ ابن سعد الزهري في (الطبقات الكبرى) قال: أخبرنا محمد بن عمر قال: حدثني موسى بن محمد بن إبراهيم بن الحارث التيمي عن أبيه قال: كان بلال إذا فرغ من الأذان فأراد أن يعلم النبي، (ﷺ)، أنه قد أذن وقف على الباب وقال: حي على الصلاة، حي على الفلاح، الصلاة يا رسول الله»[1].

٢ـ أخرج الإمام محمد الشيباني قال: أخبرنا أبو حنيفة، عن حماد، عن إبراهيم، قال: سألته عن التثويب، قال: « هو مما أحدثه الناس، وهو حسن مما أحدثوا وذكر أن تثويبهم كان حين يفرغ المؤذن من أذانه: الصلاة خير من النوم » قال محمد: وبه نأخذ، وهو قول أبي حنيفة رضي الله عنه»[2].

٣ـ أخرج الطبراني عن سعيد بن المسيب: أن بلالا أتى النبي (ﷺ) يؤذنه بالصلاة مرة فقيل: إنه نائم فنادى الصلاة خير من النوم فأقرت في صلاة الفجر» [3].

٤ـ وأخرج الطبراني كذلك عن الزهري عن حفص بن عمر عن بلال(رضي الله عنه) أنه: أتى النبي (ﷺ) يؤذنه بالصبح فوجده راقدا فقال: الصلاة خير من النوم مرتين قال النبي (ﷺ): « ما أحسن هذا يا بلال اجعله في أذانك » [4].

١. الطبقات الكبرى لابن سعد: (٣ / ٢٣٤).
٢. الآثار للإمام محمد بن الحسن الشيباني (ص ٨١)برقم(٥٩).
٣. المعجم الكبير للطبراني: (١ / ٣٥٤)برقم(١٠٧٨).
٤. المعجم الكبير للطبراني: (١ / ٣٥٥)برقم(١٠٨١).

٥ـ أخرج الطبراني في الأوسط بسنده عن الزهري عن عروة عن عائشة قالت جاء بلال(رضي الله عنه) إلى النبي (ﷺ) يؤذنه لصلاة الصبح فوجده نائماً، فقال: الصلاة خير من النوم، فأقرّت في أذان الصبح »[1]. [2].

٦ـ أخرج الليثي في الموطأ قال: حدثني عن مالك أنه بلغه: أن المؤذن جاء إلى عمر بن الخطاب(رضي الله عنه) يؤذنه لصلاة الصبح فوجده نائما فقال الصلاة خير من النوم فأمره عمر أن يجعلها في نداء الصبح»[3].

٧ـ أخرج البيهقي بسنده عن الزهري عن حفص بن عمر بن سعد المؤذن أن سعداً كان يؤذن لرسول الله (ﷺ) قال حفص فحدثني أهلي: أن بلالا أتى رسول الله (ﷺ) ليؤذنه بصلاة الفجر، فقالوا: أنه نائمٌ، فنادى بلال بأعلى صوته: الصلاة خير من النوم، فأقرَّت في صلاة الفجر»[4].

٨ـ أخرج البيهقي كذلك بسنده عن شعيب عن الزهري قال: حدثني سعيد بن المسيب فذكر قصة عبد الله بن زيد ورؤياه إلى أن قال: ثم زاد بلالٌ في التأذين: (الصلاة خير من النوم)، وذلك أن بلالاً أتى بعد ما أذّن التأذينة الأولى من صلاة الفجر ليؤذن النبي (ﷺ) بالصلاة، فقيل له: أن النبي (ﷺ) نائمٌ فأذن بلال بأعلى صوته: الصلاة خير من النوم، فأقرّت في التأذين لصلاة الفجر »[5].

---

١. المعجم الأوسط (٧ / ٣٠٩)برقم(٧٥٨٣). قال الحافظ الهيثمي: «رواه الطبراني في الأوسط وفيه صالح بن أبي الأخضر، واختلف في الاحتجاج به ولم ينسبه أحد إلى الكذب»

٢. مجمع الزوائد ومنبع الفوائد للهيثمي: (٢ / ٢)برقم(١٨٦٠).

٣. الموطأ برواية يحيى الليثي بتحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي: (١ / ٧٢)برقم(١٥٤).

٤. السنن الكبرى للبيهقي، ت:محمد عبد القادر عطا: (١ / ٤٢٢)برقم(١٨٣٣).

٥. السنن الكبرى للبيهقي: (١/ ٤٢٢)برقم(١٨٣٤).

٩- أخرج ابن ماجه في سننه بسند صحيح عن الزهري عن سالم عن أبـي: أن الـنبي (ﷺ) استشـار النـاس لمـا يهمهـم إلى الصـلاة. فـذكروا البـوق. فكرهه من أجل اليهود. ثم ذكروا الناقوس. فكرهه من أجـل النصـارى. فأرى النذاء تلك الليلة رجل من الأنصار يقال له عبد الله بـن زيـد وعمـر بن الخطاب. فطرق الأنصـاري رسـول الله (ﷺ) لـيلا. فـأمر رسـول الله (ﷺ) بلالا به فأذن، قال الزهري وزاد بلال في نداء صلاة الغداة الصلاة خير من النوم. فأقرهـا رسـول الله (ﷺ)، قـال عمـر يـا رسـول الله قـد رأيت مثل الذي رأى ولكنه سبقني» (١).

١٠- وأخرج ابن ماجه كذلك بسند صحيح عن معمر عن الزهري عن سعيد بـن المسيب عن بلال: أنه أتى النبي (ﷺ) يؤذنه بصلاة الفجـر. فقيـل هـو نائم. فقال الصلاة خـير مـن النـوم الصـلاة خـير مـن النـوم. فـأقرت في تأذين الفجر. فثبت الأمر على ذلك» (٢)

١. سنن ابن ماجه: (١ / ٢٣٣)برقم(٧٠٧).

٢. سنن ابن ماجه: (٢٣٧/١) برقم(٧١٦). قال الإمام ابن الملقن: « حديث سعيد بن المسيب عـن بلال: أنه أتى النَّبي (ﷺ) يُؤذنهُ بصلاة الفجْر، فقيل: هُوَ نَائِم (فقال) الصَّـلاة خـير مـن النَّـوم مرَّتَيْن، فأقرت فِي تأذين الْفجْر فَثَبت الْأَمر على ذلك). رواه ابن ماجه فِي سـننه عـن عمـرو بـن رَافع، نا عبد الله بن الْمُبَارك، عن معمر، عن الزُّهْرِيّ، عن سعيد به. وهذا إسناد كل رجاله ثقـات أئمَّة أعلام مخرج حديثهم فِي الصَّحيحين، إلَّا (عَمْرو) بن رافع شيخ ابن ماجـه، وهـو حـافظ ». البدر المنير في تخريج الأحاديث والأثار الواقعة في الشرح الكبير، لابـن الملقـن سـراج الـدين أبـي حفص عمر بن علي الشافعي المتوفى ٨٠٤هـ، بتحقيق: مصطفى أبو الغيط وعبدالله بن سليمان وياسر بن كمال (٣٥٨/٣) «وقال الألباني: صحيحٌ ».

١١ـ وأخرج الحافظ أبو يعلى قال الزهري: وزاد بلال في نـداء الصـلاة الفجـر: الصلاة خيرٌ من النوم: فأقرّها نبي الله (ﷺ) وقـال عمـر: إني قـد رأيـت مثل الذي رأى، ولكنه سبقني» [١].

١٢ـ أخرج الطبراني في مسند الشاميين عن الزهري عن سعيد بن المسيب عن أبـي هريـرة: أن بـلالاً أتـى الـنبي (ﷺ) عنـد الأذان الأول مـن الصـبح فوجده نائما فناداه الصلاة خير من النوم فلم يكره رسـول الله (ﷺ) وأدخله في الأذان فلا يؤذن لصلاة غير قبل وقتها غير صلاة الفجر» [٢].

١٣ـ أخرج الحافظ ابن أبي شيبة في المصنّف عن هشام بـن عـروة عـن رجـل يقال له إسماعيل قال: جاء مؤذن عمر (رضي الله عنه) بصلاة الصُّبْح، فقال الصَّلاةُ خيرٌ من النَّوم، فأعجب بـه عمـر، وقـال: للمـؤذن أقرهـا في أذانك » [٣].

بەم فەرمودانەی کە رابووردن بۆمان روون بوویـەوە کـە (تثويـب) لـە ئەصڵدا لە داهێنانی حەزرەتی بیلال بووە(رضي الله عنه) پاشان پێغەمبەر (ﷺ) کارەکەی بە داهێنراوێکی باش زانیوەو ئیقراری لە سەر کردووە.

بەڵام ئایا (تثويب)کردن بـۆ هـەموو نوێـژێك درووسـتە؟ لای جمهـوری زانایان بە شافیعیەکانیشەوە دەفەرموون (تثويب) تایبەتمەنـدە بـە نوێـژی بەیانیانەوە، بەڵام کۆمەڵێك لە زانایان بـە تایبـەت لـە حەنەفیـەکان پێیـان وایە کە(تثويب) بۆ هەموو نوێـژێکی فـەرز دروسـتە، بەتایبـەت بـە نییـەتی

١. مسند أبي يعلى للحافظ أحمد بن علي بن المثنى الموصلي التميمي. تحقيق: حسين سليم أسد:(٩/٣٧٩) برقم(٥٥٠٤).
٢. مسند الشاميين لأبي القاسم سليمان بن أحمد بـن أيـوب الطبرانـي، تحقيـق: حمـدي بـن عبـد المجيد: (٢/٢٣٦) برقم (١٢٥٤).
٣. مصنف ابن أبي شيبة: (١/١٨٩)برقم(٢١٥٩).

ئامادەبوونی پێشەواو دەسەڵاتدارانی موسڵمانان واتە دوای بانگ و پێش قامەت کردن. بۆیە فەتوایان داوەوە پێی و بە داهێنراوێکی چاکیان زانیوە، کە ئەمەی خوارەوە هەندێك لەو دەقانەیە:

١ـ أخرج الحافظ أبو نعيم الفضل بن دكين التميمي في (فضائل الصلاة) عن سفيان عمَّن سمع عبد الرحمن بن أبي ليلى أنه قال: « ما أحدثوا بدعة أحبَّ إلي من التثويب في الصلاة »[1].

٢ـ قال أبو منصور الأزهري في (الزاهر في غريب ألفاظ الشافعي):« وقد يكون التثويب في غير الفجر، وهو أن يقول المؤذن بين الأذانين: الصلاةَ رحمكم الله. وقال عمر (رضي الله عنه) لمؤذنه: اذا أذنت فترسل ثم ثوِّبْ»[2].

٣ـ قال الإمام أبو بكر محمد بن أبي سهل السرخسي الحنفي في (المبسوط): «وإنما استحسن التثويبُ لأن الدعاء إلى الصلاة في الأذان كان بهاتين الكلمتين، فيستحسن التثويب بهما أيضا، هذا اختيار المتقدمين، وأما المتأخرون فاستحسنوا التثويب في جميع الصلوات، لأن الناس قد ازداد بهم الغفلة وقلما يقومون عند سماع الأذان فيستحسن التثويب للمبالغة في الإعلام ومثل هذا يختلف باختلاف أحوال الناس. وقد روى عن أبي يوسف (رحمه الله تعالى) أنه قال: لا بأس بأن يُخَصَّ الأميرُ بالتثويب، فيأتي بابه فيقول: (السلام عليك أيها الأمير ورحمة الله وبركاته، حي على الصلاة مرتين، حي على الفلاح مرتين، الصلاة يرحمك الله) لأن الأمراء لهم زيادة اهتمام بأشغال المسلمين ورغبة في الصلاة بالجماعة، فلا بأس بأن

---

١. فضائل الصلاة للفضل بن دكين أبي نعيم الكوفي التيمي المتوفى ١٨هـ:(١/٢٧٤)برقم(٢٢٤).

٢. الزاهر في غريب ألفاظ الشافعي (رضي الله عنه). لأبي منصور الأزهري الشافعي بتحقيق: د. محمد جبر الألفي: (ص ٨٠) برقم(٩٩).

يخصوا بالتثويب، وقد روى عن عمر (رضى الله تعالى عنهما) أنه لما كثر اشتغاله نصب من يحفظ عليه صلاته»[1].

٤ـ قال الإمام برهان الدين الحنفي في (المحيط البرهاني): « ومشايخنا (رحمهم الله) اليوم لم يروا بالتثويب بأساً في سائر الصلوات في حق جميع الناس، فلا بأس، لأنه حدث تكاسلٌ في الأمور الدينية، واشتغلوا بأمور زائدة من أمور الدنيا، وتغافلوا عن أداء الصلاة لأوقاتها، فنزل سائر الأوقات في زماننا منزلة صلاة الفجر في زمن رسول الله عليه السلام، ثم على ما اختاره المشايخ من التثويب في سائر الصلوات في زماننا يعتبر في ذلك ما يتعارفه كل قوم، حكي عن محمد بن سلمة أنه كان يتنحنح وكان عادة أهل سمرقند قبل هكذا، واختار مشايخ بخارى الصلاة الصلاة.. قامت قامت»[2].

پێم وایە زانایانی حەنەفی (رحمهم الله) بۆیە (تثویب) یان لە هەموو نوێـژێکی فـەرزدا بـە چـاکیان زانیـوە، چـونکە لـە بـابی ئاگادارکردنـەوەو وەبیرهێنانەوەو هاندانی بەرانبەرە بۆ خێراکردن و ئامادەبوون بـە تایبـەت بۆ نوێژەی جەماعەت. (والله تعالى أعلم).

١. المبسوط لأبي بكر شمس الأئمة محمد بن أبي سهل السرخسي الحنفي (١/١٢٧).

٢. المحيط البرهاني في الفقه الحنفي للإمام برهان الدين محمود بن أحمد بن الصدر الشهيد النجاري الشهير بابن مازة الحنفي (٢/١).

## ( شازدەهەم )

## داهێنانی گوتنەوەی وانەی ئامۆژگاری پێنج شەممان بە بەردەوامی لە لایەن حەزرەتی ( عبد الله بن مسعود ) ( رضي الله عنه )

دامەزراندنی وانەی پێج شەممان بۆ یەکەم جار لە لایەن حەزرەتی (عبد الله بن مسعود) (رضي الله عنه) کە ڕۆژانی پێنج شەممان بە بەردەوامی و بە بێ پچڕان وانەیەکی لە ئامۆژگاری و بیرخستنەوە و شارەزاکردنی موسڵمانان دەگوتەوەو کەسیش پێی نەگووت ئەی (ابن مسعود) ئەم عیبادەتەی تۆ ئەنجامی دەدەیت بیدعەتەو پێغەمبەرو چوار خەلیفەیکە نەیانکردووە، واتە کەسیان ڕۆژێکیان تایبەتمەند نەکردووە بە دەرس و ئامۆژگاری، چونکە ئەم کارەی حەزرەتی (ابن مسعود) دامەزراندنێی چاك بوو وە بەڵگە گشتییەکان تەئیدیان دەکرد، یەکێك لە عەرزی دەکات قوربان حەزدەکەم ئامۆژگاریەکانت بکەیتە ڕۆژانە، ئەویش ئەفەرموێت: لە بەر ئەوەیە نایکەم بە ڕۆژانە چونکە دەترسم بێتاقەت و بێزار ببن، وەك لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە کە ئیمامی (البخاری) بابێکی بۆ تەرخان کردووە بە ناونیشانی (باب من جعل لأهل العلم أياماً معلومة) واتە: (باسی ئەوانەی کە ڕۆژێکیان تایبەتمەند کرد بە بڵاوکردنەوەی زانستەوە) پاشان دەفەرموێت: «حدثنا عثمان بن أبي شيبة قال حدثنا جرير عن نصور عن أبي وائل قال: (كان عبد الله يُذَكِّرُ النَّاسَ فِي كُلِّ خَمِيسٍ) فقال له رجل يا أبا عبد الرحمن لَوَدِدْتُ أَنَّكَ ذَكَّرْتَنَا كُلَّ يَوْمٍ،

قَالَ أَمَا إِنَّهُ يَمْنَعُنِي مِنْ ذَلكَ أَنِّي أَكْرَهُ أَنْ أُمِلَّكُمْ، وَإِنِّي أَتَخَوَّلُكُمْ بِالْمَوْعِظَةِ، كما كان النبي (ﷺ) يَتَخَوَّلُنَا بها مخافة السَّآمة علينا»[1].

پێشەوا (الحافظ العسقلاني) چەند نمونەیەكی تریش لەم مەسئەلەدا باس دەكات كە هیچیان پێغەمبەر (ﷺ) بە بەردەوامی و لە كاتی دیاری كراو دا نەیكردوون، بەڵام پاشتر دامەزراون و دامەزراوێكی چاكیشن، وەك دەفەرموێت: « وقد مضى في (كتاب العلم) أن ابن مسعود كان يذكّر الصحابة كل خميس، لئلا يملوا، ومضى في (كتاب الرقاق) أن ابن عباس قال: (أي لعكرمة): حدّث الناس كلَّ جمعةٍ، فإن أبيت فمرتين، ونحوه وصية عائشة لعبيد بن عمير، والمراد بالقصص التذكير والموعظة، وقد كان ذلك في عهد النبي (ﷺ)، لكن لم يكن يجعله راتباً، كخطبة الجمعة، بل بحسب الحاجة »[2].

## ( حەڤدەهەم )

## داهێنانی تەسبیحات بە وورده بەرد لە لایەن ئافرەتێكەوە لە سەردەمی پێغەمبەردا( ﷺ )

لە فەرموودەی صەحیح دا هاتووە كە ئافرەتێك لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) تەسبیحات و یادی خودای دەكرد بە وورده بەرد، كە بۆ یەكەم جار بوو كاری وەها بكرێت و دابهێنرێت، وەختێك پێغەمبەر (ﷺ)

---

١. صحيح البخاري (٣٩/١) برقم(٧٠) وأخرج الإمام مسلم في صحيحه في (صفات المنافقين وأحكامهم) باب (الاقتصاد في الموعظة) (٢١٧٢/٤) برقم(٢٨٢١). بلفظ: « كان عبدالله يذكرنا كل يوم خميس فقال له رجل يا أبا عبدالرحمن إنا نحب حديثك ونشتهيه ولوددنا أنك حدثتنا كل يوم فقال ما يمنعني أن أحدثكم إلا كراهية أن أملكم إن رسول الله (ﷺ) كان يتخولنا بالموعظة في الأيام كراهية السآمة علينا».

٢. فتح الباري شرح صحيح البخاري للعسقلاني، بتحقيق ابن باز: (١٣ / ٢٥٤).

چاوی پێی کەوت، نەهی لێ نەکرد و نەیگوت: تۆ چۆن عیبادەتێك دەکەیت کە ئێمە نەمانکردبێت، بەڵکو رینمایی کرد بۆ باشتر لەو جۆرە تەسبیحاتە، چونکە زەحمەت و ناڕەحەتی تیادایە لە کاتی ژماردنیاندا، راستە ئەمە دەبێتە سوننەتی ئیقرار، بەڵام مەبەستەکە ئەوەیە کە ئەم ئافرەتە بۆ خۆی سەرەتا ئەم جۆرە عیبادەتەی داهێنابوو، پێغەمبەریش (ﷺ) پێی نەگووت: ئەوە بیدعەتە چونکە من نەمکردووە یان نەمگووتووە، یان چۆن دەبێت تۆ داهێنراوێك بکەیت پێش ئەوەی بە من نەڵێت! لە بەر ئەوە ئافرەتەکە دەیزانی مادام نەهی لەسەر نییە ئیتر لە بەشی موباح و دروستە بۆیە کردوویەتی، پرسیاریشی دەربارەی کارەکەی لە پێغەمبەر (ﷺ) نەکرد، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) لە تەك هەندێك لە هاوەڵانیدا چوون و بینیان کە بەو شێوە و بە بەرد تەسبیحات دەکات. پێغەمبەر (ﷺ) لیێ قەدەغە نەکرد بەڵکو فەرمووی: « ئایا هەواڵت بدەمێ بە شتێك کە ئاسانتر و خێریشی زیاتر بێت؟ بڵێ: (سبحان الله) بە ژمارەی هەموو دروستکراوەکانی لە ئاسمان و زەوی و نێوانیان» کە ئەمە دەقی فەرموودەکەیە: «رواه أبو داود في سننه والترمذي وقال حديث حسن غريب من حديث سعد والنسائي وابن حبان في صحيحه والحاكم وقال صحيح الإسناد عن عائشة بنت سعد بن أبي وقاص عن أبيها (رضي الله عنه) أنه دخل مع رسول الله (ﷺ) على امرأة وبين يديها نوى، أو حصى، تسبِّحُ به، فقال أخبرك بما هو أيسر عليك من هذا أو أفضل فقال سبحان الله عدد ما خلق في السماء سبحان الله عدد ما خلق في الأرض سبحان الله عدد ما بين ذلك سبحان الله عدد ما هو خالق والله أكبر مثل ذلك والحمد لله مثل ذلك ولا

إله إلا الله مثل ذلك ولا حول ولا قوة إلا بالله مثل ذلك »[1]. هەروەها لە فەرمودەیەکی تردا هاتووە کە جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) بینی کە (أم المؤمنين)حەزرەتی (صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيّ) (رضي الله تعالى عنها) چوار هەزار دنکە بەردی داناوە و تەسبیحاتیان پێ دەکات، ئەویش نەیفەرموو: ئەی صەفییە تۆ خێزانی منیت، چۆن عیبادەتێك دادەهێنیت کە من نەمکردبێت، یان نەیفەرموو: ئەوە کارێکی بیدعەتەو خراپە، بەڵکو ئیقراری لە سەر داهێنراوەکەی کردوو رێنومایی بۆ باشتریش کرد، چونکە کارێکی زەحمەت بوو، فەرمووی « ئەی (صەفییە) ئایا هەواڵت بدەمێ لە باشتر لەو چوار هەزار دانەیە و خێریشت زیاتر بۆ بنوسرێت، تۆ بڵێ: (سبحان الله) بە ژمارەی هەموو دروستکراوەکانی پەروەردگار». بە چەند رێگەیەك و بە چەند لەفزێك هاتووە کە ئەمە دەقەکەیەتی: (أخرج الحاكم في المستدرك وصحَّحه والطبراني في الأوسط والكبير والترمذي في سننه وأبو يعلى في مسنده عن كنانة عن صفية رضي الله عنها قالت: دخل علي رسول الله (ﷺ) و بين يدي أربعة آلاف نواة أسبح بهن فقال: يا بنت حيي ما هذا ؟ قلتُ أسبح بهنَّ. قال: "قد سبحت منذ قُمتُ على رأسك أكثر من هذا" قلت: علمني يا رسول الله؟ قال: قولي سبحان الله عدد ما خلق من شيء»[2].

---

١. قال الحافظ المنذري في (الترغيب والترهيب) (٢ / ٢٨٦)برقم(٢٤٢٤): « رواه أبو داود والترمذي وقال حديث حسن غريب من حديث سعد والنسائي وابن حبان في صحيحه والحاكم وقال صحيح الإسناد ».

٢. قال الحاكم: «هذا حديث صحيح الإسناد و لم يخرجاه، و له شاهد من حديث المصريين بإسناد أصح من هذا» المستدرك (١ / ٧٣٢)برقم(٢٠٠٨). وصحّحه الحافظ السيوطي في الحاوي للفتاوي: (٣/٢) ورواه الطبراني في المعجم الكبير: (٧٤/٢٤) برقم(١٩٥) وفي المعجم الأوسط (٢٣٦/٨)برقم(٨٥٠٤)، ورواه الحافظ أبو يعلى في مسنده بإسناد

## بەڵگەكانی بەكارهێنانی تەسبیح (السبحة) و هەندێك لە سودەكانی

شایەنی باسە ئەم فەرمووودانەو نمونەكانیان هەروەها بەڵگەن لە سەر دروستی و چاكی تەسبیحاتكردن بە بەرد یاخود بەو شتەی كە پێی دەگوترێت (تەسبیح) یاخود (سەبحە)، چونكە مەبەست لێیەوە سێ شتە (والله تعالی أعلم):

**یەكەمیان:** ژماردنەكان بە هۆیەوە تێك ناچێت لە موسڵمانان، چونكە هەندێكیان (٣٣)دانەن و هەندێكیشیان (٧٠) دانەو هەندێكیشیان (١٠٠) دانە، زۆرێك لە فەرموودەكانیش بەم سێ ژمارە هاتووە وەك مەعلومە.

**دووەمیان:** بۆ ئەوەیە كە ئەو بەردو قەزوان و شتە پاكانەی تر كە تەسبیحاتەكانی پێ دەكرێت ببنە شاهید لە سەر مرۆڤەكان وەك چۆن ئەندامەكانی لەش و جێ سەجدەو..هتد دەبنە شاهید بۆیان لە قیامەتدا.

**سێیەمیان:** ئیمامی (السیوطي) فەرمویەتی: ئەویش بریتییە لە وەبیركەوتنەوەی زیكر و یادی خودا، چونكە وەك فەرمویەتی: هەركاتێت مرۆڤ دەیبینێت یادی خودای وەبیر دێتەوە[1].

بەڵێ پێشەوا (**الحافظ جلال الدين السيوطي**) ریسالەیەكی زۆر بە نرخی هەیە لەو رووەوە، تیایدا بە فەرموودەو ئاساری سەلەف سەلماندوویەتی كە (سەبحە) سوننەتە بە ناونیشانی (**المنحة في السبحة**) كە ئەمەی لای خوارەوە دەقەكەیەتی و ئێمەش هەندێك تەخریجات و تەعلیقاتی پێویستی

---

ضعيف(٢٨/١٣)برقم(٧١١٨)، ورواه كذلك الترمذي في سننه: (٥/٥٥٥)برقم(٣٥٥٤) وقال: هذا حديث غريب لا نعرفه من حديث صفية إلا من هذا الوجه من حديث هاشم بن سعيد الكوفي وليس إسناده بمعروف وفي الباب عن ابن عباس ».

١. الحاوي للفتاوي، رسالة (المنحة في السبحة) للحافظ السيوطي: ٢/٤).

بۆ دەکەین. پێشەوا (الحافظ جلال الدين السيوطي) دەفەرموێت: « بسم الله الرحمن الرحيم. الحمد لله وسلام على عباده الذين) اصطفى وبعد (فقد طال السؤال عن السبحة هل لها أصل في السنة؟ فجمعت فيها هذا الجزء متتبعاً فيه ما ورد فيها من الأحاديث والآثار. والله المستعان. أخرج ابن أبي شيبة، وأبو داود، والترمذي، والنسائي، والحاكم وصححه عن ابن عمرو قال: (رأيت النبي(ﷺ) يعقد التسبيح بيده). وأخرج ابن أبي شيبة، وأبو داود، والترمذي، والحاكم عن بسيرة وكانت من المهاجرات قالت: قال رسول الله (ﷺ): " عليكن بالتسبيح والتهليل والتقديس ولا تغفلن فتنسين التوحيد واعقدن بالأنامل فإنهن مسؤولات ومستنطقات". وأخرج الترمذي، والحاكم، والطبراني عن صفية قالت: دخل علي رسول الله (ﷺ) وبين يدي أربعة آلاف نواة أسبح بهن فقال: ما هذا يا بنت حيي؟ قلت: أسبح بهن، قال: قد سبحت منذ قمت على رأسك أكثر من هذا، قلت: علمني يا رسول الله قال: "قولي سبحان الله عدد ما خلق من شيء" صحيح أيضاً. وأخرج أبو داود، والترمذي وحسنه، والنسائي، وابن ماجه، وابن حبان، والحاكم وصححه عن سعد بن أبي وقاص: أنه دخل مع النبي (ﷺ) على امرأة وبين يديها نوى أو حصى تسبح فقال:" أخبرك بما هو أيسر عليك من هذا وأفضل ؟ قولي سبحان الله عدد ما خلق في السماء، سبحان الله عدد ما خلق في الأرض، سبحان الله عدد ما بين ذلك، وسبحان الله عدد ما هو خالق، الله أكبر مثل ذلك، والحمد لله مثل ذلك، ولا إله إلا الله مثل ذلك، ولا قوة إلا بالله مثل ذلك ". وفي جزء هلال الحفار، ومعجم الصحابة للبغوي، وتاريخ ابن عساكر من طريق معتمر بن سليمان عن أبي بن كعب عن جده بقية عن أبي صفية مولى

النبي (ﷺ) أنه كان يوضع له نطع ويجاء بزنبيل فيه حصى، فيسبح به إلى نصف النهار، ثم يرفع فإذا صلى الأولى أتى به فيسبح به حتى يمسي[1]. وأخرجه الإمام أحمد في الزهد ثنا عفان ثنا عبد الواحد بن زياد عن يونس بن عبيد عن أمه قالت: "رأيت أبا صفية رجل من أصحاب النبي (ﷺ) وكان جارنا قالت: فكان يسبح بالحصى"[2]. وأخرج ابن سعد عن حكيم بن

١. (قال القاضي الشوكاني في (نيل الأوطار من أحاديث سيد الأخيار شرح منتقى الأخبار)، مع تعليقات محمد منير الدمشقي (٣٥٨/٢) هذان الحديثان يدلان على جواز عد التسبيح بالنوى والحصى وكذا بالسبحة لعدم الفارق لتقريره (ﷺ) للمرتين على ذلك وعدم إنكاره والإرشاد إلى ما هو أفضل لا ينافي الجواز وقد وردت بذلك اثار ثم ساقها.. وقال: وقد ساق السيوطي آثارا في الجزء الذي سماه المنحة في السبحة وهو من جملة كتابه المجموع في الفتاوى وقال في آخره ولو ينقل عن أحد من السلف ولا من الخلف المنع من جواز عد الذكر بالسبحة بل كان أكثرهم يعدونه بها ولا يرون ذلك مكروها انتهى. (وفي الحديثين) الآخرين فائدة جليلةٌ وهي أن الذكر يتضاعف ويتعدّد بعدد ما أحال الذاكر على عدده، وإن لم يتكرر الذكر في نفسه فيحصل مثلا على مقتضى هذين الحديثين لمن قال مرة واحدة سبحان الله عدد كل شيء من التسبيح ما لا يحصل لمن كرر لتسبيح ليالي وأياما بدون الإحالة على عدد وهذا مما يشكل على القائلين إن الثواب على قدر المشقة المنكرين للتفضل الثابت بصرائح الأدلة وقد أجابوا عن هذين الحديثين وما شابههما من نحو قوله صلى الله عليه وآله وسلم:"من فطر صائما كان له مثل أجره"."من عزى مصابا كان له مثل أجره" بأجوبة متعسّفة متكلّفة». ونقل عبارته كاملة المحدث أبو العلا المباركفوري في (تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي) (٣٢٢/٩).

٢. جاء في الطبقات الكبرى لابن سعد محمد بن سعد الزهري أبي عبدالله البصري بتحقيق: إحسان عباس: (٦٠/٧). في ترجمة (أبو صفية(رضي الله عنه)): « قال: أخبرنا عفان بن مسلم قال: حدثنا عبد الواحد بن زياد قال: حدثنا يونس بن عبيد عن أمه قالت: رأيت أبا صفية رجلا من أصحاب النبي، (ﷺ)، قالت: كان جارنا هاهنا فكان إذا أصبح يسبح بالحصى والنوى ولا أراه إلا بالحصى».

الديلمي أن سعد بن أبي وقاص كان يسبح بالحصى"[1]، وأخرج ابن أبي شيبة في المصنف عن مولاة لسعد أن سعداً كان يسبح بالحصى، أو النوى "[2] وقال ابن سعد في الطبقات: أنا عبيد الله بن موسى أنا إسرائيل عن جابر عن امرأة حدثته عن فاطمة بنت الحسين بن علي بن أبي طالب أنها كانت تسبح بخيط معقود فيها"[3]. وأخرج عبد الله ابن الإمام أحمد في زوائد الزهد من طريق نعيم بن محرز بن أبي هريرة عن جده أبي هريرة أنه كان له خيط فيه ألفا عقدة فلا ينام حتى يسبح به" وأخرج أحمد في الزهد ثنا مسكين بن نكير أنا ثابت بن عجلان عن القاسم بن عبد الرحمن قال: كان لأبي الدرداء نوى من نوى العجوة في كيس فكان إذا صلى الغداة أخرجهن واحدة واحدة يسبح بهن حتى ينفدن[4]. وأخرج ابن سعد عن أبي هريرة أنه يسبح بالنوى المجزع وقال الديلي في مسند الفردوس: أنا عبدوس بن عبد الله أنا أبو عبد الله الحسين بن فتحويه الثقفي ثنا علي بن محمد بن نصرويه ثنا محمد بن هرون بن عيسى بن المنصور الهاشمي حدثني محمد بن علي بن

---

١. أخرج ابن سعد عن قبيصة بن عقبة عن سفيان عن حكيم بن الديلمي أن سعدا كان يسبح بالحصي». الطبقات الكبرى لابن سعد (٣ / ١٤٣). وأخرجه ابن بي شيبة في مصنفه: (١٦١/٢)برقم(٧٦٥٩).

٢. الحاوي للفتاوي ـ للحافظ السيوطي بتحقيق: عبد اللطيف حسن عبد الرحمن: (٢ /٣ـ ٤).

٣. قال ابن سعد: « أخبرنا عبيد الله بن موسى قال: أخبرنا إسرائيل عن جابر عن امرأة حدثته عن فاطمة بنت حسين أنها كانت تسبح بخيوط معقود فيها». الطبقات الكبرى (٤٧٤/٨).

٤. أخرج عبدالله بن الإمام أحمد عن أبيه عن القاسم بن عبد الرحمن قال: «كان لأبي الدرداء نوىً من نوى العجوة، حسبت عشراً أو نحوها في كيس، وكان إذا صلّى الغداة أقعى على فراشه، فأخذ الكيس فأخرجهن واحدةً واحدةً، يسبح بهن، فإذا نفذن أعادهن واحدة واحدة، كلُّ ذلك يسبح بهنَّ، قال: حتى تأتيه أم الدرداء فتقول: يا أبا الدرداء إن غداءك قد حضر، فربما قال: ارفعوه فإني صائم». ينظر: الزهد للإمام أحمد بن حنبل: (ص ١٤١).

حمزة العلوي حدثني عبد الصمد بن موسى حدثتني زينب بنت سليمان بن علي حدثتني أم الحسن بنت جعفر بن الحسن عن أبيها عن جدها عن علي مرفوعاً: "نعم المذكر السبحة "[1]. وأخرج ابن أبي شيبة عن أبي سعيد الخدري(رضي الله عنه) أنه كان يسبح بالحصى"، وأخرج من طريق أبي نضرة عن رجل من الطفاوة قال: نزلت على إبراهيم ومعه كيس فيه حصى أو نوى فيسبح به حتى ينفد"[2]، وأخرج عن زاذان قال: أخذت من أم يعفور تسابيح لها فلما أتيت علياً قال: أردد على أم يعفور تسابيحها "[3]. ثم رأيت كتاب (تحفة العباد) ومصنف متأخر عاصر الجلال البلقيني فصلاً حسناً في السبحة قال فيه ما نصه: قال بعض العلماء: عقد التسبيح بالأنامل أفضل من السبحة لحديث ابن عمرو، لكن يقال إن المسبح إن آمن من الغلط كان عقده بالأنامل أفضل، وإلا فالسبحة أولى. وقد اتخذ السبحة سادات يشار إليهم ويؤخذ عنهم ويعتمد عليهم كأبي هريرة (رضي الله عنه) كان له خيط فيه ألفا عقدة، فكان لا ينام حتى يسبح به ثنتي عشرة ألف تسبيحة، قاله عكرمة[4]، وفي سنن أبي داود من حديث أبي نضرة الغفاري قال: حدثني

---

١. أخرجه الديلمى عن علي(رضي الله عنه): (٤/٢٥٩، رقم ٦٧٦٥). وينظر: فيض القدير شرح الجامع الصغير للمناوي (٤/٣٥٥) و كنز العمال للمتقي الهندي: (٧/٨٨٥)برقم(٢٠١٠٩).

٢. قال ابن أبي شيبة في المصنف: حدثنا بن علية عن الجريري عن أبي نضرة عن رجل من الظفار قال نزلت على أبي هريرة ومعه كيس فيه حصى أو نوى فيقول سبحان الله سبحان الله حتى إذا نفد ما في الكيس ألقاه إلى جارية سوداء فجمعته ثم دفعته إليه». مصنف ابن أبي شيبة بتحقيق: كمال يوسف الحوت (٢/١٦١)برقم(٧٦٦١).

٣. مصنف ابن أبي شيبة (٢ / ١٦١)برقم(٧٦٦٢).

٤. قال الحافظ ابن أبي شيبة: « حدثنا أبو بكر قال حدثنا إسماعيل بن إبراهيم عن خالد عن عكرمة عن أبي هريرة قال إني لأسبح كل يوم اثنتي عشرة مرة ألف تسبيحة قدر ديتي وقدر ديته». مصنف ابن أبي شيبة (٥/٣٤٥)برقم(٢٦٧٣٣).

شيخ من طفاوة قال: تَثَوَّيْتُ أبا هريرة بالمدينة فلم أر رجلاً أشد تشميراً ولا أقوم على ضيف منه قال: فبينما أنا عنده يوماً وهو على سرير له ومعه كيس فيه حصى أو نوى وأسفل منه جارية سوداء وهو يسبح بها حتى إذا أنفد ما في الكيس ألقاه إليها فأعادته في الكيس فدفعته إليه يسبح"[1].
قوله (تثويت) أي تَضَيَّفْتُهُ ونزلت في منزله، والمثوى المنزل وقيل: كان أبو هريرة (رضي الله عنه) يسبح بالنوى المجزع يعني الذي حك بعضه حتى ابيض شيء منه وترك الباقي على لونه وكل ما فيه سواد وبياض فهو مجزع قاله أهل اللغة: وذكر الحافظ عبد الغني في الكمال في ترجمة أبي الدرداء عويمر (رضي الله عنه) أنه كان يسبح في اليوم مائه ألف تسبيحة[2]، وذكر أيضاً عن سلمة بن شبيب قال: كان خالد بن معدان يسبح في اليوم أربعين ألف تسبيحة سوى ما يقرأ فلما وضع ليغسل جعل بأصبعه كذا يحركها يعني بالتسبيح"[3] ومن المعلوم المحقق أن المائة ألف بل والأربعين ألفاً وأقل من ذلك لا يحصر بالأنامل فقد صح بذلك وثبت أنهما كانا يعدان بآلة، والله أعلم. وكان لأبي مسلم الخولاني رحمة الله عليه سبحة فقام ليلة والسبحة في يده قال: فاستدارت السبحة فالتفت على ذراعه وجعلت تسبح فالتفت أبو مسلم والسبحة تدور في ذراعه، وهي تقول: سبحانك يا منبت النبات، ويا دائم الثبات، قال: هلمي يا أم مسلم فانظري إلى أعجب الأعاجيب قال: فجاءت أم مسلم والسبحة تدور وتسبح فلما جلست سكتت". ذكره أبو القاسم هبة الله بن الحسن الطبري في كتاب (كرامات الأولياء). وقال الشيخ الإمام العارف عمر البزار: كانت سبحة الشيخ أبي

---

١. سنن أبي داود بتحقيق: محمد محيي الدين عبد الحميد (٦٥٩/١)برقم(٢١٧٤).
٢. ورواه الترمذي في سننه بتحقيق: أحمد محمد شاكر وآخرون (٤٨٠/٥)برقم(٣٤١٥).
٣. ورواه أبو نعيم في حلية الأولياء (٢١٠/٥).

الوفا كاكيش وبالعربي عبد الرحمن التي أعطاها لسيدي الشيخ محيي الدين عبد القادر الكيلاني (قدس الله أرواحهم) إذا وضعها على الأرض تدور وحدها حبة حبة". وذكر القاضي أبو العباس أحمد بن خلكان في (وفيات الأعيان) أنه رؤي في يد أبي القاسم الجنيد بن محمد رحمه الله يوماً سبحة فقيل له: أنت مع شرفك تأخذ بيدك سبحة ؟ قال: طريق وصلت به إلى ربي لا أفارقه"[1]، قال: وقد رويت في ذلك حديثاً مسلسلاً وهو ما أخبرني به شيخنا الإمام أبو عبد الله محمد بن أبي بكر بن عبد الله من لفظه ورأيت في يده سبحة قال: أنا الإمام أبو العباس أحمد بن أبي المحاسن يوسف بن البانياسي بقراءتي عليه ورأيت في يده سبحة قال: أنا أبو المظفر يوسف بن محمد بن مسعود الترمذي ورأيت في يده سبحة. قال: قرأت على شيخنا أبي الثناء ورأيت في يده سبحة قال: أنا عبد الصمد بن أحمد ابن عبد القادر ورأيت في يده سبحة قال: أنا أبو محمد يوسف بن أبي الفرج عبد الرحمن بن علي ورأيت في يده سبحة قال: أنا أبي ورأيت في يده سبحة قال: قرأت على أبي الفضل بن ناصر ورأيت في يده سبحة قال: قرأت على أبي محمد عبد الله بن أحمد السمرقندي ورأيت في يده سبحة قلت له: سمعت أبا بكر محمد بن علي السلمي الحداد ورأيت في يده سبحة ؟ فقال: نعم قال: رأيت أبا نصر عبد الوهاب بن عبد الله بن عمر المقري ورأيت في يده سبحة قال: رأيت أبا الحسن علي بن الحسن بن أبي القاسم المترفق الصوفي وفي يده سبحة قال: سمعت أبا الحسن المالكي يقول: وقد رأيت في يده سبحة فقلت له: يا أستاذ وأنت إلى الآن مع السبحة ؟ فقال: كذلك رأيت أستاذي الجنيد وفي يده سبحة فقلت له: يا أستاذ وأنت إلى الآن مع السبحة؟ قال: كذلك

---

١. وفيات الأعيان للقاضي ابن خلكان بتحقيق: إحسان عباس: (١ / ٣٧٣).

رأيت أستاذي سري بن مغلس السقطي وفي يده سبحة فقلت: يا أستاذ أنت مع السبحة ؟ فقال: كذلك رأيت أستاذي معروف الكرخي وفي يده سبحة فسألته عما سألني عنه فقال: كذلك رأيت بشر الحافي وفي يده سبحة فسألته عما سألتني عنه فقال كذلك رأيت أستاذي عمر المالكي وفي يده سبحة فسألته عما سألتني عنه فقال: كذلك رأيت أستاذي الحسن البصري وفي يده سبحة فقلت: يا أستاذ مع عظم شأنك وحسن عبادتك وأنت إلى الآن مع السبحة؟ فقال لي: شيء كنا استعملناه في البدايات ما كنا نتركه في النهايات، أحب أن أذكر الله بقلبي وفي يدي ولساني"[1]، فلو لم يكن في اتخاذ السبحة غير موافقة هؤلاء السادة والدخول في سلكهم والتماس بركتهم لصارت بهذا الاعتبار (من أهم الأمور) وآكدها فكيف بها وهي مذكرة بالله تعالى، لأن الإنسان قل أن يراها إلا ويذكر الله، وهذا من أعظم فوائدها وبذلك كان يسميها بعض السلف رحمه الله تعالى. ومن فوائدها أيضاً الاستعانة على دوام الذكر، كلما رآها ذكر أنها آلة للذكر فقاده ذلك إلى الذكر، فيا حبذا سبب موصل إلى دوام ذكر الله عز وجل، وكان بعضهم يسميها (حبل الوصل)، وبعضهم (رابطة القلوب). وقد أخبرني من أثق بقوله: أنه كان مع

---

١. قال أبو جعفر أحمد بن علي البلوي المتوفى ٩٣٨هـ بعد أن ذكر سند السبحة عن طريقه: «قال الشيخ أبو العباس أحمد بن أبي بكر الرداد يتبين من قول الحسن البصري أن السبحة كانت موجودة متخذة في عهد الصحابة رضوان الله عليهم لقوله هذا شيء كنا استعملناه في البدايات وبداية الحسن من غير شك كانت مع أصحاب رسول الله (ﷺ) فإنه ولد لسنتين بقيتا من خلافة عمر بن الخطاب رضي الله عنه ورأى عثمان وعليا وطلحة رضي الله تعلى عنهم وحضر يوم الدار في قصة عثمان وعمره أربع عشرة سنة وروى عن عثمان وعلي وعمران بن حصين ومعقل بن يسار وأبي بكر وأبي موسى وابن عباس وجابر بن عبد الله وخلق كثير من الصحابة رضي الله عنهم.. ». ينظر: ثبت أبي جعفر، لأبي جعفر أحمد بن علي البلوي الوادي آشي المتوفى ٩٣٨هـ، بتحقيق عبد الله العمراني: (ص ٣٨٦).

قافلة في درب بيت المقدس فقام عليهم سرية عرب وجردوا القافلة جميعهم وجردوني معهم فلما أخذوا عمامتي سقطت مسبحة من رأسي فلما رأوها قالوا: هذا صاحب سبحة فردوا علي ما كان أخذ لي وانصرفت سالماً منهم. فانظر يا أخي إلى هذه الآلة المباركة الزاهرة وما جمع فيها من خيري الدنيا والآخرة، ولم ينقل عن أحد من السلف ولا من الخلف المنع من جواز عد الذكر بالسبحة بل كان أكثرهم يعدونه بها ولا يرون ذلك مكروهاً، وقد رؤي بعضهم يعد تسبيحاً فقيل له: أتعد على الله ؟ فقال: لا ولكن أعد له، والمقصود أن أكثر الذكر المعدود الذي جاءت به السنة الشريفة لا ينحصر بالأنامل غالباً ولو أمكن حصره لكان الاشتغال بذلك يذهب الخشوع. وهو المراد والله أعلم. وأخرج ابن عساكر في تاريخه عن بكر بن خنيس عن رجل سماه قال: كان في يد أبي مسلم الخولاني سبحة يسبح بها، قال: فقام والسبحة في يده فاستدارت السبحة فالتفت على ذراعه وجعلت تسبح فالتفت أبو مسلم والسبحة تدور في ذراعه وهي تقول: سبحانك يا منبت النبات ويا دائم الثبات فقال: هلم يا أم مسلم وانظري إلى أعجب الأعاجيب فجاءت أم مسلم والسبحة تدور تسبح فلما جلست سكنت [1]. وقال عماد الدين المناوي في سبحة:

ومنظومة الشمل يخلو بها * اللبيب فتجمع من همته
إذا ذُكِر اللهُ جَلَّ اسمُهُ * عليها تفرَّق مِنْ هيبته [2]

---

١. تاريخ مدينة دمشق وذكر فضلها وتسمية من حلها من الأماثل، للحافظ أبي القاسم علي بن الحسن بن هبة الله بن عبد الله الشافعي المتوفى ٥٧١هـ، بتحقيق محب الدين أبي سعيد عمر بن غرامة العمري: (٢١٧/٢٧).

٢. الحاوي للفتاوي للحافظ السيوطي بتحقيق: عبد اللطيف حسن عبد الرحمن: (٢ /٥ـ ٦).

## ( هەژدە هەم )

## داهێنانی سەرو ژێر ونوختەو ژمارەو نیشانەکان بۆ قورئانی پیرۆز لە لایەن زانایانی ئیسلامەوە

پرۆژەی دانانی سەرو ژێر ونوختەو نیشانەکان بۆ قورئانی پیرۆز لە پاش چەرخی خەلافەتی راشیدین، واتە لە چەرخی ئەمەویەکاندا لە لایەن زانایانی ئیسلامەوە [1].

ئیمام (بدر الدين الزركشي) لەم بارەوە ئەفەرموێت: «أسند الزبيدي فی كتاب الطبقات عن المبرِّد: أول من نقّط المصحف (أبو الأسود الدؤلي)، وذكر أيضا أن ابن سيرين كان له مصحف نقّطه له (يحيى بن يعمر)، وذكر (أبو الفرج) أن (زياد بن أبی سفيان) أمر (أبا الأسود) أن يُنَقِّطَ المصاحفَ، وذكر (الجاحظ) فی (كتاب الأمصار): أن (نصر بن عاصم) أوَّل من نقَّط المصاحفَ، وكان يقال له: (نصر الحروف)، وأما وضع (الأعشار) فقيل: إن (المأمون العباسيّ) أمر بذلك، وقيل: إن (الحجاج) فعل ذلك..» [2].

واتە: « ئیمامی (سیندی) لە (تەباقتیدا) بە سەندی خۆی دەیگێڕێتەوە لە (ئەبولعەبباسی موبەڕریدەوە) کە گوتویەتی: یەکەم کەس تونختەکانی بۆ قورئان دانا (ئەبولئەسوەدی دوئەلی) بوو، هەروەها دەیگێڕێتەوە کە (موحەممەدی کوڕی سیرین) قورئانێکی هەبوو (یەحیای

١. بۆ زیاتر شارەزایی لەو داهێنراوە چاکانەی بە مەبەستی جوانکردن و زێدەتێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز و ناسینەوەی پیتەکانی زانایان دایان هێناوە بگەڕێرەوە بۆ: (إحياء علوم الدين لحجة الإسلام: (١/ ٢٧٦-٢٧٧)، الجامع الأحكام القرآن للقرطبي: (١ /٦٣-٦٥)، رسم المصحف، د. غانم قدوري: (ص: ٤٦٥ ـ ٤٨٦).

٢. البرهان في علوم القرآن للزركشي: (١ / ٢٥٠ـ٢٥١).

کوڕی یەعمور) نوختەکانی لە سەر دانابوو، هەروەها (أبو الفرج) باسی کردووە کە: (زیاد بن أبی سفیان) فەرمانی داوە کە (ئەبولئەسوەدی دوئەلی) هەستێت بە پرۆژەی نوختەکردن بۆ قورئانی پیرۆز، هەروەها (أبو عمرو عثمان الجاحظ) لە کتێبیی (الأمصار)یدا باسی کردووە کە (نصر بن عاصم) یەکەم کەس بووە کە نوختەکانی بۆ قورئان زیادکردووە، بۆیە پێی دەگوترا: (نصر الحروف)، بەڵام داهێنانی ئەعشارەکانی قورئان دەگوترێت: کە خەلیفەی عەبباسی (مەئموون) فرمانی پێ داوە، دەشگوترێت: (حجاج الثقفي) فەرمانی پێداوە ».

ئیمام (جلال الدين السيوطي)یش لەم بارەوە دەفەرموێت: «كان الشّكل في الصدر الأول نقطاً، فالفتحة نقطةٌ على أوّل الحرف، والضمة على آخره، والكسرة تحت أوله، وعليه مشى (الدّاني)، والذي اشتهر الآن الضبط بالحركات المأخوذة من الحروف، وهو الذي أخرجه (الخليل)، وهو أكثر وأوضح، وعليه العمل.. »[1] واتە: شکڵ و روخساری سەر پیتەکانی قورئانی پیرۆز لە چەرخی یەکەمدا تەنها بە نوختە دیاری دەکرا، لە بری سەر (فەتحە) نوختەیەکیان دادەنا لە سەر یەکەم پیت، لە بری بۆر (زەممە)ش نوختەیەکیان لە سەر کۆتایی پیتەکە دادەنا، لە بری ژێر (کەسرە)ش نوختەیەکیان دادەنا لە ژێر یەکەم پیتدا، وە لە سەر ئەم دامەزراوەو بەم پێیە (ئەبوو عەمری دانی) دەرۆشت، بەڵام ئەوەی کە ئێستا بەربڵاو و مەشهوورە بریتییە لە جێگیرکردن و ناساندنی پیتەکان بە سەرو بۆرو ژێر، کە ئەمەش دامەزراوەو داهێنراوی (خەلیلی فەراهیدی) یە،

---

١. الإتقان في علوم القرآن للسيوطي: (٤ / ١٨٦).

که بێگومان زۆرتر بەکار دەهێنرێت و ئاشکراترە، وە بە تەواوی ئێستا کار لە سەر ئەم داهێنراوەیە».

که بێگومان وەك ئیمامی نەوەوی ئەفەرموێت: « إتفق العلماء على استحباب كتابة المصاحف، وتحسين كتابتها وتبينها وايضاحها، وتحقيق الخط دون مشقة وتعليقة، قال العلماء: ويستحب نقط المصحف وشكله، فانه صيانة من اللحن فيه، وتصحيفه، وأما كراهة (الشعبي و النخعي) النقط، فانما كرهاه في ذلك الزمان، خوفاً من التغيير فيه، وقد أمن ذلك اليوم، فلا منع، ولا يمتنع من ذلك لكونه محدثاً، فإًنه من المحدثات الحسنة، فلم يمنع منه، كنظائره مثل: تصنيف العلم، وبناء المدارس والرباطات وغير ذلك، والله أعلم »[1].

واتە: « زانایان کۆو یەك دەنگن لە سەر چاکی نوسینەوەی قورئانی پیرۆز بە جوانی و روون و ئاشکرا و بەرجەستەبوونی خەتی قورئان بە بێ زەحمەت و کەم وکوڕی و هەڵپەستراوی، هەروەها زانایان فەرمویانە: کارێکی موستەحەبب و باشە دانانی سەرو بۆر و ژێر و نوختە بۆ قورئان بەو شکڵەی کە دامەزراوە، چونکە بێگومان مەبەست لەو کارە پارێزگاری کردنی قورئانە لە خوێندنەوەی نا دروست و جێگۆڕکێ کردنی پیتەکانی، بەڵام زانایان: (الشعبي و النخعي) کە بە باشیان نەزانیوە، مەبەستیان تەنها لەو سەردەمەی خۆیاندا بووە، کە ترساون گۆڕانکاری بەهۆیەوە بەسەر قورئاندا بێت، ئێستا ئەو ترسە نەماوە، کەواتە هیچ بەربەستێکی شەرعیی نەماوە لە بەئەنجامگەیاندنی ئەو کارەدا، وە ناشبێت قەدەغەبکرێت لەو روانگەوە کە ئەو کارە کارێکی داهێنراوە، چونکە لە

١. التبيان في آداب حملة القرآن لشيخ الإسلام أبي زكريا محيي الدين النووي: (ص ١١٠).

داهێنـراوه چـاكه‌كانه، نمونـه‌ی تریشـی زۆره له‌وانـه: داهێنـراوی دانـانی په‌رتووك له زانسته‌كاندا و درووستكردنی قوتابخانـه و ریبـات وخانـه‌قاكان وجگه له‌مانه‌ش.. (والله أعلم) ».

هه‌روه‌ها ئه‌و حه‌قیقه‌ته‌ش زانای حه‌نه‌فی (العلامة ابـن عابـدين) باسـی كردووه كه له داهێنـراوه چـاكه‌كانه، ئه‌مـه‌ش لـه شـه‌رحی (در المختـار)دا فه‌رمويه‌تی: « (و) جاز (تحلية المصحف) لما فيه من تعظيمه كما في نقش المسـجد، (وتعشـيره ونقطـه) أي إظهـار إعرابـه، بـه يحصـل الرفـق جـدا خصوصا للعجم فيستحسن وعلى هذا لا بأس بكتابة أسامي السور وعد الآي وعلامات الوقف ونحوها فهي بدعة حسنة، درر وقنية»[1].

هه‌روه‌ها له (الفتاوى الهندية)شدا كه له كۆكراوه‌ی زانايـانی پايـه‌داری حه‌نه‌فيه‌كانی وولاتی (هيندستان)ه پێشی دابه‌شبوونی به‌تايبـه‌ت (العلامـة الشيخ نظام الدين الحنفي) هاتووه كه ئه‌مه ده‌قه‌كه‌يه‌تی: « لا بأس بكتابة أسامي السور وعدد الآي، وهو وإن كان إحداثاً، فهو بدعة حسـنةٌ، وكـم مـن شيء كان إحداثاً وهو بدعة حسنةٌ، وكم من شيء يختلـف بـاختلاف الزمـان والمكان..» [2].

١. حاشية على الدر المختار شرح تنوير الأبصار في فقه مذهب الامام أبي حنيفة النعمـان، لخاتمـة المحققين محمد أمين ابن عابدين، مع تكملة ابن عابدين لنجل المؤلف(٦/٧٠٤ـ ٧٠٥).

٢. الفتاوى الهندية في مذهب الإمام الأعظـم أبـي حنيفـة النعمان(رضـي الله عنـه). للعلامـة الشـيخ نظام وجماعة من علماء الهند (٥/٣٢٣).

## ( نۆزده هەم )

## داهێنانی پرۆژەی نوسینەوەی سوننەتی پێغەمبەر( ﷺ ) بە فەرمانی حەزرەتی ( عمر بن عبد العزيز ) ( رضي الله عنه ).

پرۆژەی نوسینەوەی فەرموودەکانی حەزرەت (ﷺ) لە پاش وەفاتی (تدوين السنة) بە تایبەتی لە نیوەی یەکەمی چەرخی دووەمی کۆچی دا[1]، ئەوەبوو حەزرەتی عومەری کوڕی عبد العزيز (رضي الله عنـه) فـەرمانی دا بـە سـەر(ئـەبو بـەکر ئـیبن و حـەزم)دا بـۆ ئـەو مەبەسـتە[2]. وەك ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەیدا فەرموویەتی: « وكتـب عمـر بـن عبـد العزيـز إلى أبي بكر بن حزم انظر مـا كـان مـن حـديث رسـول الله (ﷺ) فاكتبـه فـإني خفنت دروس العلم وذهاب العلماء ولا تقبل إلا حديث النبي (ﷺ) ولتفشـوا العلم ولتجلسوا حتى يعلم من لا يعلم فإن العلم لا يهلك حتى يكون سرًّا» [3].

## ( بیستەم )

## دامەزراندنی ئەنجام دانی زیاتر لە جومعەیەك ( تعدد الجمعة ) لە یەك شاردا بە پێی پێویست لەدوای چەرخی عەبباسیەکان

هـــەروەها لـــە نمونـــەی بیدعـــەتی پێویســـت و زەرورەتـــە و لـــە عیباداتیشدایە: زیـادکردنی(تعـدُّد الجمعـة) واتـە: (فـرە جومعـەیی)، واتـە: (ئەنجامدانی زیاتر لە جومعەیەك لە یەك شاردا) کە ئاشکرایە دوای چەرخی ئەمەویەکان و لە زەمانی عەبباسیەکاندا ئەم کارە فەتوای بۆ درا بە چـەند

---

١. (شرح النووى على صحيح مسلم: (١/ ٢٤٥). و علوم الحديث: د. عبدالكريم زيدان: (ص١٠٥).

٢. بنوارە: (تدريب الراوي في شـرح تقريـب النـواوي: (١/٤ـ٥)، وتـاريخ التشـريع الإسـلامي: (ص ١٣١). و علوم الحديث: (ص١٠٥).

٣. صحيح البخاري، كتاب العلم، باب(كيف يقبض العلم) (١/٤٩)برقم(٣٤).

مەرج و دارِشتەیەکی شەرعی، ئەگەر نا لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) و خولەفای راشیدین و ئەمەویەکانیشدا لە هەر شارێك تەنها یەك جومعە ئەنجام دەدراوە و بەس وە مەبدەئی (وحدةُ الجمع)یان پەیڕەوە کردووە، کەواتە فرە جومعەیی بیدعەتە، بەڵام بیدعەتێکی حەسەنەیە بە پێی پێویست و بە شەرتەکانی خۆی کە زانایانی فیقهی ئیسلامی بە درێژی باسیان کردووە، لە بەر گرنگی ئەو بابەتە بەندەش لەو رووەوە توێژینەوەیەکی بەسوودمان بڵاوکردووەتەوە[1]، شایەنی باسە وەهابیەکانیش لە بەر بەرژەوەندی خۆیان داهێنراوی فرە جومعەییان پێ دروستە کە بیدعەیەکی ئاشکرایە بە تایبەت ئەگەر مەرج و دارِشتە شەرعییەکان نەیگرێتەوە وەك زۆرێك لە مزگەوتەکانی ئەمڕۆی جیهانی ئیسلامی.

## ( بیست و یەك )

## داهێنانی بیدعەتی ساڵنامەی هیجری و تەقویمی رۆژانە بۆ زانینی کاتەکانی بانگ و نوێژ و رۆژوو حەج و عومرە و..هتد

ئاشکرایە داهێنان و دامەزراندنی ساڵی هیجری لە سەر دەستی حەزرەتی عومەردا(رضي الله عنه) کە لە مانگی رەبیعی یەکەم دەستی پێکردووە و لە رۆژی هیجرەتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆ مەدینە یاداشتکراوە، وەك پێشەوا (ابن سعد الزهري) لە (الطبقات الكبرى)یدا

---

[1]. بۆ درێژەی ئەو بابەتەو زانینی مێژووی دامەزرانی داهێنراوی فرە جومعەیی و رای زانایانی ئیسلام لە سەری: توێژینەوەی: (تعدُّد الجُمُعة بين النُّفاة والمُثبتين، عاصمة إقليم كوردستان (أربيل) نموذجاً). (للمؤلف): د. حسن خالد مصطفى محمود المفتي، كە بڵاوكراوەتەوە لە گۆڤاری ئەكادیمی زانكۆی صلاح الدين، ژمارە (٤٨) ساڵی: ٢٠١١م، لاپەرە (١١١ ـ ١٦٥).

دەیگێڕتـەوە و دەفـەرموێت: « وهـو (عمـر رضـي الله عنـه) أوّل مـن كتـب التأريخ في شهر ربيع الأول سنة ست عشرة، فكتبه من هجرة الـنبي، (ﷺ)، من مكة إلى المدينة» [1]. پاشان دامەزراندنی تەقویمی سـاڵانەو ڕۆژانـە، بـۆ زانینی کاتەکانی بانگدان و نوێژکردن و ڕۆژوو گرتن و ڕۆژوو شکاندن وحەج وعمرەکردن وزۆرشتی تریش لـە عیبـادات و موعامەلاتـەوە کـە ڕاسـتەوخۆ پەیوەستن بەو ڕۆژمێرو تەقویمانەوە، ئەمەش لە بیدعەتـە پێویسـتەکانە و تـەواوی موسـڵمانان لـە سـەری دەڕۆن، لـە کاتێکـدا لـە سـەردەمەکانی پێشـوودا بـۆ زانینـی کاتـەکان ڕێگـە تەقلیدیـەکان دەگیرانـە بـەر، وەك سـەیرکردنی ئاسـۆی گازنـدەی ڕاسـتگو (الفجـر الصـادق) بـۆ ڕۆژوگـرتن و پەنابردن بۆ سێبەری شتەکان بۆ زانینی کاتی نوێژەکان..هتد.

## ( بیست و دوو )
## داهێنراوی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز لە نێو دوو بەرگدا و لە ناو مزگەوتەکاندا لە سەردەمی تابیعیەکاندا ( رضي الله عنهم )

لە جۆری بیدعەتی حەسەنەیە خوێندنەوەی قورئان لە نێو دوو بەرگدا و لە ناو مزگەوتەکاندا، کە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) شتی بەو جۆرە نـەبووە، بۆیـە ئیمـامی مالیـك وەختێـك پرسـیایان لـیٚ کـرد دەربـارەی فەرمووی ئەمە عیبادەتێکی داهێنراوە لە کۆندا نەبوە، ئاخیری ئەم زەمانە باشتر ناهێنێت لە ئەووەڵەکەی، بەڵام خوێندنەوەی قورئان شتێکی باشـە،

---

١. الطبقات الكبرى للحافظ ابن سعد البصري الزهري: (٣ / ٢٨١).

« لم يكن بالأمر القديم، وإنما هو شيء أُحدث، ولم يأتِ آخر هذه الأمة بأهدى مما كان عليه أوَّلها، والقرآن حسنٌ » [1].

هەرچەندە لە سەر زاهیری ئەم دەقە، هەندێك لە مالیكیەكان خوێندنەوەی قورئانیان لە مزگەوتدا بەلاوە باش نەبووە، بەڵكو فەتوایان داوە كە هەركەس بۆ خوێندنەوەی قورئان بە كۆمەڵ دابنیشێت پێویستە هەڵبسەنرێت، گوتویانە یەكەم كەس كە ئەو كارەی داهێناوە (الحجاج بن یوسف الثقفي) بووە، بەڵام پاشان زانایان رەددی ئەو جۆرە بۆچونەیان داوەتەوە، بە وەی كە عمومی بەڵگەكان دەیگرێتەوەو داهێنروێكی باشە، ئەمەش پاشان بووە كارێكی گشتی لە تەواوی مزگەوتەكانی جیهانی ئیسلامیدا بە هەردوو حەرەمی شەریفیشەوە، پێشەوا (أبو عبد الله محمد بن عبد الرحمن المغربی المالكی) دەیگێڕێتەوە لە (مواهب الجلیل لشرح مختصر خلیل) و دەفەرموێت: « وأما القراءة في المصحف في المسجد، فنقل الشيخ أبو محمد ابن أبي زيد في كتاب (الجامع من مختصر المدونة) عن مالك أنه قال: لم تكن القراءة في المسجد في المصحف أمر الناس القديم، وأوّل من أحدثه الحجَّاجُ، وأكره أن يقرأ في المصحف في المسجد، انتهى من ترجمة الدعاء وذكر الله وقراءة القرآن، ونقل ذلك عنه صاحب المدخل بعد فصل السماع في القراءة بالألحان ونقل بعضه في فضل الإمام ووضع الكراسي في المسجد، ونقل ذلك الشيخ يوسف ابن عمر، وقال ابن ناجي: ينبغي أن تنزه المساجد من كذا وكذا وعن القراءة في المصحف» پاشان دەفەرموێت: « قال الزركشي من الشافعية في (إعلام الساجد بأحكام المساجد) في المسائل المتعلقة بالمساجد: الخامس والسبعون: قال مالك: لم

---

١. لەمەو پێش روونمان كردووەتەوە، بنوارە: الاعتصام للشاطبي: (٢ / ٣٠).

تكن القراءة في المصحف بالمسجد من أمر الناس القديم وأول من أحدثه الحجاج، وقال: أكره أن يقرأ في المصحف بالمسجد، وأرى أن يقاموا من المساجد إذا اجتمعوا للقراءة يوم الخميس، قال الزركشي: قلتُ: وهذا استحسان لا دليل عليه، والذي عليه الخلف والسلف استحباب ذلك، لما فيه من تعميرها بالذكر، وفي الصَّحيح في قصة الذي بال في المسجد: إنما بنيت المساجد لذكر الله والصلاة وقراءة القرآن، وقال تعالى: (ويذكر فيها اسمه) وهذا عام في المصاحف وغيرها. انتهى [1]»).

پاشان کەمێك لە دەمارگیری مەزهەبی دەیگرێت و دەفەرموێت: «قلتُ: أما نقله عن السلف استحباب ذلك فمعارَضٌ بنقل مالك أنه لم يكن من أمر الناس القديم ومالك أعلم بما كان عليه السلف »، واتە: نەقڵکردنی ئیمامی زەرکەشی لە سەلەفەوە کە قورئانیان خوێندبێت لە مزگەوتدا یەکناگرێتەوە لە تەك ووتەکەی ئیمامی مالیك کە فەرمویەتی خەڵکی لە کۆندا نەیانکردووە، ئیمامی مالیکیش شارەزاترە بە قەولی سەلەف»[2] بەڵی ووتەکەی ئیمامی زەرکەشی واقیعیتر ودروستترە، کە فەرمویەتی سەلەف مەبەستی چەرخی دوای صەحابەیە لە تابیعین و أتباعی تابعین، کە بێگومان ئەو دوو چینەش بە تێکڕای رای زانایان لە سەلەفی صاڵح ن. پاشان خۆ ئێستا فەتوای هەرچوار مەزهەب لە سەر دروستی ئەو کارە داهێنراوەیە، لە مەغریبی ئیسلامی تا مەشریقی ئیسلامی وەك روونە لای هەموان، لە کاتێکدا بێگومانین لەوەی کە ئیمامی مالیك و پێشەوایانی تری مالیکەیەکان کە بە باشیان نەزانیوە مەبستیان زیادە رۆچوون بووە

١. بنوارە: إعلام الساجد بأحكام المساجد: بتحقيق أبو الوفا المراغي: (ص ٣٦٩).
٢. مواهب الجليل لشرح مختصر الخليل في الفقه المالكي: لأبي عبد الله المغربي: (٢/ ٧٣).

لــه پارێزگــاریکردن لــه ئــایین، واتــه نییەتەکــەیان جـوان و پاکــه بــا نەشیانپێکابێت. رەحمەتی خوا له هەر هەموویان.

## ( بیست و سێ )

## داهێنــان و زیــادکردنی دەســتەواژەی جـۆراو جـۆر لـه نــزای ( القنــوت )ی نێـو نوێژەکاندا

بەکارهێنانی چەندین دەستەواژە له کاتی خویندنەوەی نزای قونووتدا لـه نویـژدا، چ لـه نوێـژی بەیانیانـدا، چ لـه پـاش نیـوەی دووەمـی مـانگی رەمەزاندا، چ له کـاتی هاتنـەخوارەوەی بـەڵاو موسـیبەتدا ـ خـوا پـەنامان بـدات ـ وەك مەشـهورە چـەندین لـەفزی هـاتووە هەنـدێکیان سـوننەتی پێغەمبـەرەو(ﷺ) هەندێکیشـیان لـه حـەزرەتی عومـەرەوە نـەقڵ کـراوە وئیمامی (البیهقي) تەصحیحی کردووە، بەڵام زانایانی ئیسلام نەیانکردووە به کێشە، بەڵکو فەرمویانە دۆعـای (القنـوت) بـه هـەموو لـەفزێك دەکرێـت ئەگـەر چـی لـەفزی سـوننەتیش باشـترە، پاشـان قونەوتەکـەی حـەزرەتی عومەر(رضي الله عنه)، ئەگـەر هـەردوو لـەفزەکانیش کۆکرانـەوە باشـترە، ئەگەر نا به هەموو لەفزێکی داهێنراویش جائیزە وەك ئیمامی (النووي) لـه (المجموع)دا دەفەرموێت: « الصحيحُ المشهورُ الذى قطع به الجمهورُ أنَّـهُ لا تتعيَّنُ بلْ يحصلُ بكلِّ دُعاءٍ ». پاشـان دەفـەرموێت ئـەو دۆعایـه (مـأثور) بێت یان نا هەر دروستە[1].

---

١. المجموع شرح المهذّب لشيخ الإسلام النووي: (٣ / ٤٩٧).

## ( بیست و چوار )

## پرۆژەی داهێنانی نوسینەوەی مەزهەبە فیقهیی و قەواعیدە شەرعییەکان لە لایەن زانایانی ئیسلامەوە

هەروەها پرۆژەی نوسینەوەو داهێنانی مەزهەبە فیقهیی وئوصولّیەکان ودامەزراندنی یاساگشتیی و بنەماکانیان بۆ هەر چوار مەزهەبەکەی ئیسلام (تدوين المذاهب الفقهية والقواعد الفقهية والأصولية) ئەمەش بیدعەت بوو بەلاّم بیدعەتێکی زۆر پێویست بەمەبەستی شارەزابوونی موسلّمانان لە شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام.

## ( بیست و پێنج )

## دروستکردنی ( القبة الخضراء ) لە سەر ئارامگای پیرۆزی حەزرەتی رسول الله ( ﷺ ) و دوو خەلیفەی ئیسلام و دروستکردنی منارە لە بۆ مزگەوتەکان

دروستکردنی (گومبەزی سەوزی) (القبة الخضراء) سەر گۆڕی موبارەکی پێغەمبەر (ﷺ)دوو خەلیفەی ئیسلام حەزرەتی ئەبوو بەکرو حەزرەتی عومەی (رضي الله عنهما) لە سەردەمی مەملوکیەکاندا وەك زانراوە بە فەرمانی (السلطان المملوكي المنصور قلاوون الصالحي) باوکی (السلطان الملك الناصر محمد بن قلاوون) لە ساڵی ٦٧٨ کۆچی دا دروستکراوە، بێگومان تا ئەمرۆش بە کۆدەنگی زانایانی ئیسلام بە کارێکی

باش و داهێنراوێکـی چـاکیان دانـاوەو کەسـێکی بـە ئیعتیبـاریش ئینکـاری نەکردووە[1].

ئەو گومبەزە موبارەکەی کە موسـڵمانان بـە دیتنـی هـەر لـە دوورەوە عاشقی دەبن و صەڵاوات دەدەن لە گیانی پاکی خاوەنەکـەی(ﷺ)، بۆیـە شەیدایانی لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ لە عەشق و ئەوینیانەوە بۆ حەزرەت (ﷺ) خۆیـان دەکـەن بـە قوربـانی، بـە تایبـەت هۆنراوەبێـژ و شـاعیرانی کـورد. ئـەوەتانێ عەللامــەی عێـراق و شـافیعی زەمــان مــەرحومی مامۆســتای مودەرریس (مامۆستا مەلا عبد الکریمی بیارە) (نامی) (رەحمەتی خوای لە سەر بێت) لـە چـەکامەیەکیدا لـە سـەفەری حەجیـدا لـە رێگـەی مەدینـەی پیرۆزدا روو دەکاتە حەزرەت(ﷺ) و دەفەرموێت:

من میوانی تۆم من میوانی تۆم * میوانی خوانی خانەدانی تۆم

پاشان دەڵێت:

من بە قوربانی قوببەی سەوزی تۆ * عەشقی جەماڵی زۆر جووانی تۆم

بە هیوا ی قەبوول، ئەپاڕێمەوە * داماوی سایەی شا سەیوانی تۆم[2].

شایەنی باسە دروستکردنی منارەی مزگەوتەکانی جیهانی ئیسـلامیش لە داهێنراوە چاکەکانن و تەواوی وڵاتانی ئیسلامیشی گرتووەتەوە وزیـاتر لە سـەردەمی عوسمانیەکانـدا برەویـان پـێ دراو بـۆ هـەردوو حەرەمـەینی

---

١. بنواڕە: (وفاء الوفاء بأخبار دار المصطفى (ﷺ) للإمام نور الدين علي بن عبد الله الحسيني السمهودي المتوفى ٩١١هـ)، بتحقيق محمد محي الدين عبد الحميد: (٦٠٩/٢). وفصول من تاريخ المدينة المنورة، للشيخ علي حافظ: (ص١٢٧، ١٢٨). وعمدة الأخبار في مدينة المختار (ﷺ) للشيخ أحمد بن عبد الحميد العباسي: (ص: ١٢٤). وتحقيق النصرة بتلخيص معالم دار الهجرة، للشيخ زين الدين أبي بكر المراغي، تحقيق محمد الأصمعي: ص ٨١).

٢. بنواڕە: حەج نامە، مامۆستا مەلا عبد الکریمی المدرّس (نامی): ل ١٨٦.

پیرۆزیش دروستکراون و ساڵانە لە برەودان و منارەی بەرزترو قەشەنگ تر و زۆرتر بۆ هەردوو حەرەمی پیرۆز دروست دەکرێت. کە جێگەی دەست خۆشییە و کەسیش بۆی نییە بڵێت چۆن شتێك دروست دەکەن بۆ مزگەوت کە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) وهاوەڵانیدا نەبووە؟!

## حیوارێك لەتەك وەهابییەکدا دەربارەی قوببەی سەوز

شایەنی باسە: لە گەشتی زیارەتی مەرقەدی پێغەمبەردا(ﷺ)[1] لە تەك برای بەڕێزم م. شێخ محمد أمێد شێخ ئەحمەد بەرزنجی ئێوارەیەك سەرنجی قوببەی پیرۆزماندا تەئکیید بووین لەوەی کە شتێکی نامۆی پێوەیە، لە پێینی سەر گومەزەکەدا، ئێمەش پێشتر کەمێك زانیاریمان هەبوو، ویستمان بزانین رای وەهابیەکان چییە لەو روانگەوە، چوینە بەر پەنجەرەی ژووری مامۆستایەکیان پاش تەعاروف لێم پرسی: ئەو شتە چییە بەو جێگا پیرۆزەوە؟ ئەویش پاش کەمێك دوان گوتی: منیش نازانم بچن بۆ لای بەرپرسی دەعوەو ئیرشاد با ئەو وەڵامتان بداتەوە.. واتە هەڵات لە وەڵامەکە، ئێمەش پێمان گووت: وا مەشهوورە کە کەسێکی بێ ئەدەب ویستویەتی کارێکی نا شایستە ئەنجام بدات بەرانبەر گومبەزی سەوز، خودا لەو کاتەوە کردوویەتی بە عیبرەت و بووتە بەرد پێیەوە، بۆ ئەوەی کەس زاتی ئەو جۆرە کارانە نەکات، ئیدی ئەو سەری راوەشاندو نەوتی وایەو نە وێراشی بڵێ وانییە! گوتمان ئەی بۆ لێی ناکەنەوەو کە گومبەزەکەی ناشیرین کردووە؟ گوتی: بڵێم چی، واتە ناتوانین، بۆمان

---

١. لە بەرواری ١٣ـ٤ـ ٢٠١٢ ز.

دەرکەوت کە کەس ناتوانێت ئەو کارە بکات ئەگەر نا وەك ئەو دەبێتە عیبرەت..

بەڵام برای بەڕێزمان م. شێخ محمدی عەبابەیلیٚ کە لە خزمەتیدا بووین لە شەوی هەینیدا پاش ئەوەی کە سوپاس بۆ خوا خەتمەی نەقشبەندیمان ئەنجامدا لە حەوشەی حەرەمی مزگەوتەکەدا لە بەرانبەر مەرقەدی پیرۆز لە تەك زۆرێك لە برایانی دڵ پڕ لە ئیمان و وەفاو ئەوین و خۆشەویستی[1] کەوتینە گفتوگۆ، مامۆستای عەبابەیلیٚ پێی وابوو ئەو شتەی بە سەر گومبەزەکەوەیە لە رووی قیبلەوە بریتییە لەو ئاسەوارەی کە وەختی خۆی لە سەر دەمی خەلافەتی حەزرەتی عومەردا (رەزای خوای ل سەر) بە ئەنجام گەیەندرابوو، وەختێك بێبارانییەکی زۆر هات بە سەر خەڵکی مەدینەدا ئەوانیش شکوایان بردە خزمەت حەزرەتی عائیشە (رەزای خوای لە سەر بێت) ئەویش فەرمانی دا و فەرمووی: لە سەر سەقفی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ) چەند کەلەبەرێکی تێبکرێت هەتا لە نێوان گۆڕی پیرۆزو ئاسماندا پەردەو سەقف نەمێنێت، پاشان بارانتان بۆ ئەبارێت، واتە تەوەسوولیان کرد بە گۆڕی پیرۆز، ئەوە بوو وەك لە ریوایەتی صەحیح دا هاتووە دەمەودەست خودا بارانی بۆ باراندن هەتا ئەو ساڵە ناو برا بە (عام الفتق) لە بەر قەڵەوبوونی زۆری مەڕوماڵات[2].

---

١. لەوانە جگە لەو دوو بەڕێزەی سەرەوە: م. مەلا عەلی دوجەیلە(توتمەری)، م. مەلا عەزیزی مامۆستای فەنایی، کاك سەروەر کاك خدری پێنجوێنی، کاك بەرهەمی حاجی رسول ی سلێمانی، کاك هەرێمی شێخ عەبدولی سلێمانی، کاك تەحسین شێخ صەباحی سیریٚ و کاك مەهدی حاجی مەجیدی حەڵوان و کاك عبد الجباری قامیشی، و چەند برایەکی تریش خوا بیانپارێزێت و یادیان هەمیشە بەخێر..

٢. کە ئەمەش دەقی فەرمودەکەیە: « عن أبي الجوزاء أوس بن عبد الله(رضي الله عنه) قال: قحط أهل المدينة قحطا شديداً، فشكوا إلى عائشة (رضي الله عنها) فقالت: انظروا قبر النبي

مامۆسـتای عەبابـەیلێیی فـەرموی: ئـەو کەلەبـەرە هـەر مابوویـەوە وەختێکیش کە گومبەزی بـە سـەرەوە کرا بـەو شـێوازە هێشـتیانەوە بـۆ پـیرۆزی و تکـاو یـادەوەری خـەڵکی مەدینـە، بـەڵێ ئـەو روداوەی شـاری مەدینە راستە، بەڵام ئایا ئەو شتەی بەسـەر گومبەزەکـەوە ماوەتـەوە کـە زۆر دیارو ئاشرایە ئاسەواری موقابیلی جێگەی سەقفی گۆڕی پیرۆزە، یـان کابرایەکـە بووتــە عیـبرەت وەك مەشـهورە، یـان شـتێکی تـرە؟.. ئێمـە نەگەشتینە حەقیقەت، هەرچەندە پێم وایە ئەو مامۆستایەی لێمـان پرسـی لە جەماعەتی دەعوەو ئیرشاد حەقیقەتەکەی دەزانی، بەڵام بەداخـەوە لـە بەر هەر هۆیەك بوو پێی نەگوتین!

---

(ﷺ) فاجعلوا منه كووا إلى السـماء حتـى لا يكـون بينـه وبـين السـماء سـقف، قـال: ففعلـوا، فمطرنا مطراً حتى نبت العشب، وسمنت الإبل، حتى تفتّقت مـن الشّـحم، فسـمي عـام الفتـق » رواه الحافظ الدارمي في سننه بسند صحيح: (٥٦/١)برقم(٩٢) قال المحقق حسين سـليم أسـد: رجاله ثقات، وهـو موقـوف علـى عائشة(رضـي الله عنهـا » وقـال الحـافظ مـلا علـي القـارئ: « والمعنى: اجعلوا من مقابلة قبره في سقف حجرتـه منافـذ متعـددة حتـى لا يكـون بينـه أي بـين قبره وبين السماء سقفٌ، أي حجاب ظـاهري، ففعلـوا فمطـروا.. وقـد قيـل في سـبب كشـف قـبر النبي(ﷺ): أن السماء لما رأت قبر النبي سال الوادي من بكائها، قال تعالى (فما بكـت علـيهم السماء والأرض) الدخان، حكاية عن حال الكفار، فيكون أمرها علـى خـلاف ذلـك، بالنسـبة إلى الأبرار، وقيل: إنه كان يستشفع به عند الجدب فتمطر السماء، فأمرت عائشة (رضـي الله عنهـا) بكشف قبره مبالغة في الاستشفاع به، فلا يبقى بينه وبين السماء حجـاب، أقـول: وكأنـه كنايـة عن عرض الغرض المطلوب بتوجهه إلى السماء، وهي قبلة الدعاء ومحل رزق الضعفاء كما قـال تعالى (وفي السماء رزقكم) الذاريات، رواه الـدارمي ». مرقـاة المفـاتيح شـرح مشـكاة المصـابيح للحافظ ملا علي القارئ: (١١ / ٩٥).

## ( بيست و شەش )

## داهێنانی زاراوەكانی زانستە نەقلی وعەقلی یەكان و گوتنەوەیان بە حەلەقاتی تەدریسی لە مزگەوت و دانیشگاكاندا

داهێنـــانی زاراوەكـانی تێكـڕای زانســتە شــەرعی وعــەقڵی یــەكان و نوسینەوەی ئەو زانستانەو گوتنەوەیان بە حەلەقاتی تەدریسی لە مزگەوت و حوجرەو قوتابخانەو پەیمانگاو دانیشگاكاندا لەوانە: (علـم التفسـير، علـم الحديث، مصطلح علم الحديث، علم الفقـه، علـم أصـول الفقـه، علـم القواعـد الفقهية والأصولية، علم الفتـوى الشـرعي، علـم التجويـد، علـم العقيـدة، علـم التصوف والأخلاق، علم السيرة، علم تراجم الرجال، علم التـاريخ الإسـلامي، علـم آداب البحـث والمنـاظرة، علـم الحكمـة والمنطـق، علـم النحـو والصـرف والاشتقاق، علم الإقتصاد الإسلامي،و علوم البلاغة)بە هەرسێ بەشی(المعان والبيان والبديع)یەوە..هتد..

## ( بيست و حەوت )

## داهێنانی ڕێكخستنی بەڵگە( نەقلی وعەقلی )یەكان بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەی كۆمەڵە گومڕاكان

ڕێكخستنی بەڵگەی دروست لـە هـەردوو ڕووی(نـەقڵی وعـەقڵی)یـە بـە مەبەسـتی بەرپەرچـدانەوەی كۆمەڵـە گومڕابووەكـان و هەڵوەشـاندنەوەی بـیری پوچـەڵی بـێ بـاوەڕو مولحیـد و مادەپەرسـتەكان، بـە تایبـەت لـە بوارەكـانی سـەلماندنی بـوونی خوداوەنـدی بونـەوەر و ئیمـان بـوون بـە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و بە ڕۆژی قیامەت و مەلائیكەت وقەزا

وقەدەر و پوچەڵ کردنەوەی شوبوهات و ڕەخنەی بێ ئەساسی دوژمنانی ئاینی ئیسلام بە بەڵگەی عەقڵی وەك لە زانستی عەقائیدی ئیسلامیدا ناسراو بە (علم الكلام) باسکراوە بە پێی پێویست کارێکی نەك هەر باش و داهێنراوێکی چاکە، بەڵکو پێویستیشە، بۆیە پێشەوای پایەبەرز (سلطان العلماء عز الدين بن عبد السلام الشافعي) لە (الفتاوى)یدا لە وەڵامدانەوەی پرسیارێکدا بە (البدعة الحسنة الواجبة) ناوی بردووە، بەڵێ پێشەوا (سلطان العلماء) لە وەڵامدانەوەی ئەو کەسانەی کە دەڵێن: ئێمە عەقیدەمان عەقیدەی ئەهلی سەلەفە، ئیتر چ پێویستە تەئویلی ئایات وفەرمودەکانی تایبەت بە صیفاتی پەروەردگارەوە بکەین، وەك ئەوان بە زاهیری ووشەکە مانای دەکەین! ئەو کەسانەی بە درۆزن و(كذاب) ناو بردووە، چونکە درۆدەکەن، ئەو عەقیدە خراپەی هەیانە، عەقیدە موجەسسیمەو موشەببیهەیە، نە مەزهەبی (تفويض)ە، نە مەزهەبی (تأويل)، پێیان دەڵێت: ئێوەی درۆزن چۆن دەڵێن ئێمە عەقیدەمان عەقیدەی سەلەفە لە کاتێکدا نازانن و هەست و شعورتان نییە بەرانبەر عەقیدەی سەلەف لەو رووەوە، نازانن سەلەف چۆن مانی ئەو ئایەت و فەرمودانەی کردووە بە چ شێوەیەك زانیویانە! کەواتە واجبە ئەو دەقانە تەئویل بکرێن بەو پێیەی کە لە زمانی عەرەبیدا هاتووە وشایستەیە بە پەروەردگار(جل جلاله)، بە پێویستی دەزانین تەواوی فەتواکەی نەقڵ بکەین، چونکە لەم سەردەمەشدا (وەهابیەکان) هەمان بیرو بۆچوونی چەوتیان هەیە و لە کاتی خۆشیدا (تەیمییەکان) هەمان دەعوایان هەبوو، چونکە ئەو فیرقانە ناو بەناو پەیدا دەبن و پاشان وەك بلقی سەر دەریا بە یەك شەپۆل لە نەفەسی پاکی زانایەك لە زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەکوژێنەوە ونامێنن، بەڵی ئەو کەسانەی ئەمڕۆش کە هەمان

دەعوایان هەیە فەتواکەی (سلطان العلماء) دەیانگرێتەوە کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی پرسیارو وەڵامەکەیە کە دەفەرموێت: « المسألة: ما معنى قوله (عليه السلام)" قلب المؤمن بين أصبعين من أصابع الرحمن يقلبه كيف يشاء"؟ وهل يخرج الإنسان عن الواجب عليه بقوله: (ما أقول في القرآن ولا في أحاديث الصفات شيئاً، بل اعتقد في ذلك ما يعتقده السلف الصالح، والكلام فيه بدعةٌ، وأمرُّ الأمرَ على الظاهر) أم لا بُدَّ في اعتقادي جزمٌ؟

الجواب: معنى قول النبي (ﷺ)"قلب المؤمن بين أصبعين من أصابع الرحمن" أن الله مستولٍ عليه[1] بقدرته وتصريفه كيف يشاء، من كفر إلى إيمان ومن طاعة إلى عصيان، أو عكس ذلك، وهو كقوله تعالى: (تبارك الذي بيده الملك..) وقوله (يا أيها النبي قل لمن في أيديهم من الأسرى..) ومعلومٌ

---

١. لە نوسخەی (دار المعرفة)دا بە ووشەی (مسؤول عليه) نوسراوە، بەڵام دەستكاری كراوە لە لایەن كەسێكەوە پێ دەچێت (والله أعلم) كابرای موعەلليق بێت، چونكە بە داخەوە زۆر عیبارەتی زانایان لە لای خەڵكێكی نەزانی نەفامەوە بە ناوی (محقّق) و لێكۆڵەر دەستكاری و عەبەسی پێ دەكرێت، ئەو جۆرە لێكۆڵەرانە چونكە عیبارەتەكانی خۆیان بە ئەندازەی پوشێك ئەرزش و قیمەتی نییە لای موسڵمانان دەچن لە ژێر پەردە و لە ڕێگەی عیبارەتی زانایانی ئیسلامەوە خۆیان هەڵدەقورتێنن و گۆڕانكاریان تیادا دەكەن و ژەهری تەجسیم و تەشبیه دەڕژێنن، بەڵام (لقد خاب من حمل ظلما)(ولا يفلح الساحر حيث أتى)! بەڵگەشمان بۆ ئەو دەستكاریە دوو شتە: یەكەمیان: خودی فەتواكەی (سلطان العلماء) كە (استيلاء)ی لە سیاقدا دووبارە كردووەتەوەو كابرا پێی نەزانیوە یان عەقڵی پێ نەشكاوە، وەك نەقڵمان كردووە، دووەمیان شەهادەتی نەقڵی قوتابییەكی خودی (العز بن عبد السلام)ە كە بریتیە لە پێشەوا (الإمام بدر الدين ابن جماعة الشافعي) كە لێیەوە ئەو فەتوای نەقڵ كردووە و ووشەكەش بە (مستولٍ عليه) هاتووە نەك (مسؤول عليه) كە هیچ واتایەك نابەخشێت! بنواڕە: إيضاح الدليل في قطع حجج أهل التعطيل، للإمام بدر الدين محمد بن إبراهيم بن سعد الله بن جماعة، تحقيق: وهبي سليمان غاوجي الألباني (ص ٢٤).

أنهـم لم يُتركـوا في أيـدي المسـلمين الـتي هـي جـوارحُ، وإنمـا كـانوا تحـت استيلائهم وقهرهم، وكذلك قـول الخاصـة والعامـة: (في يـدي فـلان)، و(العبـد والدابة في يد فلان) ومعلومٌ أن ذلك استيلاؤه وتصرُّفه، ولـيس في يـده الـتي هي جارحته، وكذلك قوله (تعالى): (أو يعفو الذي بيده عقدة النكاح) ليسـت هي عقدة النكاح التي هي لفظ بيده التي هي جارحةٌ، وإنمـا ذلـك عبـارة عـن قدرته على استيلائه، وتمكنه من التصرُّف فيها، (ومن يقول): إنـه يعتقـد في ذلك ما يعتقده السلفُ فقد كذَّب، كيف يعتقد ما لم يشعر به، ولم يقف علـى معناه؟ وليس الكـلام في هـذا بدعـةً قبيحـةً، وإنمـا الكـلام فيـه بدعـةٌ حسـنةٌ واجبةٌ، لمّا ظهرت الشبهة، وإنما سكت السَّلفُ عن الكـلام فيـه إذ لم يكـن في عصرهم من يحمل كلام الله وكلام رسوله(ﷺ) على مـالا يجـوز حملـه، ولـو ظهـرت في عصـرهم شـبهةٌ لكـذبوهم وأنكـروا علـيهم غايـة الإنكـار، فقـد ردَّ الصحابة والسلف على القدرية لما أظهروا بدعتهم، ولم يكونوا قبـل ظهـورهم يتكلّمون في ذلك، ولا يردُّون على قائله، ولا نقل عن أحد من الصـحابة شـيء من ذلك، إذ لا تدعو الحاجة إليه، والله أعلم»[1].

هەروەها پێشـەوا (أبـو عبـد الله القـرطبي المـالكي) لـە تـەفسـيرەكەیدا جەختی كردووەتەوە لەسەر ئەو حەقیقەتە و گوتویەتی: هەركەسێك ئەمڕۆ بەڵگەی عەقڵی ڕێك بخـات و خـۆی سـەرقاڵ بكـات لـە (علـم الكـلام)دا بـە مەبەسـتی وەڵامدانـەوەی بـێ بـاوەڕ و گومڕابـووان، ئـەوا پلـەی لـە پلـەی پێغەمبەرانەوە(عليهم الصـلاة والسـلام) نزیكدەبێتـەوە، وەك دەفـەرموێت:

---

١. كتاب الفتاوي للعز بن عبد السلام: خرّج أحاديثه وعلّق عليه: عبد الرحمن بن عبد الفتاح:(ص ٥٥ ـ ٥٧).

«قُلت: ومن نظر الان في اصطلاح المتكلمين حتى يناضل بذلك عن الدين فمنزلته قريبة من النبيين»[1].

## (بيست و هەشت)

## زیادکردنی زیاتر لە دوو بانگوێژ پێکەوە و لە یەك مزگەوتدا بەتایبەت لە سەردەمی ئەمەویەکاندا

زیادکردنی زیاتر لە دوو بانگوێژ بۆ دە بانگوێژ پێکەوە و لە یەك مزگەوتیشدا لە کاتی پێویستدا لە سەردەمی حەزرەتی عوسمانەوە پاشان ئەمەویەکان لە مزگەوتی گەورەی ئەمەویەکان لە دیمەشق تا ئەمڕۆش بەردەوامەو فەتوای هەر چوار مەزهەبیشی لە سەرەو وەك موتەرجیمیش بۆ قامەت و گوتنەوەی (الله أکبر)ی ئیمام [2].

## (بیست و نۆ)

## داهێنانی تێکڕای نازناوە دینیی و دونیاییەکان

دامەزراندنی نازناوە ئیسلامیەکان لە نێو موسڵماناندا لەوانە: (العالم، العلامة، الفهامة، المحقّق، المدقّق، المحدث، المفسر، الحافظ، الحاج، الملا، الأستاذ، الصوفي، الإمام، الزاهد، الفقير، الأصولي، الفقيه، المتكلم، اللغوي، النحوي، البلاغي، السيّد، النقيب، الشريف، الرباني، المؤرخ، البلداني،

---

١. تفسير القرطبي الجامع لأحكام القرآن: (٢ / ٢١٤).

٢. بنوارە بۆ درێژەی بابەتەکەو ریوایەتەکان و دەقی زانایان لەو رووەوە: أضواء البيان في إيضاح القرآن بالقرآن، محمد الأمين بن محمد المختار بن عبد القادر الجكني الشنقيطي (المتوفى: ١٣٩٣هـ) : (١٤٧/٨).

الرحالة، الشيخ، المقرئ، القارئ، النساخ، الكاتب، الباحث، المجيز، المفكّر، المنطقي، الفيلسوف، المؤلف، الموسوعي، المصنّف، الحكيم، الوزير، المفتي، القاضي، شيخ الإسلام، قاضي القضاة، الشيخ الأكبر، الإمام الأكبر، المجتهد المطلق، المجتهد في المذهب، المجتهد في الفتيا.. هتد» هیچیشیان له سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) بەو شێوازانە نەبوو، پاشتر پەیدا بوو، هەموو موسڵمانانیش پێیان داهێنراوێکی چاك بوو، هەندێك نازناوی تریش کە لە بنەڕەتدا ئیسلامی نییەو موسڵمانان بە وەهابییەکانیشەوە بۆ خۆیانی بەکار دەهێنن وەك: (الدكتور، البروفيسور).. کەسیش نەیگوتووە ئەمە بیدعەتێکی خراپە..

هەروەها نازناوە پیشەییە دونیایەکان کە پسپۆڕی تایبەتمەند بە هۆیەوە دیاری دەکرێت لەوانە: (المهندس، الطبيب، الفلكي، الجيولوجي، البايلوجي، الفيسيولوجي، الصَّحفي، الإعلامي، الأخصّائي، التربوي النفساني، الكيميائي، الفيزيائي، الرياضي، النووي، العسكري، الصيدلاني، القانوني،.. هتد)، ئەگەر کابرای وەهابی دەڵێت ئەمانە بیدعەتە و نەبووە لە کاتی پێغەمبەردا ئەوا دەڵێت ئەی وەهابی یاخود سەلەفی لە چوار قەرنەکەی سەلەفی صالّح دا هەبووە؟! بێگومان هیچیان نەبووە بەکاریشی دەهێنێت! ئەکەمە ئیلزامی خەصمە بە موسەللەماتی خۆی، چونکە دەرچوونە لە لایەن ئەوەوە لە مەنهەجییەتی خۆی.

هەروەها بەکارهێنان و داهێنانی زاراوەکانی وەك: (الشافعي، المالكي، الحنفي، الحنبلي) بە نیسبەت فروعی فیقهییەوە بۆ زانایانی هەر چوار مەزهەبی ئیسلام، هەروەها (الأشعري، الماتريدي، السُّني، المفوّضة، المؤولة (مذهب التفويض، مذهب التأويل، مذهب السَّلف، مذهب الخلف) بە نیسبەت زانایانی ئەهلی سوننەت وجەماعەتەوە، هەمووشی لای

موسڵمانان بەکاردەهێنرێت و هیچیشی کاتی خۆی نەبووە بە پێی هەل ومەرجەکانی رۆژگار بە پێی پێویست دامەزراوە !

هەروەها لە نمونەی زاراوەکانی زانستی تەصەووف وەك (المريد، المراد، المقام، المرتبة، المنزلة، الأبدال، أهل النوبة، أهل التفويض، النقباء، النجباء، الأقطاب، الغوث، الدوائر العشرين، دوائر النبوة، دوائر الولاية، الرابطة الروحية، المدد المعنوي،الحال، الهمة، العارف بالله، الرباني، المجدد، الفتوة، الملامتية، الارتقاء، التزكية، التصفية، رجال الغيب، الإنسان الكامل، مراتب الاصطفاء، مراتب العبودية، السير، السلوك، مراتب التوكل، مقامات الصابرين، الزهد، الخشية، الفناء في محبة الله، البقاء بالله..هتد» وەك لە سەرچاوەکانی تەصەووفدا هاتووە، کە هەریەکەیان چ (مقامات) چ (مصطلحات) چ (أحوال) لە زاراوەی ئەهلی تەصەووفدا واتایەکی تایبەت دەگەیێنێت کە تێکڕای وەرگیراوە لە فەهمی موجتەهیدانی زانستی تەصەووفەوە بۆ دەقەکانی تایبەت بە تەزکییەی نەفس وتەصفییەی قەلبەوە لە قورئان و سوننەتدا.

هەروەها نازناوەکانی نمونەی(خادم الحرمين الشريفين، ولي العهد، الأمير،..هتد ئەمانەش لە داهێنراوە چاکەکانن و کاتی خۆی نەبوون. بەڵام لە رووی شەریعەتەوە مانیعێك نییە بۆ دەربڕینیان.

## ( سی هەم )

## داهێنان و زیادکردنی ( التغليظ في ألفاظ الحلف ) لە لایەن ئیمامی شافیعییەوە( رضي الله عنه )

واتە زیادکردنی چەند لەفزێکی توند لە سوێندخواردندا لە سەر گومان لێکراو بۆ سوێند خواردن کە کاتی خۆی بەو شێوازە نەبووە، چونکە زەمانەکە پاشتر داخوازی ئەو زیاد کردنە بووە، وەك وەك ئیمامی شافیعی (رضي الله عنه) ئەفەرموێت: ئەم زیادکردنەمان لە بابی ئیحتیاتە، وەك لە (الأم) دا هاتووە: « (قال الشافعي) رحمه الله تعالى: ولو ادعى على رجل أنه قتل رجلاً عمداً حلف بالله الذى لا إله إلا هو عالم خائنة الأعين وما تخفى الصدور: ما قتل فلاناً، ولا أعان على قتله، ولا ناله من فعله، ولا بسبب فعله شئ جرحه، ولا وصل إليه شئ من بدنه، ولا من فعله، وإنما زدت هذا في اليمين عليه احتياطاً »[1].

## ( سی و یەك )

## زیادکردن لە نزاکانی پاش خوێندنی دۆعای ( التشهد )ی ناو نوێژدا

زیادکردن لە نزاکانی پاش خوێندنی دۆعای (التَّشَهُّدْ) واتە: (التَّحييات لله..)ی نێو نوێژ، چونکە ئەو نزایانە ئیتتیفاقی نییە، بۆیە دروستە هەر نزایەك کە نوێژخوێن پێی چاك بێت بیخوێنێت و پێشی ناگوترێت بیدعەتی شەرعی، چونکە بە شێوەیەکی گشتی پێغەمبەر (ﷺ) ئیجازەی

١. الأم للإمام الشافعي: (٦ / ١٠٧).

فەرمووە، وەك لە صەحیحی بوخاری دا هاتووە: «عن عبد الله بن مسعود مرفوعاً: « فإذا جلس أحدكم في الصلاة فليقل: التحيات لله والصلوات والطيبات السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته، السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين، فإنه إذا قال ذلك أصاب كل عبد صالح في السماء والأرض، أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا عبده ورسوله، ثم يتخير بعد من الكلام ما شاء » [1]

هەروەها لە صەحیحی (ابن حبان)دا هاتووە بە لەفزی: «.. ثم يتخير من الدعاء ما أحب»[2].

لە (سنن النسائی) دا بە سەنەدێكی صەحیح بەم دەستەواژە هاتووە: «ثم ليتخير من الدعاء بعد أعجبه إليه يدعو به » [3]

وە لە ریوایەتی (أبو جعفر الطحاوي)دا هاتووە بەم شێوە: « ثُمَّ ليخترْ أحدُكم بعد ذلك أطيبَ الكلام أو ما أحبَّ من الكلام»[4]..

بەم پێیە دەركەوت هەر دۆعایەك موسڵمانان بیكەن و دایبهێنن با پێغەمبەریش(ﷺ) نەیكردبێت پێی ناگوترێت بیدعەت چونكە داهێنراوێكی چاكەو لە دەرەوەی واجبەكەیە. ئەصڵیش لە زیادكردنی فەرز و واجبدا وەستانە. نەك لە نەفل و سوننەتەكاندا. مادام بەڵگە گشتییەكان بیگرێتەوە یان نەهێیك نەبێت لە سەری وەك رەهبەنەت وازهێنان بە تەواوەتی لە دونیاو حەڵاڵەكانی.

---

١. صحيح البخاري (٥ / ٢٣٠١)برقم(٥٨٧٦).

٢. صحيح ابن حبان بتحقيق الأرناؤوط (٥/٢٨٤)برقم(١٩٥٥).

٣. سنن النسائي: (٣/٥٠)برقم(١٢٩٨).

٤. شرح معاني الآثار للطحاوي بتحقيق: محمد زهري النجار: (١/٢٣٧)برقم(١٣١٤).

## ( سی و دوو )

## داهێنان ودامەزراندنی ناوەندە ئایینی و زانستییەکان لە جیهانی ئیسلامییدا

دامەزرانـدن و پێکهێنـان و ڕیکخسـتن و دروسـتکردنی قوتابخانـەی ئایینی و زانکۆ و ناوەندە زانستییەکان و کتێبخانە گشتی و تایبەتیەکان و خانـەقا و مەڵبەنـدەکانی یـادی خـودا و چـاپخانەکان و ئەنجامـدانی توێژینەوەو و پێکهێنانی ڕێکخراوی پیشەیی و دەستەو سەنتەر و کۆمەڵەی هاریکاری و لیژنەو مەجمەعی فیقهی و لیژنەی فەتوای شەرعی و داهێنـانی دامەزراوەکانی تەندروستی و جێگەی حەواندنـەوەی خـاوەن پێداویسـتییە تایبەتەکان و..هتد نمونەی ئەمانە تێکڕایان کـارێکی باشـن و پێویستیشـن بـۆ موسـڵمانان، هیچیشـیان لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا(ﷺ) نـەبووەو هەمووی لـە بـابی بیدعـەتی حەسـەنەیە و داهێنـراوی چـاکن وەك زانایـانی ئوصولّی فیقهی ئیسلامی ئاماژەیان بۆ کردووە بە نمونـە هەنـدێك لەوانـەی گوتمـان باسـیان کـردووە[1]. هـیچ کەسـێکیش ناتوانێـت بڵێـت وا نییـە، هەموشی لە بابی عیباداتە، یان هۆکـارن بـۆ عیبـادەت و خوداپەرسـتی و نزیك بوونەوەیـە لـە ڕەزامەنـدی خـودا، لـە هـەموو دونیـای ئیسـلامدا ئـەم دامەزراوانە هەیە بە وولّاتی حوکمڕانی وەهابیەکانیشەوە ! .

---

١. بنـوارە: (الفـروق مـع هوامشـه (أنـوار الـبروق في أنـواع الفـروق) للقـرافي بتحقيـق: خليـل المنصور:(٤/ ٣٤٥ ـ ٣٤٨). وقواعد الأحكام في مصالح الأنام للإمام عز الدين بن عبـد السـلام، دراسة وتحقيق: محمود بن التلاميـد الشـنقيطي: ( ٢/ ٢٠٧ ـ ٢١٠). و(الباعـث علـى إنكـار البـدع والحوادث) للإمام أبي شامة الدمشقي بتحقيق: عثمان أحمد عنبر: (ص ٢٣).

ئیمام (بدر الدین الزرکشي) لـه (الحـافظ ابـن الجـوزي) و (الحـافظ ابـن الأثیر)ەوە نەقڵی کردووە کە یەکەم مزگەوت کە لـە ئیسـلامدا درووسـتراوە مزگەوتی (قباء) بووە، کە حەزرەتی (عمـار بـن یاسـر) دروسـتی کـردووە، واتە یەکەم مزگەوت لە ئیسلامدا ئەو صـەحابە بـەڕێزە دروسـتی کـردووە، پاشان دەفەرموێت: یەکەم جار لە ئیسـلامدا کـە قوتابخانـە دروسـتکراوەو قوتابی تیادا راگیر کراوەو بە فەرمی دەرسی تیادا خویندراوەو مامۆسـتای بۆ تەرخانکراوە بریتییە لە قوتابخانەکانی (النظامیة) لە سـەردەمی (قـوام الـدین الحسـن بـن علـي نظـام الـدین الطوسـي السـلجوقي وزیـر السـلطان السلجوقي ألب أرسلان ثم ولده ملکشاه السـلجوقي) رەحـەتی خوایـان لـە سەر بێت، کە لە بەغداد لـە سـاڵی (٤٥٧ کۆچـی)دا قوتابخانـەی نظامیـەی بەغدای دروست کردووە، لە سـاڵی (٤٥٩کۆچـی) تـەواوی کـردووە، وە زۆر رێزی لە زانا وصۆفی هەژاران گرتووە، وە یەکەم جـار پێشـەوا (أبـو نصـر ابن الصباغ الشافعي) پاشان (أبو إسحاق الشیرازي) و (أبو سـعد المتـولي) دەرســیان تیــادا گوتووەتــەوە، پاشــان قوتابخانــەی نەیســابوری دروستکردووە (إمام الحرمین الجویني) بەرێوەی بردووە پاشان (الزرکشي) دەفەرموێت: « ثم اقتدی به الناس في بناء المدارس» [1].واتـە: «پـاش ئـەو خەڵکی چاویان لێکردووە لە دامەزراندن و دروستکردنی قوتابخانەکاندا».

ئەڵبەتە قوتابخانەی تـر هـەبووە پـێش (نظـام الملـك) لـە ناوچـەکانی نەیسابوردا وەك خودی (الزرکشي) نەقڵی کردووە لە پێشـەوایان (الـذهبي) و (ابن السبکي) یەوە، [2] بەڵام بەو گەورەیی و رێـك و پێکـی و شایسـتەییە

١. بنوارە: إعلام الساجد بأحکام المساجد للزرکشـي أبـو عبـد الله محمـد بـن عبـد الله الشـافعي، بتحقیق: أبو الوفاء مصطفی المراغي: (ص٣١-٣٢).
٢. بنوارە: إعلام الساجد للزرکشي: ص ٣٢.

نەبووە، چونکە قوتابخانەکانی (النظامية) وەك دانیشگاکانی ئەمڕۆ وابووە لە چالاکی و گشتگیریدا.

هــەروەها (أبــو العبــاس ابــن تيميــة) لــە (الفتــاوى الكــبرى)ی خۆیــدا دەربــارەی ســـەرەتاکانی دروســـتکردنی قوتابخانـــەو خانـــەقا و قـــەڵاکان گوتوویەتی: « أحدثت المدارسُ لأهل العلم، وأحدثت الربط والخوانـق لأهـل التعبُّد، وأظن مبدأ انتشار ذلك في دولة السلاجقة، فـأول مـا بنيـت المـدارس والرباطات للمساكين، ووقفت عليها وقوف تجـري علـى أهلـها في وزارة نظـام الملك، وأمّا قبل ذلك فقد وجد ذكر المدارس وذكر الربط لكـن مـا أظـن كـان موقوفـا عليهـا لأهلـها وإنمـا كانـت مسـاكن مختصـة وقـد ذكـر الإمـام (أبـو منصــور) معمــر بــن زيــاد (الأصــفهاني) مــن أصــحاب الواحــدي في أخبــار الصوفية(أخبار شيوخ أهل المعرفة والتصوف) أن أول دويـرة بنيـت لهـم في البصرة، وأما المدارس فقد رأيت لها ذكرا قبل دولة السلاجقة في أثناء المائة الرابعة، ودولتهم إنما كانت في المائة الخامسة، وكذلك هذه القـلاع والحصـون التي بالشام عامتها محدث كما بنى الملك العادل قلعة دمشق وبصرى وحران وذلك أن النصارى كانوا كثيري الغزو إليهم، وكان الناس بعـد المائـة الثالثـة قد ضعفوا عن دفاع النصارى عن السواحل حتى استعلوا على كثير من ثغور الشام الساحلية» [1].

---

١. الفتاوى الكبرى لابن تيمية بتحقيق: حسنين محمد مخلوف: (٥ / ١١٩).

## ( سی و سێ )

## داهێنانی فراوانکردنی هەردوو حەرەمی مەککەو مەدینە لە بەر نوێژخوانان بە درێژایی مێژووی ئیسلام

یەکێکی تر لە داهێنراوە چاکە پێویستەکان بریتییە لە فراوانکردنی هەردوو حەرەمی پیرۆزی مەکەو مەدینە بە درێژایی مێژووی ئیسلامی بە مەبەستی عیبادەت، هەر لە یەکەم تەوسیعەوە کە حەزرەتی عومەر(رضي الله عنه) کردی و ماڵی حەزرەتی عەبباسی (رضي الله عنه) خستە سەرمزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ)[1] تا سەردەمی ئەمەویەکان و عەبباسیەکان و هەتا عوسمانیەکان و تا ئێستاش هەر بەردەوامە ئەو فراوانکردە، لە کاتێکدا سنووری حەرەمین لە سەردەمی پێغەمبەر دا (ﷺ) دیاری کراو بووە بۆ ئیعتیکاف و مانەوە و عیبادەتکردن.

## (سی و چوار)

## داهێنانی خوتبەی هەینی بە غەیری عەرەبی

ئاشکرایە کە خوتبەی هەینی تا ئەم دوایانەش لە جیهانی ئیسلامی وکوردستانیشدا تەنها بە زوبانی عەرەبی گوتراوە، پاشان بە زمانی کوردی بۆ یەکەم جار وەك زانیومە عەللامەی عێراق مەرحومی مامۆستای خۆم و مەرحومی باوکیشم مامۆستا مەلا عبد الکریمی مودەرریسی شارەزوری

---

١. پێشەوا (ابن سعد الزهري) دەفەرموێت: « وهدم عمر (رضي الله عنه) مسجد رسول الله، (ﷺ)، وزاد فيه، وأدخل دار العباس بن عبد المطلب فيما زاد، ووسعه وبناه لما كثر الناس بالمدينة » الطبقات الكبرى لابن سعد (٣ / ٢٨٣).

نەقشبەندی بە کوردی خوتبەی هەینی لە خانەقای بیارەدا گوتویەتی کاتی خۆی نوسخەیەکیشی ناردووە بە خوالێخۆشبووی کوڕیدا مامۆستا مەلا فاتیح بۆ مزگەوتی جامیعە واتە (مزگەوتی گەورە) لە هەڵەبجەی شەهید کە تەنها مزگەوت بووە لەوێ نوێژی هەینی تیادا کرا بێت[1] هەروەها مامۆستای مودەڕریس دانراوێکیشی بە کوردی لە سەر نووسیوە بە ناوی (ووتاری ئایینی بۆ ڕۆژانی هەینی) [2] پاش ئەو ئیتر ووتاری کوردی بوەتە دیاردەو پاشان هەموو مزگەوتەکانی کوردستانی گرتووەتەوەو کەسیش نەیگوتووە ئەمەی ئێستە خەڵکی لە سەرە بە ووتاربێژە وەهابیەکانیشەوە کارێکی بیدعەتەو خراپە، بەڵکو بە پێویستیان زانیوەو وەهابیەکانیش ناتوانن لەم راستیە هەڵبێن، لە کاتێکدا لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) و صەحابەو تابیعین و هەتا نزیکەی سەد ساڵ لەمەوبەر خوتبە هەر بە زمانی عەرەبی بووە ![3].

---

١. ناردوویەتی بە دەستخەت بۆ لای خوالێخۆشبوو مامی گەورەمان مامۆستا شێخ جەمیلی مامۆستا شێخ موستەفای موفتی هەڵەبجە(رحمة الله علیهما) کە هەمان ئەو نوسخەش پارێزراوە لە کتێبخانەی مامی خۆشەویست و پایەدارمان مامۆستای شێخ نور الدینی موفتی (أيَّده اللهُ وحفظه بمنّه آمين). کە بریتییە لە پەنجا ووتار، یەکەم خوتبەشی باسی ویلادەتی حەزەت(ﷺ) دەکات، و کوتا ووتاریشی باسی جەژنی قوربانە)، ئەم زانیارانە برای خۆشەویست و دڵسۆزم مامۆستا شێخ مَظْهَری کوڕی مامۆستا شێخ نور الدینی موفتی بە سوپاسەوە پێی گەیاندم لە شەوی یەك شەممە ٩ـ ٢ـ ٢٠١٣ز.

٢. لە ساڵی ١٩٨٤ لە (دار المثنى) لە بەغداد ـ عێراق لە چاپ دراوە.

٣. تەنانەت هەندێك لە زانایانی هیندستان لەم دوایانەشدا فەتوای حەرامی ئەنجامدانی خوتبەیان دابوو بە هەر زمانێك جگە لە عەرەبی، لە نامیلکەیەکدا بە ناونیشانی: (فتاوی علماء الهند علی منع الخطبة بغير العربية). لە لایەن (مكتبة الحقيقة)ەوە لە (أسطنبول) لە ساڵی ١٩٩٦م). بڵاو کرابوویەوە، کە بێگومان ئەم فەتوایە زۆر مەرجوحە، چونکە ئیسلام نەهاتووە خەڵکی بکاتە عەرەب، یان فێری عەرەبیان بکات، بەڵکو هاتووە فێری ئیسلامیان

## (سی و پێنج)

## داهێنانی راڤەو تەفسیرکردنی قورئانی پیرۆز بە زمانەکانی غەیری عەرەبی

هەروەها تەفسیری قورئان و راڤەکردنی سوننەت لە لایەن زانایانەوە و تەرجەمەیان بە زمانەکانی جگە لە عەرەبی لە وڵاتانی ئیسلامیدا لەوانەش زمانی کوردی کە بۆ یەکەم جار لە لایەن زانای خواناس مامۆستا مەلا محمد خواهەرزادی قازی پێنجوێنی نەقشبەندی یەوە کراوە بە لە ئەوەڵی قورئانەوە تا کۆتایی و تەواوەتی بە ناونیشانی: (تیذکاری قورئان بۆ قەومی کوردان) [1]، کە ئەم هەنگاوە پیرۆزانەیان بە مەبەستی تێگەشتن و شارەزایی زیاتر بووە لە ئیسلام، کە بێگومان لە داهێنراوە چاکەکانەو کەسیش ناتوانێت بەرهەڵستی بکات یان نکولی لیّ بکات.

---

بکات، جگە لە سورەتی فاتیحەو هەندێك دەستەواژەی کەم، واجبی نەکردووە زمانی عەرەبی.

١. لە هەشت بەرگی گەورەی دەستخەتدا نوسخەیەکی پارێزراوە لە کتێبخانەی برای گەورەو بەڕێزم مامۆستا شێخ موحسینی موفتی (أحسن).(زید عزُّه). شایەنی باسە برای زۆر بەرێزم مامۆستا مەلا ئازاد گڵەجاڵی نەقشبەندی (م. عبد الله) ئێستا خەریکی سەر لە نویّ نوسینەوەو لێکۆڵینەوەی ئەو تەفسیرەیە، خوا هاوکاری بێت و پاداشتی بەخێری بداتەوە.

## ( سی و شەش )

## داهێنانی ساڵانەی خەتمی سی جوزئەی قورئانی پیرۆز بەردەوامی لە تەراویحی رەمەزاناندا

داهێنـانی خـەتمی سـی جوزئەکـەی قورئـان سـاڵانە و بـەردەوامی لـە تەراویحی رەمەزاناندا لە لایەن موسڵمانانی سەر رووی زەوی بە تایبەت لـە هـەردوو حـەرەمی مەککـەو مەدینـەی پـیرۆزدا، وەك ئاشـکرایە راسـتەوخۆ کەناڵە بیدعە چاکەکانی (سعودیة) دەیگوازنەوەو هیچ جۆرە دەقێکیشی لە سـەر نییـەو سـەلەفی صـاڵحیش نـەیانکردووە بـەو جـۆرە و دروستیشـە، چونکە عیبادەتێکی داهێنراوی چـاکە. بۆیـە پێشـەوا (الإمـام ابـو بکـر ابـن العربي المالكي) لە (أحكام القرآن)یدا فەرموویەتی: «وليس من السنة ختم القـرآن في رمضـان، حسـبما ذكرنـاه في شـرح الحديث والمسـائل» واتـە: « سوننەت نییە خەتم کردنی تەواوی قورئان لە نوێژی تەراویحی رەمەزانانـدا بـە پێـی ئـەو بەڵگانـەی کـە باسمـانکردووە لـە شـەرحی فەرموودەکـەو بابەتەکانیدا »[1]. کە سوننەت نەبێت کەواتە، بیدعەتە، بـەڵام بیدعـەتێکی چاکە، ئەگەر نا تەواوی جیهانی ئیسلامی ئەمرۆ بە (بـلاد الحـرمين)یشـەوە لە مەوپێششیش بە گومڕاو مومتەدیع دەردەچن (والعياذ بالله تعالى). کەواتە هیچ مەجالێك نیە بۆ بڕیـار نـەدان لـە سـەر داهێنـانی چـاك لـە عیباداتـدا، چونکە تێکڕای داهێنراوە چاکەکان بەڵگە گشتییەکان دەیانگرێتەوە.

١. أحكام القرآن أبي بكر محمد بن عبد الله الأندلسي الشهير بابن العربي:(٨ / ١٦٨).

## ( سی و حەوت )

### داهێنانی بەرنامە هەمە جۆرە ئایینی و زانستی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریەکان و پەخشکردنیان لە کەناڵەکاندا بە بەردەوامی بە مەبەستی بانگەشەی ئیسلامی

داهێنـانی کەناڵـە ئاسمـانی و زەمینیـەکان و سـازدانی بەرنامـە هەمـە جۆرە ئایینی و زانستی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری بـە تایبـەت: تەفسـیر و تەجوید وفەرمودە و فیقهو سیرەت و مێـژووی ئیسـلامی و فـەتواو.. هتـد، هــەر هــەمووی داهێنــراوزی تازەیــە و چــاکەکانی لــە جــۆری بیدعــەتی حەسەنەیە و مەبەست لێیەوە بانگەشـەو دەعـوەی ئیسـلامی یـە، زۆربـەی زۆریشـــی تایبەتمەنـــدە بـــە کـــات و شـــوێنی تایبەتـــەوە بـــە کەناڵـــە وەهابیەکانیشەوە و هیچ کام لەو داهێنراوانە دەقێکیان لە سەر نییە نە لـە قورئان نە لە سوننەت دروستیشەو هەموو موسڵمانانیش پەیڕەوی دەکەن، تەنها بەڵگەی دروستیشیان تەقسـیمی زانایانـە بـۆ بیدعـەو داهێنراوەکـان، ئەگەر چاك بوو چاکەو ئەگەر خراپیش بوو خراپە.

## ( سی و هەشت )

### داهێنانی گۆڤار و رۆژنامەو ئۆرگان و بڵاوکارەو کتێب و نامیلکەو سی دی و دی ودانراوەکان بە گشتی بە مەبەستی دەعوەی ئیسلامی

داهێنانی گۆڤار و رۆژنامەو ئۆرگان و بڵاوکارەو کتێب و نامیلکەو سـی دی و دی ڤی دی و دانراوەکان بە گشتی یان پەخشکردنیان لـە ڕێگاکـانی تایبـەت بـە میـدیا جۆراوجۆرەکانـەوە بینـراوو بیسـراوو خـوێنراو لـە بـابی بیدعــەتی حەســەنەیە ئەگــەر چــاك بــوو، هــەموو موســڵمانانیش ئــەمڕۆ پێویســتی پێیــان هەیــەو بووەتــە زەرورەتێکــی شــەرعی بــە مەبەســتی

گەیانـدنی ئیسـلام و کـاری دەعـوەی ئیسـلامی و ڕوو بـەڕوو بوونـەوەی تەوژمی ئیلحـاد و بـێ بـاوەڕی بـە هـەموو جۆرەکانیـەوە. چـونکە عمـومی بەڵگـەکانی قورئـان و سـوننەت دەیانگرێتـەوە بـا ڕاستـەو خـۆ دەقێکـیش نەبێت لە سەریان، لەو عمومانە ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ [1] هەروەها فەرمودەی پیرۆزی: «بلغوا عني ولو آيةً، وحدثوا عن بني إسرائيل ولا حرجَ، ومن كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من النـار » [2] ئیتر دیـاری نـەکردووە شـێوازی دەعوەو گەیاندنەکان چون بێت و چۆن نەبێت، گرنگ ئەوەیە بۆ خودا بێت و لـە دائـیرەی شـەریعەتدا بمێنێتـەوە، بۆیـە هـەر داهێنانێـك لـەو بـوارەدا کارێکی چاك و شایستەیەو عیبادەتیشە.

## ( سی و نۆ )

## زیادکردنی مالیکیەکان بۆ ڕێژەی ڕکاعەتەکانی نوێژی تەراویح

زیادکردنی زانایانی ئەهلی مەدینە بـە تایبـەت مالیکیـەکان بـۆ ڕێـژەی نوێژی تەراویح لە بیست ڕکاعەتەوە کە ئیجماعی صەحابەی لـە سـەرە بـۆ سـی و شـەش ڕکاعـەت، لـە کۆتـایی سـەدەی یەکـەمی هیجرەتـەوەو تـا ئێسـتاش بەردەوامـە بـە ڕای مالیکیـەکان، هـۆی زیادکردنیشـیان مونافەسەیەکی چاکی ئەهلی مەککە بوو بۆ زیاتر ئەنجامـدان عیبـادەت بـۆ بەدەسـتهێنانی ڕەزامەنـدی و خـودا و پاداشـتی بەهەشـت، ﴿وَفِـي ذَلِـكَ

---

١. (سورة فصلت: ٣٣).

٢. صحيح البخاري: (٣ / ١٢٧٥)برقم(٣٢٧٤). عن عبد الله بن عمرو (رضي الله عنهما).

فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ﴾[1] چونكه ئەوان لە نێوان هەردوو ركاعەتدا تەوافێكیان ئەنجام دەدا، ئەمانیش گوتیان لە جیاتی تەوافەكەی ئەوان ئێمە دوانزە ركاعەتی تەراویح زیاد دەكین، ئەمەی ئەمان كارێكی چاك وداهێنراوێكی باش بوو لە بەشی عیباداتیش بوو، كەسیش نەیگووت بیدعەتێكی خراپە..

عەللامە (ابن حجر المكي الهيتمي المتوفى ٩٧٤هـ) ئەفەرموێت: «وهي عندنا لغير أهل المدينة عشرون ركعة، كما أطْبَقُوا عليها في زمن عُمَرَ (رَضِيَ اللَّه عنهُ) لَمَّا اقْتضى نَظرُهُ السَّديدُ جَمعَ النَّاس على إمامٍ واحدٍ، فَوَافَقُوهُ، وكانوا يُوتِرُون عَقِبَها بِثَلَاثٍ، وَسرُّ الْعشْرِينَ أَنَّ الرَّوَاتب الْمُؤَكَّدة غير رمضان عَشْرٌ، فضُوعِفَتْ فيه، لِأَنَّهُ وَقْتُ جِدٍّ وَتَشْمِيرٍ، ولهم فقط لشَرَفِهِمْ بجواره (ﷺ) ستٌّ وثلاثُون، جَبْرًا لَهُمْ بزيادة ستَّةَ عَشر في مقابلة طَواف أهل مكَّةَ أربعة أسباع بين كل ترويحة من العشرين سبعٌ، وابتداءُ حُدُوث ذلك كان أواخر القرن الْأَوَّل، ثُمَّ اشتهر ولم يُنْكَرْ، فكان بمنزلة الإجماع السُّكُوتِيِّ، ولمَّا كان فيه ما فيه، قال الشَّافعيُّ (رضي الله عنه): العشرون لهم أحب إليّ،، وقال الحَلِيمِيُّ: عشرون مع القراءة فيها بما يُقْرَأُ في ستّ وثلاثون أفضلُ " لأنَّ طُول القيام أفْضَلُ من كثرة الركعات، ويجب التَّسْلِيمُ من كل ركعتين كما مرّ، فإن زاد جاهلاً صارت نفلاً مطلقا»[2].

---

١. (سورة المطففين: ٢٦).

٢. تحفة المحتاج بشرح المنهاج للفقيه ابن حجر المكي: مع ضبط وتعليق: د. محمد محمد تامر: (٣٨٤/١).

## ( چل )
## داهێنانی تەواف و سەعی و ڕەجم کردن لە قاتەکانی سەر زەوییەوە

لە جۆری بیدعەتی پێویستە تەواف و سەعیی و ڕەجمی شەیتان لە قاتەکانی دووەم و سێیەمەوە، کە ئەم شێوازەش کاتی خۆی بوونی نەبوە، بەڵام وەك ئاشکرایە چەندین ساڵە بەو شێوازە فەتوای بۆ دراوە و ئەنجام دەدرێت، ئەگەر چی لە سەردەمی پێشینەکاندا ئەو عیبادەتانە تەنها لە تابیقی سەر زەوی ئەنجامدراوە، کەواتە بیدعەتەو عیبادەتیشە بەڵام بیدعەتێکی پێویست و زەرورییە لە بەر بەرژەوەندی موسڵمانان.

## ( چل و یەك )
## زیادکردنی نزای: ( یا ربَّ العالمين ) لە پاش ( آمين )ی نوێژەکان لە لایەن پێشەوای پێشینە ئیمامی شافیعی ( رضي الله عنه )

ئیمامی شافیعی کە لە گەورە زانایانی پێشینەیە بە کۆی دەنگ چونکە (١٥٠ بۆ ٢٠٤)ی کۆچی ژیاوە، لە کتێبی باوەڕپێکراوی (الأم)یدا کە دەفەرموێت: « ولو قال مع آمين: (رب العالمين) وغير ذلك من ذكر الله، كان حسناً، لا يقطع الصلاة شئ من ذكر الله»[1]. واتە: « پاش ئامین کردنی دوای خوێندنی سورەتی فاتیحە ئەگەر نوێژخوان لە گەڵ (ئامین)دا بلێت ربَّ العالمين) یان هەر زیکرێکی تر، شتێکی چاکەو نوێژیش بە زیکری خودا ناپچڕێت» لە کاتێکدا ئەوەی لە سوننەتدا هاتووە تەنها ووشەی (آمین)ە، وەك لە فەرموودەکەی بوخاری و موسلیم دا دەقەکەی هاتووە، بەڵام

---

١. الأم للإمام الشافعي: دار الفكر: (١٣١/١).

چونکە داهێنراوێکی باشەو بەڵگە گشتییەکان دەیگرێتەوە پێشەوایانی ئیسلام دوای ئیمامی شافیعی هەمووی کاریان پێکردووەو کەسیش نەیگوتووە بیدعەتێکی خراپە. هەروەها نەیانگوتووە: چۆن ئەبێت ئیمامی شافیعی عیبادەتێك دابمەزرێنێت و زیادی بکات کە نەکرابێت[1] !؟ (حاشا و كَلاّ). بەڵێ زانایانی ئیسلام ووشیار و زانیار بوون، دەیانزانی و دەزانن کە داهێنراو لە سەر دوو بەشە، چاك و خراپ، چ لە عیبادات و چ لە معامەلاتدا، مادام بەڵگەی تایبەت یان گشتی لە سەر هەبێت، یان دژیایەتی و پێچەوانەی یەکێك لە بەڵگەکانی (الكتاب السنة، الإجماع، القياس) نەبێت. بۆیە هیچ گرفتێکیان لەو ڕووانگەوە نەبوەو ناشبێت.

## ( چل و دوو )
## داهێنانی نوێژکردن و نییەتی ئیحرام لە ئاسماندا

ئاشکرایە نوێژکردنی ناو فڕۆکە وکورتکردنەوەی نوێژەکان با بە چەند دەقیقەیەکیش بگاتە جێگەی مەبەست کارێکی دروستە و فەتوای زانایانی لە سەرە، هەرچەندە فڕۆکەو هاووێنەکانی لە داهێنراوە تازەکانن، ئەم کارەش زانایانی ئیسلام کاتی خۆی ئیشارەتیان بۆ کردووەو فەتوایان بۆ داوەو فەرمویانە عیللەتی کۆکردنەوەی نوێژ ئەصڵی سەفەرەکەیە نەك مەشەققەت و ماندوبوون، چونکە بۆ خۆی سەفەرکردن مەزەنەتی مەشەققەتە واتە جێگەی گومانی ماندوبوونە.

---

١. بنواڕە: المجموع شرح المهذب للنووي: (٣٧٣/٣)، وأسنى المطالب: لشيخ الإسلام زكريا الأنصاري، تحقيق: د. محمد تامر، (١٥٤/١) ومغني المحتاج للشربيني: (١٦١/١).

هەروەها فەرمویانە: پێویستە بۆ کەسێك بە تـەیارە سـەفەر بکـات لـە ئاسماندا وپێش ئەوەی بگاتە میقاتی خۆی نییەتی ئیحرام بهێنێت لـە نێـو فڕۆکەکەیدا، ئەگەر میقاتی نەدەزانی پێویستە هەر سـواری تەیارەکـە بـوو نییەت بهێنێت نەوەك تەجاوزی میقاتەکەی بکات و پێـی نـەزانێت ئـەوکات خوێنێکی لە سەری واجب دەبێت[1].

## ( چل و سێ )

## داهێنانی جۆرەها وەرزش بە قیاس لە سەر وەرزشە شەرعییەکان

داهێنانی جۆرەهـا یـاری وەرزشـی نـوێ وەك یاریـەکانی تـۆپی پـێ و تێنس و باڵە و.. هتد. بە قیاس لـە سـەر ئـەو یاریانـەی کـە لـە سـوننەتدا واریـد بـوون، لەوانـە: پێشـبڕکی و مەلـەکردن و تیرەنـدازی، چـونکە بەڵگەگشتییەکان دەیانگرێتەوە با دەقێکی راستەوخۆش نەبێت لە سەریان و پێشینەکانیش نەیانکردبێت، ئەمە بە مەرجێك کە لە سنووری شـەریعەت دەرنەچێت نەك بەو شێوازەی کە ئێستا وڵاتانی ئیسلامی تێکـەوتووە بـە وڵاتی سعودییەشەوە کە ملیۆنەها دۆلار سەرفدەکەن بۆ تیبە وەرزشـی و یاریە ئۆلۆمپییەکان و ناشڵێن بیدعەتە یان ئیسراڤە!

حاڵی حازر کە ئێستا ئەم توێژینەوەیە دەنووسـم لـە مـانگی رەجـەبی سـاڵی ١٤٣٤کۆچـی ئـەو وڵاتـەی کـە باسمـانکرد خـولێکی تـۆپی پـێ و وەرزشی کردووەتەوە و ئاس و خەڵاتی پاشانەی لە سەر دابـەش دەکرێـت

١. بڕوانە: رفع الحاجب عن مختصر ابن الحاجب لابن السبكي تاج الدين أبي النصر عبد الوهاب بن علي بن عبد الكافي السبكي: (٤/ ٢١١) والموسوعة الفقهية الكويتية: (٢ / ١٤٧).

به ناونیشانی (كأس خادم الحرمين الشريفين للأبطال) وه تیایدا چەندین تیپ بەژداری دەكەن!

**رەنگە بگوترێت:** (وەرزش) خۆ لە بابی عیبادەت نییە تا داهێنانی تیادا دروست نەبێت؟

**لە وڵامدا دەڵێین:** ١- بەڵێ وەرزشكردن جگە لەو جۆرانەی كە دەق هاتووە لە سەریان لە ئەصڵدا سوننەت نییە، بەڵام بەڵگە گشتییەكان هەموو جۆرە وەرزشێك دەگرێتەوە با پێشتریش نەكرابێت بە مەرجێك سنووری شەریعەت تیایاندا نەبەزێنرێت. بۆیە بەو مانایە دەچێتە بابی عیباداتەوە بۆیە بە نمونەی هێناومانەتەوە..

٢- هەروەها ئاشكرایە كە وەرزشكردن ئەگەر بە نییەتێكی باش ئەنجام بدرێت وەك ئەوەی كە مرۆڤ لەشی ساغ بێت بۆ ئەنجامدانی عیبادەت ئەوە بۆ خۆشی دەبێتە عیبادەت، چونكە وەك ئوصوڵیەكان فەرمویانە:(العاداتِ تنقلبُ عباداتٍ بالنّياتِ الصّالحات)، ئەمەش پشت ئەستورە بە چەندین دەق لەوانە فەرمودەی صەحیحی پێغەمبەر(ﷺ) «وفي بُضع أحدكم صدقةٌ، قالوا يا رسول الله: أياتي أحدنا شهوته ويكون له فيها أجرٌ؟ قال: أرأيتم لو وضعها في حرام أكان عليه فيها وزر؟ فكذلك إذا وَضعها في الحلال كان له أجرا »[1].

---

١. رواه مسلم في صحيحه: (٢/٦٩٧)برقم(١٠٠٦) عن أبي ذر الغفاري (رضي الله عنه).

## ( چل و چوار )
## دامەزراندنی ڕێکخراو و دامەزراوە خێرخوازیە ئیسلامیەکان

دامەزرانـدنی دەیـان ڕێکخـراوی خێرخـوازی لـە وڵاتـانی ئیسـلامیی و نێودەوڵـەتی دا لـە تـەواەی جیهانـدا، لەوانـە ڕێخـراوی مـانگی سـوور و ڕێکخراوەکانی پاراسـتنی مـافی مـرۆڤ فریاکـەوتنی لێقـەوماوان و یارمـەتی پەنابەران و.. هتد، لە کاتێکدا هیچ دەقێکی ڕاستەوخۆیان لـە سـەر نییـە، وە لـە سـەردەمی پێشـینەکاندا نـەبووە بـەڵام ئێسـتا لـە هـەموو دونیـای ئیسلامیدا بوونیان هەیە کە تێکڕایان سەرمایەکانیان بە پارەی صەدەقە و زەکـات و بەخشـینی خێرخـوازان یـان بودجـەی تایبـەتی دەوڵـەتان پێکدەهێنرێت و کەسیش نەیگووتووەتە بیدعەتێکی خراپە !

کـە بێگومـان ئـەم جـۆرە داهێنراوانـە تێکڕایـان بـا بەڵگـەی ڕاستەوخۆشیان لەسەر نەبێت بـەڵام لـە نێـو بەڵگـە گشـتییەکاندا جێگـەی دەبێتەوە لەوانە ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ [1].

## ( چل و پێنج )
## داهێنانی هەزاران شەریکاتی بەرهەمهێنان لە بواری فیلم و زنجیرە تەلەفزیونیدا بە مەبەستی دەعوەی ئیسلامیدا و بەخشینەوەی پارە لەو پێناوەدا

ئاشکرایە ئەمڕۆ لە کێك لە باشترین و چکترین داهێنانەکان بریتییە لـە دامەزرانـدنی هـەزاران شـەریکاتی وەبەرهـەمهێان لـە جیهـانی ئیسـلامیدا بەرهەمهێنان لە بواری بەرهەمهێنانی فـیلم و زنجـیرە تەلەفزیونیەکانـدا بـە

---

١. (سورة المائدة: ٢).

مەبەستی بواری بانگەشەو دەعوەی ئیسلامیدا، بە تایبەت سیرەتی پێغەمبەران و صەحابەو زانایان و مێژووی ئیسلامی بە گشتی بە مەبەستی فێربوون و سوودلێوەرگرتن لە پەیڕەوو کلتووری پێشینەکان.

هەروەها تەرخانکردنی ملیۆنەها دۆلار بۆ ئەو مەبەستە و هەروەها بۆ خۆتەرخانکارانی ئەو بوارە لە موسڵمانان لە نمونەی وەبەرهێنانی فیلمەکانی (الرسالة الإسلامية) و (عمر المختار) و.. هتد، هەروەها زنجیرە دراماکانی وەك: (محمد رسول الله) و (عمر الفاروق) و (عمر بن عبد العزيز) و (أصحاب الكهف) و..هتد، بە هەموو کەم وکورتیەکانیشیانەوە بە گشتی لە جۆری داهێنراوە باشەکانن بە تایبەت بۆ ئەمڕۆی لاوانی موسڵمان، لە کاتێکدا هیچ دەقێکی راستەوخۆش نییە لە قورئان و سوننەتدا بۆ بە شەرعی بوونی ئەو داهێنراوانەو جگە لە بەڵگە گشتییەکان نەبێت بۆ بانگەشەی ئیسلامی ئاشکرایە کە پێشینەکانیش نەیانکردووە چونکە میکانیزمی کاری دەعەوی بە حەتمی لە سەردەمێك بۆ سەردەمێکی تر دەگۆڕێت.

## ( چل و شەش )
## داهێنانی بە کرێگرتن بۆ بانگدان و ئیمامەت و ووتابێژی و وانە گوتنەوە

بێگومان لە ئەصڵی شەریعەتی ئیسلامدا هیچ دەقێك نییە کە باس لە دروستی پارەوەرگرتن بکات لە سەر ئەنجامدانی کاری خوداپەرستیو عیبادەت لەوانە پارەو معاش وەرگرتن لە بەرانبەر بانگدان و ئیمامەتکردن و ووتابێژی و وانە گوتنەوەو مردو شۆردن و قورئان خوێندن و..هتد، کە بە هیچ شێوەیەك پێشینەکان لە سەر هیچ جۆرە عیبادەتێك پارەیان

وەرنەگرتووە، بەڵام ئێستاو بۆ چەند سەدەیەکە ئەو کارانە لە گەڵ ئەوەدا کە عیبادەتن بووەتە پیشەو پارەی لە سەر وەردەگیرێت لـە بەرانبەریـدا، بێگومان فەتوای زانایانی لە سەرە چونکە ئەو کەسەی خۆی تەرخاندەکات بۆ ئەو کارانـە ناتوانێـت هـیچ کەسـابەتێکی تـر ئـەنجام بـدات، حـاڵی وەك حاڵی قازی شەرعی و کاربەدەستان و خەلیفەی ئیسلام وایە، ئاشکرایە کە لە سەردەمی خەلافـەتی راشـیدیندا ئـەو دوو مەنصـەبە دەوڵـەتی ئیسـلام ئەندازەیەك پارەی بۆ بڕیبوونەوە، ئەمەش قیاسە، پێشـتر باسمـانکرد کـە قیاسیش لە هەموو بابێکی شـەرعیدا دروسـتە، تەنانـەت ئـەمڕۆ ئـەو پـارە وەرگرتنە لە وولآتی سعودییەش بەرجەستە بووەو مەلاکانیان لە وەزارەتی تایبەت پارە وەردەگرن لە بەرانبەر ئیمامـەت و ووتاربێـژی و فـەتواو وانـە گوتنەوەو فێرکردنی قورئـان.. هتـد. کـە رای زۆربـەی زانایانیشـی لەسـەر کۆیە، وەك پێشەوا (القرطبي) لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: « وأجاز أخذ الأجرة على تعليم القرآن مالـك والشـافعي وأحمـد وأبـو ثـور وأكثـر العلمـاء لقوله عليه السلام في حديث ابن عباس ـ حديث الرقية ـ: (إن أحق ما أخـذتم عليه أجرا كتاب الله..».[1]

هـــەروەها (الشــيخ محمــد الأمــين الشــنقيطي) لـــە تەفســیرەکەیدا دەفــەرموێت: «وذهــب أكثــر أهــل العلــم إلى جــواز أخــذ الأجــرة علــى تعلــيم القرآن، وهو مذهب مالك، والشافعي. وممن رخـص في أجـور المعلمـين: أبـو قلابة، وأبو ثور، وابن المنذر. ونقل أبو طالب عـن أحمـد أنـه قـال: التعلـيم أحب إلي من أن يتوكل لهؤلاء السـلاطين، ومـن أن يتوكـل لرجـل مـن عامـة الناس في ضيعة، ومن أن يستدين ويتجر لعله لا يقدر على الوفـاء فيلقـى الله

١. الجامع لأحكام القرآن: للقرطبي: (٣٣٥/١).

تعالى بأمانات الناس، التعليم أحب إلي. وهذا يدل على أن منعه منه في موضع منعه للكراهة لا للتحريم" قاله ابن قدامة في المغني.. »[1].

هەروەها (الشيخ محمد الطاهر ابن عاشور) روونی كردووەتەوە لە تەفسیرەكەیدا دەفەرموێت: « مسألة أخذ الأجرة على تعليم القرآن والدين ويتفرع عنها أخذ الأجرة على تعليم العلم وعلى بعض ما فيه عبادة كالأذان والإمامة. وحاصل القول فيها أن الجمهور من العلماء أجازوا أخذ الأجر على تعليم القرآن فضلاً عن الفقه والعلم فقال بجواز ذلك الحسن وعطاء والشعبي وابن سيرين ومالك والشافعي وأحمد وأبو ثور والجمهور، وحجتهم في ذلك الحديث الصحيح عن ابن عباس(رضي الله عنهما) أن النبيء (ﷺ) قال: " إن أحق ما أخذتم عليه أجراً كتاب الله " وعليه فلا محل لهاته الآية(أي قوله تعالى: ﴿وَلَا تَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ [2] على هذا المعنى عندهم بحال" لأن المراد بالاشتراء فيها معناه المجازي وليس في التعليم استبدال ولا عدول ولا إضاعة. وقد نقل ابن رشد إجماع أهل المدينة على الجواز ولعله يريد إجماع جمهور فقهائهم. وفي «المدونة»: لا بأس بالإجارة على تعليم القرآن. ومنع ذلك ابن شهاب من التابعين من فقهاء المدينة وأبو حنيفة وإسحاق بن راهويه وتمسكوا بالآية وبأن التعليم لذلك طاعة وعبادة كالصلاة والصوم فلا يؤخذ عليها أجر كذلك وبما روي عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أن النبيء (ﷺ) قال: «دراهم المعلمين حرام» وعن عبادة بن الصامت أنه قال: «علمت ناساً من أهل الصفة القرآن والكتابة فأهدى إلى رجل منهم قوساً فسألت النبيء (ﷺ) فقال: " إن سرك أن تطوق بها طوقاً من نار فاقبلها

---

١. أضواء البيان في إيضاح القرآن بالقرآن للشنقيطي محمد الأمين بن محمد المختار بن عبد الجكني المتوفى ١٣٩٣هـ: (١٨١/٢).

٢. (سورة المائدة: ٤٤).

المؤمنين: رأيناك إذا شهدت مشهدا أو هبطت واديا أو أشرفت على أكمة قلت صدق الله ورسوله، فهل عهد إليك رسول الله شيئا في ذلك؟ قال: فأعرض عنا، والحفنا عليه فلما رأى ذلك قال والله ما عهد إلي رسول الله عهدا الا شيئا عهده إلى الناس، ولكن الناس وقعوا على عثمان فقتلوه، فكان غيري فيه أسوأ حالاً وفعالاً مني، ثم رأيت أني أحقهم لهذا الأمر فوثبت عليه، فالله أعلم أصبنا أم أخطأنا » [١].

٤- أخرج بإسناد صحيح أيضا عن ابن عباس(رضي الله عنهما) يقول: «صدق الله ورسوله(ﷺ): لو كان لابن آدم واديان من ذهب لابتغى الثالث..» [٢].

٥- أخرج البخاري في الأدب المفرد بإسناد صحيح عن ابن مسعود (رضي الله عنه) أنه قال: «صَدَقَ اللهُ وبلّغ رسوله » [٣].

٦- أخرج البيهقي عن عقبة بن عامر رضي الله عنه قوله: «صدق الله ورسوله إني سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ليقرأن القرآن رجال لا يجاوز تراقيهم يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية» [٤].

٧- أخرج ابن حبان وابن خزيمة في صحيحيهما بإسناد صحيح عن شفيا الأصبحي: أنه دخل مسجد المدينة فإذا هو برجل قد اجتمع عليه الناس فقال: من هذا؟ قالوا: أبو هريرة قال: فدنوت منه حتى قعدت بين يديه، وهو يحدث الناس، فلما سكت وخلا، قلت له: أنشدك بحقي لما حدثتني حديثا سمعته عن رسول الله (ﷺ) عقلته وعلمته، فقال أبو هريرة: أفعل

---

١. مصنف عبد الرزاق (١١ / ٤٤٩)برقم(٢٠٩٧١).
٢. الأحاديث المختارة للضياء المقدسي (٢ / ١٠٨).
٣. «الأدب المفرد للإمام البخاري، بتحقيق: محمد فؤاد عبدالباقي (١/٣٦٠)برقم(١٠٤٩).
٤. السنن الكبرى ت:محمد عبد القادر عطا (٣ / ٢٢٥)برقم(٥٦٤٩).

لأحدثنك حديثا حدثنيه رسول الله (ﷺ) عقلته وعلمته، ثم نشغ أبو هريرة نشغة فمكث قليلا ثم أفاق فقال: لأحدثنك حديثا حدثنيه رسول الله (ﷺ)، وأنا وهو في هذا البيت، ما معنا أحد غيري وغيره، ثم نشغ أبو هريرة نشغة أخرى، فمكث كذلك ثم أفاق، فمسح عن وجهه، فقال: أفعل لأحدثنك حديثا حدثنيه رسول الله (ﷺ) وأنا وهو في هذا البيت ما معه أحد غيري وغيره، ثم نشغ نشغة شديدة، ثم مال خارا على وجهه واشتد به طويلاً، ثم أفاق فقال: حدثني رسول الله (ﷺ): « أن الله تبارك وتعالى إذا كان يوم القيامة ينزل إلى العباد ليقضي بينهم، وكل أمة جاثية، فأول من يدعو به رجل جمع القرآن، ورجل يقتل في سبيل الله ورجل كثير المال، فيقول الله تبارك وتعالى للقارىء: ألم أعلمك ما أنزلت على رسولي (ﷺ)؟ قال: بلى يا رب، قال: فماذا عملت فيما علمت؟ قال: كنت أقوم به آناء الليل وآناء النهار، فيقول الله تبارك وتعالى له: كذبت، وتقول له الملائكة: كذبت، ويقول الله: بل أردت أن يقال: فلان قارىء فقد قيل ذاك، ويؤتى بصاحب المال فيقول الله له: ألم أوسع عليك حتى لم أدعك تحتاج إلى أحد؟ قال: بلى يا رب قال: فماذا عملت فيما آتيتك؟ قال: كنت أصل الرحم وأتصدق؟ فيقول الله له: كذبت وتقول الملائكة له: كذبت ويقول الله: بل إنما أردت أن يقال: فلان جواد فقد قيل ذاك، ويؤتى بالذي قتل في سبيل الله، فيقال له: في ماذا قتلت؟ فيقول: أمرت الجهاد في سبيلك فقاتلت حتى قتلت فيقول الله له: كذبت، وتقول له الملائكة: كذبت ويقول الله: بل أردت أن يقال: فلان جريء فقد قيل ذاك) ثم ضرب رسول الله (ﷺ) ركبتي فقال: (يا أبا هريرة أولئك الثلاثة أول خلق الله تسعر بهم النار يوم القيامة) قال الوليد بن أبي الوليد: فأخبرني عقبة أن شفيا هو الذي دخل على معاوية فأخبره بهذا الخبر، قال أبو عثمان الوليد: وحدثني العلاء بن أبي حكيم أنه كان سيافا لمعاوية قال: فدخل عليه رجل

فحدثه بهذا عن أبي هريرة، فقال معاوية: قد فعل بهؤلاء مثل هذا، فكيف بمن بقي من الناس؟ ثم بكى معاوية بكاء شديدا حتى ظننا أنه هالك، وقلنا: قد جاءنا هذا الرجل بشرّ، ثم أفاق معاوية ومسح عن وجهه فقال: صدق الله ورسوله: {من كان يريد الحياة الدنيا وزينتها نوف إليهم أعمالهم فيها وهم فيها لا يبخسون * أولئك الذين ليس لهم في الآخرة إلا النار وحبط ما صنعوا فيها وباطل ما كانوا يعملون» [١].

٨- أخرج مسلم في صحيحه عن محمد بن سيرين عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال: لازال الناس يسألونكم عن العلم حتى يقولوا: هذا الله خَلَقَنا فمن خلق الله؟ قال وهو آخذ بيد رجل فقال صدق الله ورسوله..» [٢].

٩- أخرج الحافظ عبد الرزاق في المصنف بسنده عن أبي سعيد الخدري قال: «اجتمع ناس من الأنصار، فقالوا: يؤثر رسول الله (ﷺ) علينا غيرنا فبلغ ذلك رسول رسول الله (ﷺ) فخطبهم ثم قال يا معشر الأنصار ألم تكونوا أذلة فأعزكم الله ورسوله، قالوا صدق الله ورسوله، قال: ألم تكونوا ضلالا فهداكم الله، قالوا صدق الله ورسوله، قال: ألم تكونوا فقراء فأغناكم الله ورسوله، قالوا: صدق الله ورسوله..» [٣].

---

١. صحيح ابن حبان بترتيب ابن بلبان بتحقيق الأرناؤوط (٢ / ١٣٥)برقم(٤٠٨) ورواه ابن خزيمة في صحيحه بتحقيق: د. محمد مصطفى الأعظمي (١١٥/٤)، قال المحقق: إسناده صحيح رجاله كلهم ثقات".

٢. صحيح مسلم (١٢٠/١)برقم(١٣٥).

٣. مصنف عبد الرزاق للحافظ أبي بكر عبد الرزاق بن همام الصنعاني، بتحقيق: حبيب الرحمن الأعظمي (٦٤/١١)برقم(١٩٩١٨).

١٠ـ أخرج الحافظ ابن سعد في طبقاتــه عـن زيـد بـن صوحان(رضــي الله عنه) قوله: «صدق الله، (الأعراب أشد كفرا ونفاقا وأجدر أن لا يعلموا حدود ما أنزل الله على رسوله) »[١].

١١ـ قال الحافظ ابن كثير في تفسيره ما نصه: « ولهذا قال تعالى: {ذَلِكَ جَزَيْنَاهُمْ بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ) أي عاقبناهم بكفرهم. قال الحسن البصري: صدق الله العظيم لا يعاقب بمثل فعله إلا الكفور»[٢].

١٢ـ أخرج المتقي الهندي عن علي بـن الحسـين (رضـي الله عنهمـا) أنـه كان إذا ختم القرآن حمد الله بمحامد... وقال: صـدق الله وبلغت رسـله وأنـا على ذلكم من الشاهدين اللهم صـل علـى جميـع الملائكـة والمرسـلين وارحـم عبادك المؤمنين من أهل السموات والأرض..»[٣].

١٣ـ قال الحافظ البيهقي:في (شعب الإيمـان) « التاسـع عشـر مـن شـعب الإيمان هو باب في تعظيم القرآن ـ قال أبو عبد الله الحليمي رحمه الله: و ذلك ينقسم إلى وجوه: منها تعلمه و منها إدمان تلاوته بعد تعلمه و منها إحضار القلب إياه عند قراءته و التفكر فيه و تكرير آياته و ترديدها أو استشعار ما يبهج البكاء من مواعظ الله ووعيده فيها و منها افتتاح القـراءة بالاسـتعاذة و منها قطع القراءة في وقته بالحمد والتصديق والصلاة على رسـول الله (ﷺ) و الشهادة له بالتبليغ..»[٤].

---

١. الطبقات الكبرى لابن سعد بتحقيق: إحسان عباس (٦ / ١٢٤).

٢. تفسير القرآن العظيم لابن كثير: (٣/٦٤٢).

٣. كنز العمال في سنن الأقوال والأفعال، المؤلف: علي بن حسام الدين المتقي الهندي(مرسل علي بن الحسين). (٢/٤٦٨)برقم(٤٢٢٠)

٤. شعب الإيمان لأبي بكر البيهقي (٢ / ٣١٩).

١٤ـ قال الإمام القرطبي: « قال ابن عباس: إذا عسر على المرأة ولدها تكتب هاتين الآيتين والكلمتين في صحيفة ثم تغسل وتسقى منها، وهي: بسم الله الرحمن الرحيم لا إله إلا الله العظيم الحليم الكريم، سبحان الله رب السموات ورب الارض ورب العرش العظيم: (كأنهم يوم يرونها لم يلبثوا إلا عشية أو ضحاها) (كأنهم يوم يرون ما يوعدون لم يلبثوا إلا ساعة من نهار بلاغ فهل يهلك إلا القوم الفاسقون). صدق الله العظيم »[1].

١٥ـ قال الإمام الحافظ الحكيم الترمذي في (نوادر الأصول) ما نصه: « وإذا انتهت قراءته أن يصدّق ربه، ويشهد بالبلاغ للرسل صلوات الله عليهم ويشهد على ذلك أنه حق، فيقول: صدقت ربنا وبلغت رسلك ونحن على ذلك من الشاهدين، اللهم اجعلنا من شهداء الحق، القائمين بالقسط، ثم يدعو بدعواته»[2].

١٦ـ قال الإمام حجة الإسلام الغزالي في بيانه لآداب التلاوة: «وليقل عند فراغه من القراءة صدق الله تعالى وبلغ رسول الله (ﷺ) اللهم انفعنا به وبارك لنا فيه الحمد لله رب العالمين وأستغفر الله الحي القيوم..»[3].

١٧ـ قال الإمام أبو طالب المكي في كتابه النفيس (قوت القلوب) (الفصل التاسع عشر) ما نصه: « وليقل عند فراغه من كل سورة: صدق الله

١. تفسير القرطبي: (١٦ / ٢٢٢).

٢. نوادر الأصول للحكيم الترمذي: ٣/ ٢٥٤).

٣. إحياء علوم الدين لحجة الإسلام (٢٧٨/١).

وبلّغ رسول الله، اللهم انفعنا به وبارك لنا فيه، الحمد لله رب العالمين، أستغفر الله الحق القيوم »[1].

١٨- قال المفسر القرطبي في تفسيره (الجامع لأحكام القرآن) مانصه: « فقد قال الله تعالى: (وفى السماء رزقكم وما توعدون) فإنا نقول: صدق الله العظيم، وصدق رسوله الكريم »[2]. وقال أيضا في بيانه لآداب رعاية حرمة القرآن الكريم: (ومن حرمته إذا انتهت قراءته أن يصدق ربه، ويشهد بالبلاغ لرسوله (ﷺ)، ويشهد على ذلك أنه حق، فيقول: صدقت ربك وبلغت رسلك، ونحن على ذلك من الشاهدين، اللهم اجعلنا من شهداء الحق، القائمين بالقسط، ثم يدعو بدعوات»[3].

١٩- قال الحافظ ابن كثير في كتابه (البداية والنهاية): « قال الله تعالى: (أفحكم الجاهلية يبغون ومن أحسن من الله حكما لقوم يوقنون) وقال تعالى: (فلا وربك لا يؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بينهم ثم لا يجدوا في أنفسهم حرجا مما قضيت ويسلموا تسليما) صدق الله العظيم»[4].

٢٠- قال الحافظ أبو الخير ابن الجزري في (النشر في القرءات العشر): «ورأينا بعض الشيوخ يبتدئون الدعاء عقيب الختم بقولهم: صدق الله العظيم وبلغ رسوله الكريم، وهذا تنزيل من رب العالمين ربنا آمنا بما أنزلت واتبعنا الرسول فاكتبنا مع الشاهدين»[5].

---

١. قوت القلوب في معاملة المحبوب ووصف طرق المريد إلى مقام التوحيد للإمام الشيخ محمد بن علي بن عطية الحارثي المشهور بأبي طالب المكي المتوفى ٣٨٦هـ، ضبطه وصححه: باسل عيون السود: (١/١١٣).

٢. تفسير القرطبي (الجامع لأحكام القرآن) (١٣ / ١٥).

٣. (تفسير القرطبي (١/٢٧).

٤. البداية والنهاية لابن كثير (١٣ / ١١٩).

٥. النشر في القراءات العشر لابن الجزري (٢ / ٥٠٨).

٢١ـ قال الإمام نظام الدين النيسبوري في تفسيره (غرائب القرآن): «وأما سبب عدم انتفاع الكافر والعاصي بالإيمان والتوبة بعد المفارقة، فذلك أن محل الكسب هو الدنيا، والتكليف بامتثال الأوامر والنواهي إنما وقع فيها. فليس لأحد أن يؤخر الامتثال إلى الآخرة. ألا ترى أنه لو قال طبيب حاذق لمريض: اشرب الدواء الفلاني في اليوم الفلاني فقصر وأخر حتى إذا مضى وقته وأشرف على الهلاك قال: إني أشرب الآن، لم ينفعه ذلك الدواء ولا يسعه إلا الهلاك ؟ وكذا لو قال ملك لواحد: افعل الأمر الفلاني في هذا الوقت ففعله في وقت آخر لم يعد ممتثلاً ولا ينفعه الائتمار به لأن غرض الامتثال قد فات، ولا سيما إذا فعل بعد أن يرى أمارات الغضب وعلامات العذاب) فلم يك ينفعهم إيمانهم لما رأوا بأسنا سنت الله التي قد خلت في عباده، وخسر هنالك الكافرون) صدق الله العظيم»[1].

٢٢ـ ويقول الشيخ (علي الضباع بن محمد بن حسن بن إبراهيم المصري): في كتابه: (فتح الكريم المنان في آداب حملة القرآن) « ويستحب للقارىء إذا انتهت قراءته أن يصدق ربه ويشهد بالبلاغ لرسوله (ﷺ) ويشهد على ذلك أنه حق فيقول: صدق الله العظيم، وبلغ رسوله الكريم، ونحن على ذلك من الشاهدين»[2].

---

١. غرائب القرآن ورغائب الفرقان للنيسابوري نظام الدين الحسن بن محمد بن حسين القمي بتحقيق: الشيخ زكريا عميران (١/١٥٨).

٢. فتح الكريم المنان في آداب حملة القرآن للشيخ علي الضباع بن محمد بن حسن بن إبراهيم المصري (ص ٤).

٢٣ـ قال العلامة محمد الأمين الشنقيطي في تفسيره: « وإنهم ليعلمون أن لها خالقا مدبرا ولكنهم يكابرون {وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنْفُسُهُمْ} صدق الله العظيم وكذب كل كفار أثيم» [١].

ئەمانەو دەیان بەڵگەی تر هەیە لە تەواوی سەرچاوەکانی تەفسیر و فەرموودە و فیقهی ئیسلامی دا کە تێکڕایان جەخت لە سەر شایستەیی و ئیستیحبابی گوتنی (صدق الله العظیم و صدق رسول الله) دەکەنەوە بە تایبەت پاش دۆعای خەتمی قورئان..

بەو پێیەش سەلما کە ئەو دۆعایە واتە (دعاء ختم القرآن) لە سێ لایەنیەوە، واتە: لایەنی زیادکردن وکەم کردنی، لایەنی خەڵك کۆکردنەوە بۆی، لایەنی خوێندنی لە پاش تەراویحی رەمەزاناندا، بەشێکی ترن لە داهێنراوە چاکەکان و تێکڕاشیان عیبادەتیشن و هیچ کەسێکی باوەڕپێکراویش نەیگووتووە بیدعەتێکی خراپە.

بە تەواو بوونی ئەم شەست و سێ عیبادەتە داهێنراوانەی کە رابوورد وباسمانکردن بە بەڵگەوە و سەلەف و خەلەف لە زانایانی ئوممەتی ئیسلام هەستاوون پێی و ئەنجامیان داوەو دایانهێناوە. سەلما بۆمان راستی ودروستی تەقسیمی زانایانی فیقهی ئیسلامی بۆ کاری داهێنراو، بەو پێیەش داوای بەرهەڵستکارانی ئەو حەقیقەتانە پووچەڵ بوویەوە. بێگومان خوداش هیدایەتی ئەهلی ئیمان دەدات بۆ سەر رێگەی حەق، وەك دەفەرموێت: ﴿فَهَدَى اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا لِمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِهِ وَاللَّهُ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾ [٢] (والحمد لله رب العالمين).

---

١. أضواء البيان للعلامة شنقيطي: (٨/٤٣٦).

٢. (سورة البقرة: ٢١٣).

## توێژینەوەیەکی شیتەڵکاری گرنگ لە بارەی فەرموودەی:
## «أما والله أني لأخشاكم لله، وأتقاكم له، لكني أصوم وأفطر وأصلي وأرقد وأتزوج النساء.. » لە تەك چەند تێبینییەکدا

ماوەتەوە بڵێین: رەنگە هەندێ کەس بڵێت: خۆ هەندێك لەو داهێنراوانە راستەخۆ عیبادەت نییە!

لە وڵامدا دەڵێین: تەنها چەند دانەیەکیان راستەوخۆ عیبادەت نییە، بەڵام ئەوانیش نا راستەخۆ دەبنە عیبادەت یان ئامرازن بۆ عیبادەت، یان عیبادەت دەوەستێتەوە لە سەر بوونیان، بەو پێیەش لە بەشی عیباداتدا تێکڕایان هەژماردەکرێن وهەموشیان داهێنراون وموسڵمانانیش پابەند بوون پێیانەوە.

هەروەها هەندێك رەنگە بڵێن: لەو مەسئەلانەدا هەندێکیان دەچنە قالبی بەرژەوەندی مورسەلەوە بۆیە دروستە بە بەڵگەی (المصلحة المرسلة) بسەلمێن، نەك (البدعة الحسنة)، ئێمەش دەڵێین: ئەوانەی کە رەنگە بچنە ئەو بابەوە چەند دانەیەکن لەو شەست وسێ عیبادەتە داهێنراوەوە، ئەم قسەشتان ئەوە دەسەلمێنێت کە دروستە داهێنانی عیبادەت لە بەر بەرژەوەندییەك کە شەریعەت قسەی نەبێت راستەوخۆ تیایدا نە بە باش نە بە خراپ نە بە (إعمال) نە بە (إهمال)، بەو پێیەش دەسەلمێت هەموو ئەو کارە جوانە داهێنراوانانەی کە موسڵمانان دایانهێناون لە نمونەی یادەکانی مەولوودنامە ومیعراج نامە وهیجرەت و..هتد، دەکرێت بچنە بابی (المصلحة المرسلة)وە، چونکە دەیان بەرژەوەندی راستەوخۆی موحەققەقی تیادا بەدی دەکرێت، لە گەڵ ئەوەشدا ئێمە هیچ لەو داهێنراوانەمان بە بەڵگەی (المصلحة المرسلة)

نەسەلماندووە، چونکە بەڵگەی بەهێزتر هەبوون، لەوانە (عموم الأدلة) لە تەك بەڵگەکانی (سن الأمور الحسنة). پاشان کێشەیەکیش نییە ئەگەر داهێنراوە چاکەکان فاکتەر وهۆکار لە قەیدا بوونباندا بەرژەوەندی موسڵمانان بوبێت چ دینی چ دونیایی. گرنگ ئەوەیە کە ناتوانرێت بەو شەست وسیٚ داهێنراوە بگوترێت بیدعەتی خراپ، ئەوەش کە لێرەدا مەجالمان نەبووە باسیان بکەین لە گەڵێك داهێنراوی چاکی تر لە عیباداتدا قیاسیان دەخرێتە سەر ئەوانەی کە باسکراون لە ئیستیحباب وشایستەییدا، گرنگ نییە ناوی (المصلحة المرسلة)بێت یان (البدعة الحسنة).

هەروەها رەنگە بگوترێت: هەندێکیان خودی پێغەمبەر(ﷺ) ئیقراری لەسەر کردوون، کەواتە دەبنە سوننەتی تەقریری، دەڵێن راستە، بەڵام:

أ- ئەو داهێنراوانەی کە ئیقرایان لە سەر کراوە لە مەجموعی شەست وسیٚ دانەکە تەنها چەند دانەیەکن.

ب - مەبەستمان لە هێنانەوەی ئەو چەند دانە داهێنراوانە ئەوەیە بەر لەوەی ئیقراریان لە سەر کرا بێت خودا(جل جلاله) پاداشتی داونەتەوە وەك پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە، وەك داهێنانی دوو رکاعەتی پاش دەستنوێژی حەزرەتی بیلال(رضي الله عنه).

ج - کەواتە ئیقراری پێغەمبەر(ﷺ) تەنها بۆ دڵنییایان بووە.

د - هەندێکیش لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) کە شتەکەیان دامەزراندووە پێش ئەوەی کە ئیقرارەکە ببیستن وەفاتیان کردووە وەك داهێنانی حەزرەتی خوبەیب (رضي الله عنه) بۆ دوو رکاعەتی شەهادەت.

کەواتە تەنها شتێك کە پێغەمبەر (ﷺ) نارازی بوو بێت بە داهێنانی لە عیباداتدا بریتیی بووە لە ژیانی رەهبانییەت (الرهبانية والتبتل

والانقطاع التام للعبادة) چونكه ڕەهبانییەت لە ئیسلامدا نییە بەڵكو ڕەببانییەت هەیە، وەك پێشەوا (أبو الحسن الندوي) لە كتێبەكەیدا ڕوونی كردووەتەوە بە ناونیشانی (ربانية لا رهبانية).

بۆیە ئەو چیرۆكەی كە وەهابیەكان دەیهێننەوە بە بەڵگە بۆ دروست نەبوونی داهێنان لە عیباداتدا، هیچ پەیوەندییەكی بەم مەسئەلەیەوە نییە.

چیرۆكەكەش وەك لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە: « عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) قال: جاء ثلاث رهط إلى بيوت أزواج النبي (ﷺ) يسألون عن عبادة النبي (ﷺ) فلما أخبروا كأنهم تقالوها فقالوا: أين نحن من النبي (ﷺ)؟ قد غفر الله له ما تقدم من ذنبه وما تأخر، قال أحدهم: أما أنا فإني أصلي الليل أبدا، وقال آخر: أنا أصوم الدهر ولا أفطر، وقال آخر: أنا أعتزل النساء فلا أتزوج أبدا، فجاء رسول الله (ﷺ) فقال (أنتم الذين قلتم كذا وكذا؟ أما والله أني لأخشاكم لله وأتقاكم له لكني أصوم وأفطر وأصلي وأرقد وأتزوج النساء فمن رغب عن سنتي فليس مني» [1] واتە: « سێ كەس هاتنە خزمەت ماڵەكانی پێغەمبەر خودا (ﷺ)وپرسییان دەربارەی چەندیەتی وچۆنیەنی عیبادەتی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانیش بۆیان باسكردن، ئەمانیش بەكەم هاتە بەرچاویان، بەڵام تەئویلیان كرد بەوەی كە ئەمان لە كوێ وپێغەمبەری خودا(ﷺ) لە كوێ؟ كە خودا لە گوناهی پاشتر وپێشتری خۆش بووە! بۆیە بە نییەتێكی پاك بڕیاریان دا، یەكێكیان گوتی: عەهد بێت هەتا ماوم من بە شەودا نەخەوم وتا بەیانی شەو نوێژ بكەم! دووەمیان گوتی: منیش شەرت بێ هەموو ڕۆژگار تا ماوم بەڕۆژوو بم وهەرگیز نەیشكێنم! سێ یەمیشیان بڕیاریدا وگوتی: منیش شەرت بێت

١. صحيح البخاري (١٩٤٩/٥)برقم(٤٧٧٦».

تـوخنی ژن نەکەومـەوە وژن نـەهێنم! لـەم کاتـەدا خۆشەویسـت (ﷺ) تەشریفی هێنا وفەرمووی: ئێوە بوون ئاوا وئاواتان دەگوت؟! دەی بزانن کە من سوێند بێت بە خودا لە ئێوە لە خواترس تر وبە تەقواترم، لـە گـەڵ ئەوەشدا بەرۆژوو دەبم ودەشی شکێنم، شەو نوێژیش دەکەم ودەشـخەوم، وژنیش دێنم، ژن هێنان سوننەتی منە وهەرکەسێك لە سوننەتی من لابدات لە من نییە ».

وەك گوتمـان ئـەو چـیرۆکە هـیچ پەیوەنـدی بـە نادروسـتی داهێنـانی چاکەوە نییە لە عیباداتدا، بـەڵکو قەدەغـەکردنی پێغەمبـەر(ﷺ) بـۆ ئـەو شتانە لە بەر ئەم هۆیانەی خوارەوە بووە:

١ـ بۆ ئەوەی کە رەهبانییەت پەیدا نەبێت لە نێو موسڵماناندا وپاشـتر وەك نەصرانیەکان نەتوانن پابەند بن پێیەوە وخودا سەرزەنشتیان بکـات وەك سەر زەنشتی ئەوانی کـرد. بۆیـە پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی پێیـان: «أما والله أني لأخشاكم لله وأتقاكم له لكـني أصـوم وأفطـر وأصـلي وأرقـد وأتزوج النساء فمن رغب عن سـنتي فلـيس مـني». واتـە لـە خـودا ترسـان وتەقوای خودا بریتی نییە لەوەی کە بەردەوام نوێژو رۆژوو بگرن ونەخەون وژن نەهێنن. خۆ ئێوە نا بن بەمن، کەچی من بەو شێوەی ئێوە ناکەم کـە نییەتانە بیکەن وبەرۆژووش دەبم و..هتد.

٢ـ چونکە ئەو سێ هاوەڵە بەرێزە قیاسێکی نا دروستیان کرد، چونکە بە حیسابی خۆیان گوتیان ئەوەی پێغەمبـەر (ﷺ) دەیکـات لـە عیبـادات کەمە، وەك دەڵێت: (تقالوها)، بەکەم هاتە بەرچاویان، بێ گومان ئەمـەش وا نەبوو چـونکە بـاش حـاڵی نـەبووبوون، بۆیـە بـە نییـەتی پـاکی خۆیـان گوتیان ئەبێ ئێمە لـەو(ﷺ) زیـاتر عیبـادەت بکـەین، چـونکە ئـەو (ﷺ) خودا لە گوناهی هەوەڵ وئاخیری ئەو خـۆش بـووە، بـەڵام بـەو شـێوە لـە

ئێمە خۆش نەبووە، کەواتــە پێویستـە ئێمـە لـەو عیبـادەت زیـاتر ئـەنجام بدەین! کە ئەمەش بێگومان قیاسێکی (مع الفارق) بـوو، وە مـەفهوومێکی نا دروسـت بـوو بـە نیسـبەت ئەوانـەوە، چونکە هەرچـەندێك هـەوڵ بـدەن ناتوانن وەك پێغەمبەر(ﷺ) عیبادەت ئەنجام بدەن، ئیتر چۆن بتوانن لەو زیاتر! بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هەم حاڵی بوو لە تێنەگەشتنەکەی ئـەوان و نـا دروستی قیاسەکەیان، هـەم بـە بـەزەییش بـوو پێیـان ودەیتزانـی هـەرگیز ئەوان ناتوانن ئەوەی مەبەستیانە ئەنجامی بدەن، چونکە خـەیاڵ شـتێکەو جێ بەجێ کردنیش شتێکی تر!

٣ـ ئەو شـتانەی ئـەوان دەیـان ویسـت ئـەنجامی بـدەن ودایبهێـنن لـە تەواناى هیچ کەسێکدا نـە بـوو بۆیـە پێغەمبـەر (ﷺ) هـەر لـە سـەرەتاوە قەدەغەی کرد لێیان. بە پێچەوانەی داهێنراوەچاکەکانی تر لە لـە تـەواناى موسڵمانانـدا هەیە.

٤ـ ئـەو شـتانەی ئـەوان دەیانویسـت ئـەنجامی بـدەن دەبوویـە هـۆی زەرەر لە لاشەو بەدەنیان ئەوەش نەخوازراوە لە شەریعەتی ئیسلامدا بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) نەهی لێ کردن. بە پێچەوانەی داهێنراوە چاکەکانی تر.

٥ـ ئەوشتانەیان بەڵی بە نییەتی خۆیان چاکە، بەڵام زیادە ڕەوییە لـە عیباداتدا، ئەو زیادە ڕەویـەش پـێی دەگوترێـت (غلـو) وڕۆچـوون، ئـەوەش دروست نییە لە ئیسلامدا، چونکە کاریگەری پێچەوانەی دەبێت لە سەریان وئیسلامیش ئایینی میانە ڕەوییە(دین الوسطية).

٦ـ ئەو شتانەی کە ویستیان ئەنجامی بدەن بە نییازی ئەوە بـوون کـە لە سەر خۆیان واجبی بکەن، ئەوەش نا دروستە لە داهێنـراوە چـاکەکاندا. هەروەها نەزریش بۆ خۆی کەراهەتی هەیە، چونکە ڕەنگە کـابرای نـەزرکار پاشـا نەزرەکـەی بـۆ نەچـێتە سـەر، ئـەوکاتیش گوناهبـار دەبێـت،

پێغەمبەریش (ﷺ) دەیزانی ئەو نەزرانەیان بۆ ناچێتە سەر بۆیە قەدەغەی فەرموو لێیان. چونکە سیغەو دەستەواژەکانیان لە چوارچێوەی نەزرو واجب بووندا خۆی دەبینێتەوە با ووشەی نەزریشی بە سەراحەت تیادا نەبێت.

٧ـ بەشێك لەو شتانەی کە ویستیان دایبهێنن دەبوونە هۆی لابردنی سوننەتێکی جەخت لە سەر کراوەی ئیسلام، کە سوننەتی ژن هێنانە، کاری داهێنراویش هەرکات بوویە هۆی لابردن ورەفعی سوننەتێکی موئەککەدەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوا دەبێتە بیدعەتێکی خراپ، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کرد لێیان. بە پێچەوانەی داهێنراوە چکەکانەوە کە لە لایەن زانایانی سەلەف وخەلەفەوە داهێنراون وکاریان پێدەکرێت.

٨ـ پێغەمبەر (ﷺ) تەنها ئەو سێ شتەی لێ مەنع کردن، ئەوەش وەك ئەو سێ شتە وابێت بە قیاس لەسەری قەدەغەدەکرێت، وەك ئەوەی کە یەکێك لە سەر خۆی نەزر بکات کە هەموو ساڵێك بچێتە حەج، کە ئەوەش باش نییەو پێغەمبەر (ﷺ) کە پرسیاریان لێ کرد دەربارەی: ئایا حەج واجبە لە سەر مان هەموو ساڵێك؟ پێی ناخۆش بوو فەرمووی پرسیار مەکەن، ئەگەر بمگوتایە بەڵێ واجب دەبوو لە سەرتان. « نعم، لو قلتُ لوجبتْ»(١)، هەروەها وەك ئەوەی کە یەکێك بییەوێت هەموو ماڵی خۆی

---

١. أخرج مسلم عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال خطبنا رسول الله (ﷺ) فقال: أيها الناس قد فرض الله عليكم الحج فحجوا فقال رجل أكل عام؟ يا رسول الله فسكت حتى قالها ثلاثا فقال رسول الله (ﷺ) لو قلت نعم لوجبت ولما استطعتم ثم قال ذروني ما تركتكم فإنما هلك من كان قبلكم بكثرة سؤالهم واختلافهم على أنبيائهم فإذا أمرتكم بشيء فأتوا منه ما استطعتم وإذا نهيتكم عن شيء فدعوه». صحيح مسلم: (٩٧٥/٢)برقم(١٣٣٧).

ببەخشێت لە راهی خودا، بەو پێیەش وەرەسەکەی مەحرووم دەبن لە میرات بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کرد لە (سعد بن أبي وقّاص) کە ئەو کارە بکات، وە فەتوای تەنها بە سێ یەکی ماڵەکەی بۆ دا. «فالثلث والثلث كثير»[1]. کەواتە شتی تر قیاس ناکرین لە سەر ئەمانە ئەگەر وەك ئەمانە نەبوو، بۆیە ئەمانە بە دەقی تایبەت حەرام کراوون، حەرامکردنیش پێویستی بە دەقی تایبەت هەیە، وەك لەمەو دواش روونی دەکەینەوە بە بەشێکی سەربەخۆ.

٩ـ ئەو شتانە بە دەقێکی ئاشکراو صەریح پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کردووە بۆیە هەموو یەك دەنگین کە نا بێت موسڵمانان بەو شێوازە عیبادەت بکەن، بەڵام هیچ دەقێکی راستەو خۆ نییە لە سەر داهێنراوە چاکەکانی تر هەتا قەدەغەیان لێ بکرێت، ئەگەر دەڵێن بە قیاس لە سەر ئەمانە، دەڵێین:

یەکەم: قیاس کردن لە عیباداتدا خۆ لای ئێوە نا دروستە، چۆن لێرەدا بۆ تەحریم قیاس لە سەر عیبادات دەکەن.

دووەم: قیاسەکەشتان نا دروستە چونکە (قياس مع الفارق)ە، لە بەر چوار جیاوازیە:

---

١. روى البخاري في صحيحه عن عامر ابن سعد عن سعد بن أبي وقاص رضي الله عنه قال: جاء النبي (ﷺ) يعودني وأنا بمكة وهو يكره أن يموت بالأرض التي هاجر منها قال: « يرحم الله ابن عفراء ». قلت يا رسول الله أوصي بمالي كله ؟ قال (لا). قلت فالشطر ؟ قال (لا). قلت الثلث؟ قال: « فالثلث والثلث كثير إنك إن تدع ورثتك أغنياء خير من أن تدعهم عالة يتكففون الناس في أيديهم وإنك مهما أنفقت من نفقة فإنها صدقة حتى اللقمة التي ترفعها إلى في امرأتك وعسى الله أن يرفعك فينتفع بك ناس ويضر بك آخرون). ولم يكن له يومئذ إلا ابنة». صحيح البخاري (٣ / ١٠٠٦)برقم(٢٥٩١).

أ داهێنـراوە چـاکەکانی موسـڵمانان لـە بـابی رەهبانییـەت نییـە، بـە پێچەوانەی ئەو سێ کارەی ئەوان.

ب - داهێنـراوە چـاکەکان بەڵگـە گشـتییەکان دەیانگرێتـەوە. بـە پێچەوانەی ئەو شتانەی ئەوانەوە کە ویستیان دایبهێنن.

ج - هەموو داهێنراوێکیش لە عیباداتـدا رەهبەنـە نییـە، ئەگـەر نـا زۆر ترینی داهێنراوەکانی صەحابیەکان لە عیباداتدا پێغەمبـەر (ﷺ) ئیقراری لە سەر نەدەکرد، ئەوەش بەڵگەیە کە هەموو داهێنراوێك رەهبانییەت نییە تا بیدعەت بێت.

د- داهێنـراوە چـاکەکان لـە نموونـەی ئـەو شەسـت وسـێ داهێنـراوە دژایـەتیان نییـە لـە تـەك قاعیـدە گشـتییەکانی شـەریعەتی ئیسـلام، بـە پێچەوانەی ئەو سێ کارەی کە ئەو سێ صەحابە بەڕێزە ویستیان ئەنجامی بدەن.

کەواتە روون بوویەوە کە بەڵگەی وەهابیەکان لە شوێنی خۆیـدا نییـە، قیاسەکەشیان قیاسێکی (مع الفارق)ە کە بە تێکڕای ئوصولیەکان بەتاڵـە، چونکە وەك قیاسی مەشکێك لـە کەشـکێك وەهایـە، واتـە: ئـەو فـەرموودە بەڵگەیە بۆ شتێك ئەوان دەیهێننەوە بۆ شتێکی یان (جهلاً) یـان (تجـاهلاً)، هەروەها بەو جۆرە بەڵگە هێنانەوەی وەهابیەکان - کە بەداخـەوە زۆربـەی زۆری بەڵگـەکانیان لـەم چەشـنەیە - لای ئوصـولیەکان وزانایـانی (البحـث والمناظرة) پێی دەگوترێـت: (الاسـتدلال علـى الشـيء بمـا هـو أجـنبي عـن موضع الخلاف)، واتە بەڵگە هیچنانەوە لـە سـەر شـتێك کـە بـە شـتێك کـە نامۆو بییانییە بە جێگەی خیلافەکە، لە بەر ئەوەی بە باشی حاڵی ببن، بە پێویستم زانی ئەو روونکردنەوەی لە سەر بدەم (والله الموفق للصواب).

## تەوەری دووەم:

## نمونەی چەند بیدعەیەكی حەسەنە لە بابی موعامەلات و حوكم و ئیدارە وئابووریدا

( **یەكەم** ) داهێنراوەكانی ئاڵوگوڕ لە نمونەی: (بۆرصە وسەهم وسـەنەد و وەرەقـی كاغـەز ومەعـدەن وچـەك وناوەنـدەكانی بانـك و..هتـد، كـە لـە تێكڕای وڵاتانی ئیسلامیدا كاری پێ دەكرێت وتێكڕاشی لە جۆری بیدعەی حەسەنەیە بە مەرجێك دووربێت لە جۆرەكانی ریباو تەعامولی نا شەرعی.

( **دووەم** ) دامەزراندنی زۆرێك لە گرێبەستی تازەو لە بواری ئـاڵ وگـۆڕدا كە زۆرێك لە شێوازی عیبادەت تێكڕایان بیدعـەت وداهێنـراون، هەموشـیان پێویست وفەتوا لە سەردراون، لەوانە: (بیع المعاطاة) واتە كـڕین وفرۆشـتن بە بێ ئیجاب وقەبوول.

( **سێیەم** ) بیدعەتی حەسەنەی (البیع بالتقسیط) واتە: كاڵا فرۆشتن بـە قیستی مانگانە یان سـاڵانە كـە فـەتوای لـە سـەر دراوە وهـیچ كێشـەیەكی نییە بە مەرج وداڕشتە شەرعییەكانی خۆی.

( **چوارەم** ) وەرگرتنـی زەریبـەی جـۆراو جـۆر بـە تایبـەت لـە (استراد وتصـــدیر)ی كاڵاكانـــدا كـــە پـــەیڕەو دەكرێـــت لـــە لایـــەن دەوڵـــەتانی ئیسلامییەوە، ولە كۆتاییەكانی دەوڵەتی عوسمانییەوە تا ئـەمڕۆش پیـادە دەكرێت كە فەتوای حەنەفیەكانی لە سەرە، كە پێیان وایە دروستە ئەگـەر لە بەیتولمالـدا بەشـی پێویسـتی دەوڵـەت نـەبوو، بـۆ مەسـورفاتی جیهـاد وجگە لە جیهادیش، لە كاتێكدا ئەم جۆرە زەریبانە نەبوە لە كۆندا، بـەڵام

ئێستا وەك زەرورەتێکی لێ هاتووە بۆ هەڵسوڕانی بەرژەوەندی هاوڵاتیان ودەوڵەتانی ئیسلام [1].

( **پێنجەم** ) دانانی سنوور لە نێوان دەوڵەتانی ئیسلامیدا پاش شەڕی جیهانی دووەم وتا ئەمڕۆش لە تەك سەربەخۆیی میللەتانی ئیسلامی جگە لە میللەتی کورد [2]، هەروەها دانانی سوپاو پێکهێنانی حکومەت وسەفارەتەکان وفیزەو..هتد، کە ئەم شێوازەی ئەمڕۆ هیچی لە کاتی خۆیدا نەبووە، بەڵام لە ئێستادا بووتە پێداویستی وزەروورەت وکەسیش ناڵێت بیدعەتە بە ووڵاتی سعودیشەوە. کە سیستەمێکی مەملەکە پیادەدەکات کە زۆر جودا لە تەك سیستەمی حوکمڕانی لە ئیسلامیدا.

( **حەوتەم** ) دامەزراندنی (کواڵیتی باش ودڵنیایی جۆری) بۆ هەر بەرهەمێکی هاوردە لە دەرەوەی ووڵاتەوە بە مەبەستی رەچاوکردنی تەندروستی تاك وکۆمەڵگا.

( **هەشتەم** ) هەروەها داهێنانی مافی لە چاپدان ویاساکانی تایبەتمەند بە چاپ وبڵاوکردنەو وتوێژینەوە وداهێنان تێکڕایان لە بیدعەتی حەسەنەیەو مەبەست لێیەوە پارێزگاری کردنە لە مافی نووسەر وتوێژەر وداهێنەر.

---

١. بۆ درێژەی ئەو بابەتە بنوارە: الموسوعة الفقهية الكويتية: (٨/٢٤٧).

٢. ئەڵبەتە نەبوونی کوردستانیش بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ ستەمێکی گەورە بووە کە لەم میللەتە کراوە و هەل و مەرج و هۆکاری دەرەکی و ناوەکی خۆی هەبووە، ئێستا هەل ومەجەکان ئامادەیە بۆ راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی لە باشوری کوردستاندا و هیچ ئاستەنگێی شەرعیش لەو روانگەوە لە بەردەمدا نییە، وەك بە درێژی روونمان کردووەتەوە لە توێژینەوەیەکدا بە ناوی: (حق استقلال كوردستان في نظر الشريعة الإسلامية ـ دراسة شرعية تاريخية تحليلية سياسيةـ أ.م. د. حسن خالد مصطفى محمود المفتي، بڵاوکراوەتەوە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژمارە(٢١) ساڵی ٢٠١٢ز، لاپەڕە(٤٥٣ ـ ٥١٦).

( **نۆیەم** ) دامەزراندنی جۆرەکانی سیستەمی حوکم رانی سیاسی وولات، مەلەکی، مەلەکی دەستوری، مەلەکی بەرلەمانی، جومهوری، سەربەخۆیی، فیدارالی، کونفیدرالی، هەروەها دامەزراندنی ئەنجومەنی نیشتمانی وئەنجومەنی وەزیران وئەنجومەنی قەزا (السلطة التشريعية والسلطة التنفيذية والسلطة القضائية)..هتد. هەموو ئەمانە بیدعەتی رامیارین لە سستەمی حوکمڕانیدا وتەواوی موسڵمانانیش بۆ زیاتر لە یەك سەدەیە پیادەی دەکەن بە (المملكة العربية السعودية)شەوە، کە بە پێی دەقە شرعییەکان ئەو جۆرە حوکمڕانییە نادروستە، چونکە حوکمڕانی بەو چەشنە لە سەردەمی پێشینەکاندا - پێغەمبەرو(ﷺ) هاوەڵانی - نەبووەو لە جۆری بیدعەتە، ئەگەر چاك بوو چاکەو ئەگەر خراپیش بوو ئەوا خراپە، بەڵام ئەگەر وەهابیەکان راست دەکەن بیدعەتی چاك نییە ئەی چۆن تەئصیلی حوکمڕانی مەملەکەو عەرەبچییەتی وخێڵایەتی دەکەن، مەگەر بانێکەو دوو هەوا؟!

( **دەیەم** ) دامەزراندنی دەیان جۆر لە ئامێری تازەی بەرهەمهێنەر بە مەبەستی جێگرتنەوەی کاری دەست، لە نمونەی ئامێری سەربڕینی پەلەور وئامێری هێلکە هەڵهێنان وئامێری دۆشینی شیری گیانلەبەران و..هتد. کە هیچ کام لەم ئامێرانە نەبوون وهەموشی ئێستا بوونەتە پێداویستی بە تایبەت بۆ کارخانەگەورەکان.

( **یازدە** )بەرهەم هێنانی دەیان جۆر لە خواردەمەنی وسەوزەی تازە لە رێگەی گرتنەبەری رێگا زانستییە سەردەمەکانەوە، کە دەیان ئەکادیمیای زانستی لەو بوارە کاردەکەن بە مەبەستی بەرزکردنەوەی ئابووری وولات وبەرەوپێش بردنی چاکسازی چونیەتی وچەندیەتی بەرهەمەکان بە تایبەت لە بواری خواردنـدا، کە ئەمڕۆ پێی دەگوترێت ئاسایشی خواردەمەنی.

چونکە لە ئیسلامدا گرنگ ئەوەیە خواردنەکان پاك وحەڵاڵ بن وبە ڕێگەی حەڵاڵ وەبەرهەم بێت، ئیتر چۆن وچەند وەبەرهەم دەهێنرێت کێشەیەك نییە، هەروەها گرنگ ئەوەیە ئیسرافیان تیادا نەکرێت، ئیتر چۆن دەخورێت لە سەر کورسی یان لە سەر زەوی، لە سەر سینی یان لە سەر سفرە، بە سورەکراوی یان برژاوی یان کوڵاوی یان کاڵی کێشەیەك نییە، باکاتی خۆشی بەو شێوازو چۆنیەتی وچەندیەتیانەی ئەمڕۆ نەبوبێت، بەجێ دەهێڵدرێت بۆ تەبیعەت وویستی خەڵکەکە.

(**دوازدە**) دروستکردنی دیناری ئیسلامی وئاڵ وگۆڕکردنی شت ومەك پێی یەکێکی ترە لە بیدعەتە چاکەکان ولە سەردەمی ئەمەویەکاندا داهێنراو، بە تەحدید لە سەر فەرمانی (عبد الملك بن مروان) لە ساڵی ٧٤ کۆچیدا. بە چاوکردن لە دەوڵەتی ڕۆمەکان، چونکە لە جەزیرەی عەرەبدا دراوێکی سەربەخۆ نەبوو پێشتر جگە لە دراوی ڕۆمەکان وفارسەکان، بۆ سەربەخۆیی ئابووری دراوێکی ئیسلامییان داهێناو کەسیش نەیگووت ئەمە بیدعەتە [(١)].

(**سیازدە**) داهێنانی گرێ بەستی شت دان بەدروستکردن، واتە زانایانی فیقهی ئیسلامی فەتوایان داوە بە (عقد الاستصناع)، لە کاتێکدا بە پێی قاعیدەی شەرع ئەو شتەی دەتەوێت بیکڕیت یان بیفرۆشیت پێویستە حازرو لە بەردەست بێت، بەڵام وەك ئوصوڵیەکان فەرموویانە

---

١. بنوارە: (المنتقى من بطون الكتب: محمد بن إبراهيم الحمد: (١/٨٠). والموسوعة العربية العالمية: العملات والنقود الاسلامية: (ص٣). (الحافظ ابن سعد الزهري) دەفەرموێت: «أخبرنا محمد بن عمر قال: حدثني عبد الرحمن بن أبي الزناد عن أبيه أن عبد الملك بن مروان ضرب الدنانير والدراهم سنة خمس وسبعين، وهو أول من أحدث ضربها ونقش عليها». الطبقات الكبرى لابن سعد: (٥ / ٢٢٩).

ئیعتیبار بە عورفی چاکی موسڵمانان دەکرێت با دەقێکیشی لە سەر نەبێت، هەروەها بە پێی بەڵگەی (استحسان) وە نمونەیان بەم جۆرە گرێبەستە کردووە[1]. لەم رووەشەوە پرۆفیسۆر: د. وهبة الزحیلي) لە (الفقه الإسلامي وأدلته) دەڵێت: « العقود غير المسماة: هي التي لم يوضع لها اسم خاص في الشرع، ولم يرتب التشريع أحكاماً خاصة بها، وإنما استحدثها الناس تبعاً لحاجة. وهي كثيرة لا تنحصر، لأنها تنشأ بحسب تجدد حاجات الناس وتطور المجتمعات وتشابك المصالح، مثل عقد الاستصناع، وبيع الوفاء، وبيع الاستجرار، والتحكير، وأنواع المقاولات، أي التعهدات والالتزامات الحديثة، وأنواع الشركات التي تمنح امتيازات للتنقيب عن النفط والمعادن، وعقود النشر والإعلان في الصحف والمجلات ونحوها. أما الاستصناع: فهو التعاقد على صنع شيء معين، كالأحذية والآنية والسيارات والبواخر، والمفروشات ونحوها. وقد تردد بين اعتبار كونه بيعاً أو إجارة أو وعداً، ثم استقر على تسمية خاصة به... وقد عرفنا في بحث حرية التعاقد: أن الرأي الغالب أو الراجح فقهاً هو جواز حداث عقود جديدة لا تخالف نصوص الشريعة ومبادئها وقواعدها العامة، كما يقول الحنابلة وبخاصة ابن تيمية وابن القيم. أو من طريق القياس والاستحسان والعرف والمصالح المرسلة وغيرها من أدلة التشريع كما يقول الحنفية والمالكية والشافعية»[2].

---

١. بنواڕە: الموسوعة الفقهية الكويتية (٣ / ٣٢٧). و علم أصول الفقه للشيخ عبد الوهاب خلاف: (ص ٨٩) وقد أجازه مجلس مجمع الفقه الإسلامي المنعقد في دورة مؤتمره السابع بجدة في المملكة العربية السعودية من ١٧إلى ١٢ ذو القعدة ١٤١٢ هـ الموافق ٩–١٤ مايو ١٩٩٢م. قرار رقم ٦٦/٣/٧ عن: الفقه الإسلامي وأدلته (١٧٢/٧).

٢. الفقه الإسلامي وأدلته للزحيلي: (٥٩٧/٤ـ٥٩٨).

## ( فەصڵی چوارەم )

## وەهابیەکان لە نێوان رواڵەتی مەنهەجی بانگەوازیان و واقیعی پیادەکردنیاندا.. توێژینەوەیەکی شیتەڵکاری لەشەش رووەوە.

نەیارانی داهێنانی چاك ناسراو بە وەهابیەکانی نەجد کە بە حیساب بانگێشت بۆ (الكتاب والسنة)دەکەن بۆ خۆیان پابەند نین بەو مەنهەجەی کە رواڵەت بانگێشتی بۆ دەکەن لە پێنج رووی سەرەکییەوە:

### ( رووی یەکەم )

بۆ خۆیان پابەند نین بەو مەنهەجەی کە بانگێشتی بۆ دەکەن لە پێناسەی بیدعەت و سوننەتدا، بەو هۆیەشەوە دەیان فەتوای دژ بە یەك لە تەبدیعکردن وتەفیسق کردنی یەکتر رەنگیداوەتەوە لە فەتواکانیاندا، واتە وەهابیەکانی نەجد وحیجاز یەکتریان بە بیدعەت چی لە قەڵەم داوە لە دەیان مەسئەلەدا بە نموونە:

١ـ بەکارهێنانی دەستەواژەی (صدق الله العظيم) لە پاش خەتمی قورئان کە پێشتر بە درێژی باسمانکرد، (ابن تيمية) بۆ خۆی کردوویەتی وپێی باش بووە، بەڵام وەهابیەکانی شاگردی زۆرێکیان بە بیدعەت وگومڕایی دەزانن؟!

٢ـ ئێوە وا رادەگەێنن کە بیدعەتە ئاهەنگی مەولوودنامەی فەخری کائینات (ﷺ) کەچی پێتان موستەحەب وچاکە ئاهەنگی مەولوودنامە وهەفتانای ژیاننامەی محەمەدی کوڕی عبد الوهاب، کە لە ساڵی ١٤٠٠ کۆچیدا لەو پێناوەدا (هەفتانە)تان بۆ گرت لە کۆنگرەیەکی گەورەدا لە ژێر

چاودێری (جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية بالرياض)، بەڵام پاش ئەوەی کە تەریقکرانەوەو لە هەموو لایەکەوە، نەتانوێرا دووبارەی بکەنەوە، نەك لەبەر ئەوەی پێتان بیدعەت بووبێت وتەوبەتان کردبێت لە سەر ئەو داهێنانە، بە بەڵگەی ئەوەی کە کردتان وفەخریشی پێوە دەکەن، بەڵکو لە بەر ئەوەبوو نەوەك مەجبوور بىن بۆ پێغەمبەری ئیسلامیش(ﷺ) هەمان شت بکەن، بۆیە موفتی وەهابیەکان(عبد العزيز بن محمد آل عبد اللطيف) تەبریر دەهێنێتەوە بۆ سازدانی ئەو هەفتانەی کە بۆ (ابن عبد الوهاب) یان ساز دابوو دەڵێت: « فإن أسبوع الشيخ محمد بن عبد الوهاب على أنه عبادة بذاته، إنما قُصد به بيان هذه الدعوة وإنصاف مجددها»[1]، واتە: « هەفتانەی (ابن عبد الوهاب) عیبادەتە بۆ خۆی ومەبەستیش لێیەوە روونکردنەوەی دەعوەو بانگەوازەکەیەتی وبەرگری کردنە لە خۆدی ئەوە». ئێمە دەڵێین ئەمە چۆن وبە چ دەقێك کرتان بە عیبادەت، ئایا وەحیتان بۆ هات؟ یان بە مەیلی خۆتان شت لە ئیسلامدا زیادو کەم دەکەن ودەشتانەوێت بیفرۆشنەوە بە موسڵمانان؟ پاشان ئایا دەعوەو بانگەوازەکەی پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ) شایستەتر نییە بە باسکردن وبانگەواز بۆ کردن لە دەعوەکەی (ابن عبد الوهاب)؟ ئایا باسکردن وبەرگری کردن لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە بەرانبەر هێرشی دڕاندانەی دوژمنانی ئیسلام ئەولاترو شایستەتر نییە هەتا بەرگری کردن لە کەسێکی وەك (ابن عبد الوهاب)؟ بۆیە پێویستە بگوترێت بە موفتی وەهابیەکان: جەناب کەمێت ئینصافتان هەبێت بەرانبەر بە پێغەمبەری

١. عنوان الفتوى: الشيخ محمد بن عبد الوهاب..والموالد، للشيخ عبد العزيز بن محمد آل عبد اللطيف،رقم الفتوى(١٥٧٣٩) بتاريخ: (٦/٦/١٤٢٧هـ - ٢/٧/ ٢٠٠٧م) عن موقعه الرئيسي.

ئیسلام(ﷺ)، هیچ نەبێت بە قەدەر (ابن عبد الوهاب) تەبریری بۆ بهێنەرەوەو حیسابی بۆ بکەن! بزانن کە زانایانی ئیسلام ئەو بۆنانەیان بەرز راگرتووە هەزارو یەك تەبریری شەرعییان هەبووە، نەك وەك ئێوە تەبریری سیاسی ونامەعقولێ بە خۆڵ لەچاوکردنی خەڵكێکی؟!

هەروەها لە هەمان مەسئەلەدا موفتییەکی تریان بەناوی (محمد بن صالح العثيمين) هەرچەندە هەفتانەی (ابن عبد الوهاب) بە عیبادەت نازانێت، بەڵام پۆزش دەهێنێتەوە بۆ یادکردنەوەکەی ودەڵێت: «إن أسبوع الشيخ محمد بن عبدالوهاب رحمه الله تعالى لم يُتخذ تقرُّباً إلى الله عز وجل، وإنما يُقصد به إزالة شبهة في نفوس بعض الناس في هذا الرجل، ويبيِّن ما منَّ الله به على المسلمين على يد هذا الرجل»[1] ئەم فەتوایان نیوەی پێچەوانەی فەتواکەی تریانە، چونکە ئەو بە عیبادەتی دەزانێت وئەمیش بە عیبادەتی نازانێت؟! بەڵام پۆزش هێنانەوەکەی ئەمیش وەك ئەو وەهایەو خراپتریش، چونکە (ابن عبد الوهاب)ی خستووەتە ریزی ئایینی ئیسلام وپێغەمبەری ئیسلامەوە(ﷺ)، چونکە بە تەنها ئەودووانە خودا منەتی کردووە بەسەر بەندەکانیدا بە ناردنیان، یەکەمیان بە ئایەتی: ﴿يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُلْ لا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُمْ بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾[2] دووهەمیشیان بە ئایەتی: ﴿لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِنْ أَنْفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾[3] کەچی (عثيمين) دەڵێت: خوا منەتی کردووە بە سەرماندا بە ناردنی (ابن عبد الوهاب) کە کردوویەتی بە

١. مجموع فتاوى و رسائل ابن عثيمين، باب صلاة العيدين. (١٦ / ١٢١) رقم الفتوى(٢١٣١).
٢. (سورة الحجرات: ١٧).
٣. (سورة آل عمران: ١٦٤).

وەسیلەی رزگاری بۆ موسڵمانان بۆیە پێویستە یادەوەری بکەینەوە..!
کە ئەمەش بە پێچەوانەی دەقەکانی قورئانە چونکە تەنها پێغەمبەر (ﷺ)
وەسیلەی رزگاری بەندەکانی خودایە بە دەقی قورئان کە دەفەرموێت:
﴿الر كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ [(١)]

هەروەها دەپرسین: چۆن وبە چی دەرکەوت بۆ (عثیمین) کە خوا منەتی کردووە کە (ابن عبد الوهاب)ی ناردووە بە رزگارکار؟ ئایا ئەمە غەیب لێدان نییە، کە ئەوان دۆستانی خودای لەسەر تەبدیع دەکەن؟ بەم شێوەیە دەرکەوت کە پێگەی (ابن عبد الوهاب) لای وەهابیەکان لە پێگەی ئیسلام وپێغەمبەری ئیسلام(ﷺ) گەورەتر وشایستەترە، هەر لەبەر ئەوەشە کە بەردەوام تەنقیصی شان وپلەو پایەی ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) دەکەن. بەڵام نازانن کە ئەو زاتە (ﷺ) نوورو رۆشنایی خودایەو نووری خوداش بە هیچ کەس وهەرگیز ناکوژێتەوە.

٣ـ ئێوە دەڵێن دروست نییە یادکردنەوەی سەری ساڵی هیجری وبۆنە ئیسلامیەکانی تر، بەڵام یادکردنەوەو ئاهەنگگێڕانتان بە کارێکی پێویستە لە بۆنەی ساڵیادی پێکهێنانی (مەملەکەدا)!؟

بەڵێ وەهابیەکان ساڵانە لە رۆژی پێنج شەممە ٢١ی (جمادی الأولی بەرانبەر ٢٣ی سبتمبر) ئاهەنگ دەگێڕن بە بۆنەی رۆژی نیشتمانی مەملەکەوە کە لەو بەرواردا لە ساڵی(١٣٥١ك ـ١٩٣٢ز) مەملەکە راگەێندراوە [(٢)] پێیان شتێکی پیرۆز وموستەحەببە، کەچی بۆ

---

١. (سورة إبراهیم: ١).

٢. بنوارە: الیوم الوطني للمملكة العربیة السعودیة، واحتفالهم بە، عن موقع: ویکیبیدیا، الموسوعة الحرة، بتاریخ: ٢٠١٣/٥/٤م.

یادکردنــەوەی بۆنــەکانی ئیســلام بــە یــادی لــەدایك بــوون وهیجــرەت و سەرکەوتنەکانی ئیسلامەوە پێیان بیدعەتە! باشە موفتی گشتی مەملەکە (عبد العزیز آل الشیخ) تــەبریر دەهێنێتــەوە بــۆ یــادی نیشــتمانی مەملەکە ودەڵێت: « إن الیوم الوطني هو یوم شکر للنعمة التي منّ الله بها علی هــذه البلاد بالأمن والاستقرار والطمأنینة واستذکار الیوم الذي توحدت هذه البلاد من الشتات..»[1] ئەی هەمان تەبریر و زیاتریش پێویسـترو گونجـاوتر نییـە بهێنرێتــەوە بــۆ لــەدایك بــوون و ڕەوانــەکردن و هیجرەتــی فــەخری عالــەم (ﷺ) کە بە هۆیەوە سەر ڕووی زەوی پرشنگدار بـوو بـە نـووری ئیمـان و خەڵکی ڕزاریان بوو لە کوفرو گومڕایی بۆ ئیمان و هیدایەت؟!

ئەم ڕەفتارانەی وەهابیەکان بە ئاشکرا ئەوە دەگەیێنێت کـە (ابـن عبـد الوهاب) ومەملەکـەیان لا بایەخـدارترە لــە حــەزرەتی (رسـول الله) (ﷺ) و ســەروەریەکانی ئیســلام، (والعیــاذ بــالله تعــالی)! ئەگــەر وەهــا نییــە کــوا هەڵوێستیان؟! خۆ ئێمە ناڵێین ئەو کارانەیان بیدعەتن، چونکە بڕوامـان بـە داهێنــانی چــاك هەیــە، ئــەوە مەنهــەجی شکســتخواردووی کارپێنــەکراوی خۆیانە وادەڵێت و بەردەوام لەو پێناوەدا دەڕیسێت، بــەڵام کـە ئــەوان بـۆ پێغەمبەری خوای(ﷺ) بە شایستە نەزانن، ئەی (ابن عبد الوهــاب) کێیــەو چییە و لە کوێوە هاتووە و چ کارەیەو چ ڕۆڵێکی ئەرێنی دیوە بـۆ ئیســلام و وەحدەی موسڵمانان و خیلافەتی ئیسلامی، کێ لە مێـژوودا لــە زانایــانی هــەر چــوار مەزهــەب لــە کــاتی خۆیــدا دانــی خێــری پیــادا نــاوە جگــە لــە

---

١. بنـوارە: مقابلـة: نعـیم تمـیم الحکـیم، بجـدة، مـع مفـتي المملکـة، في حدیثـه لصـحیفة عکـاظ السعودیة، عن موقع منتدی هوامیر لبورصة السعودیة: بتاریخ: ٢٠١٢/٩/٢٣م. وموقع: منتدیات تطویر التعلیمیة بالسعودیة.

خۆتان[1]؟! هەتا بەلاتانەوە پیرۆز تر و گرنگتر بێت؟! لەو ڕۆژەدا سوپاس گوزاری خودا بکەن بەڵام لە ڕۆژی ویلادەت و ناردن و هیجرەتدا هیچ گرنگییەکی پێ نەدەن، بگرە سوپاس گوزاری موسڵمانان بۆ پەروەردگار بە بیدعەت هەژمار بکون!؟ بزانن خودا چی فەرمووە بۆ خۆشەویستەکەی و شوێنکەوتوان و یادگوزاران و ڕێزگرانی کە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ * قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾[2]

٤ـ ئێوە زۆر گرنگی دەدەن بە مەزاهیر بە تایبەت مەسئەلەی ڕیش و دەرقاچە، تەنانەت بۆ خۆتان فەتوای بۆیاخکردنەوەیتان داوە، کەچی ناوەرۆکی کارە ئیسلامیەکان بەلاوە دەنێن، لە کاتێکدا مەعلوومە کە

---

١. کەم کەس هەیە لە زانایانی باوەڕپێکراوی هاوچەرخی خۆی ستایشیان کردبێت، مەگەر نەیانناسیبێت، ئەوەتانێ (شیخ محمد بن إسماعیل الصنعاني(ت ١١٨٢هـ) لە سەرەتادا کە نەیناسیبوو بە هۆنراوەیەك ستایشی کرد، بەڵام پاشان کە زانی چ ماڵێکە، پاشکەز بوویەوەو هەڵوێستی بەرانبەر نوواند، وەك پێشەوا (المحدث عبد الحي بن عبد الکبیر الکتاني) لە کتێبی (فهرس الفهارس والأثبات ومعجم المعاجم والمشیخات والمسلسلات ترجمة الأمیر الصنعاني محمد بن اسماعیل، بتحقیق: إحسان عباس: (٥١٤/١) دەفەرموێت: «ولما ظهر في زمانه محمد بن عبد الوهاب صاحب المذهب الوهابي مدحه بقصیدة طنانة، وبعث له بها، ثم لما بلغه أنه یکفر أهل الأرض کلهم، ویفتي بسفك دمائهم إلا من اعتنق مذهبه، رجع عنها وعن مدحه».

٢. (سورة الأعراف: ١٥٧، ١٥٨).

بۆیاخکردنەوەی نا شەرعییەو غوسڵی موسڵمان بە هۆیەوە دەرناچێت، ئایا ئەگەر ڕیش هێشتنەوە بەو شێوە شپرزەی ئێوە سوننەتە یان واجبە ئەو سوننەت و واجبە بۆچی ڕاناگەیێنن بە ئەمیرەکانی لە مەملەکەدا، تا تەنها یەکێکیان ببینین بەو شێوازەی ئێوە؟ یان پێتان وایە ئەوان لە دائیرەی تەکلیف دەرچوون و ئەحکامی شەرعی نایانگرێتەوە!؟ یان پێتان وایە ئەوانیش موبتەدیع و گومڕان؟ یان دەورەکان هەر لە مێژەوە لە نێوانتاندا دابەشکراون!؟

٥- ئێوە بە زاهیر پابەندیتان ڕاگەیاندووە بە دەقە شەرعییەکانەوە، ئەی باشە ئەو پاسەوانانەی کە پاسەوانی دەکەن لە ئیمامەکانی حەرەمی مەککەی پیرۆز لە کاتی جومعە و جەماعەتدا کە پشت دەکەنە قیبلە و ڕوودەکەنە ئیمامەوە، ئایا بە چ دەقێك یان بە چ مەزهەبێکی فیقهی دروستە، تەنانەت ئەگەر بشڵێن ئەوە (صلاة الخوف)ە، ئایا مەرج و شێوازەکانی (صلاة الخوف) بەو شێوەیە؟!

٦- ئێوە چەندین ساڵە وا ڕایدەگەیێنن کە حیزبایەتی بیدعەتە و لە ئیسلامدا دروست نییە! ئەی باشە لە بەهاری عەرەبیدا لە یەکەم فرسەتا کە بۆتان هەڵکەوت بۆ پابەند نەبوون بەو مەنهەجە ڕاگەیێندراوەی خۆتانەوە، ئایا چەندین حیزب وگرووپ وتاقمتان درووست کرد لە نمونەی (حزب النور السلفي) لە وڵاتی میصر و (حزب الاتحاد السلفي) لە یەمەن و..هتد. ئایا ئێستا وەهابیەکانی میسر و جەزائیر و لیبیا وسوریا و یەمەن موبتەدیع و گومڕان کە گرۆ و تاقم و حیزبی سیاسیان ڕاگەیاندووە، ئەگەر دەڵێن نەخێر، کەواتە چەندین ساڵە ڕاستیان نەکردووە لە بانگەوازەکانیاندا، ئەگەر دەشڵێن بەڵێ، کەواتە بە ئیقراری خۆتان کۆمەڵانێکی زۆری وەهابی گومڕان، ئەو قافلەی گومڕابوونەش بەردەوامە،

چوونکه رۆژانـه حیـزب و گروهـەکانی وەهابیـەکان لـە رووی ژمـارەوە لـە زیادبووندان! ؟ یان پاشگەز بوونەوە لە مەنهەج وبیرو باوەڕ لە بەر خـاتری بەرژەوەندی دونیایی لای وەهابیەکان کارێکی ئاسایی یە؟!

٧ـ ئیـوە دەڵـێن (تقلیـد) دروسـت نییـە کەچـی بـە مـوو لـە فـەتوای سەرکردە وەهابیەکانی خۆتان لانادەن، ئەڵێن (تعصُّب) دروسـت نییـە بـۆ مەزهەب، کەچی لە هەموو مەزهەبییەك موتەعەصصیب ترن بۆ وەهابییەت و تەیمییەت، ئێوە دەڵێن حیزبایەتی دروست نییە چونکە دەبێتە هۆکـاری تەفرەقە، کەچی بۆ خۆتان لە هەموو کـەس و تـاقم و حیزبێکـی ئیسـلامی تەفرەقەتان ناوەتەوە لـە کۆمـەڵگای ئیسـلامیدا چـونکە بـە بـێ پێـوەر ی شەرعی موسڵمانان تەکفیر دەکەن وعەلمانیەکانیش تەقدیس دەکەن. ئایـا حیزبی ئیسلامی بیدعەتە بەڵام حیزبی عەلمانی سوننەتە؟! ئەگـەر وانییـە بۆچـی لـە کوردسـتاندا تەقدیسـی عەلمانیـەکان دەکـەن و دەسـەڵات بـە دەسەڵاتی خیلافەتی ئیسلامی دەزانن کە ئەوان بۆ خۆیان ئەو ئیـددیعایان نییەو هەندێکیشیان هەر باوەڕی بە خیلافەت نییـە؟ ئایـا نـازانن کـە ئێـوە بەکاردەهێنرێن لە دژ کێی و بۆ چی؟ ئەگەر نـا کەواتـە دەسـەڵات نازانێـت کە ئێوە بەکاری دەهێنن وەك پەیـژەو هـەر رۆژێـك فرسـەتتان دەسـکەوت سواری ملی دەبن؟! بە هەر حاڵ ئـەمڕۆ هـیچ وەرەقـەو دەسـتێك شـاراوە نییە لە کوردستان وجیهاندا.

ئەگەر راسـت دەکـەن بڵـێن: نـە لـە ئیسـلامدا تەفرەقـە و حیزبایـەتی هەیەودروسـتە بـەو چەشـنەی کـە ئـەمڕۆ بـەر جەسـتە بـووە و واقیعـی موسڵمانانی تیادا تێدەپەڕێت، نە لە کوردایەتیشـدا تـەفرەقـەو حیزبایـەتی هەیـەو دروسـتە بـەم شـێوازەی کـە ئـەمڕۆ واقیعـی کوردسـتانی تیـادا تێدەپـەڕێت. بـەڵکو پێویسـتە هـەمو کـار بکـەین لـە پێنـاو ئیسـلام

وکوردستاندا، نەك لە پێناو حیزب و کەس و تاقم و بنەماڵەو دەسەڵاتدا! نۆکەری هیچ دەزگاو وڵاتێکیش نەبین، نە عێراق و نە ئێران، نە میسر و نە سعودیە ونە تورکیا، نە شەرق و نە غەرب.

## ( ڕووی دووەم )

زانای هاوچەرخ (د. عبد الإله بن حسين العرفج الشافعي) لە بارەی (تناقضات)ی وەهابیەکانەوە لە کتێبەکەی خۆیدا (مفهوم البدعة وأثره في اضطراب الفتاوى المعاصرة) کە زۆرێك لە زانایانی سەردەم مەدح و ستایشیان کردووە لەوانە: (الشيخ محمد عبد الغفار الشريف (الكويت) والشيخ محمد الحسن بن الددو (موريتانيا)، الشيخ علي بن عبد الرحمن آل هاشم الحسني (الإمارات)، الشيخ عمر بن حامد بن عبد الهادي الجيلاني (اليمن).

ئەم زانایە بەشێگی گرنگی بۆ ئەو (تناقضات)ەیانی تەرخان کردووە، ئەم زانا بەڕێزە کە بوێرانە تاوتوێ مەسئەلەکانی کردووە نەقدو رەخنەی دروستکارانەی لێ گرتوون بە شێوازێك کە جۆڵەیان لێ بڕاوە چونکە هەستاوە لە کتێبەکەیدا بە بەراوردکارییەکی زانستیانەی ئامانجدار لە کۆی چەندین مەسئەلەی شەرعی دا کە تیایدا وەهابیەکان کەوتونەتە دژە فەتواو تەبدیع کردنی یەکتر و لە بەرانبەر یەکتر وەستاونەتەوە، بەو واتایەی کە یەك دەنگ نین لەو زیاتر لە بیست مەسئەکەلەدا، کە لای هەندێکیان ئەو مەسئەلانە دروست و موستەحەببە، لای هەندەکەی تریان هەمان ئەو مەسئەلانە بیدعەتەو گومڕاییە، بە پێی ئەو فەتوایانەیان کە (دکتور عبد الإلە الشافعي) ریزبەندی کردوون هەردوولایان بە پێی مەفهومی خۆیان بۆ بیدعەت دەبنە موبتەدیع و گومڕا، هەروەها فەتوایان

داوه بۆ گومڕایی و کاری بیدعەت، چونکە ئەوان بە رووالّەت دژی هەموو داهێنراوێکن ئەگەر باشیش بێت، پێیان وایە هەر بیدعەتە، بەلّام پابەند نین بەو مەنهەجەی خۆیانەوە، کە ناوی ناون بە (المضيّقين لمعنى البدعة) وەك (ابن باز و ألباني و ابن عثيمين و فوزان و ابن جبرين.. جگە لەوانیش، مەسئەلەکانیش زیاتر بریتین لە: (إقامة مجلس العزاء لثلاثة أيام)،(عشاء الوالدين)، (تخصيص يوم الجمعة لزيارة الجمعة)، (اتخاذ السبحة للتسبيح والذكر)، (تكرار العمرة في رمضان)، (دعاء ختم القران في صلاة التراويح أو صلاة قيام الليل)، (بدء المحافل الخطابية بقراءة القرآن الكريم)، (التمايل أثناء قراءة القرآن الكريم)، (احتفالات حفاظ القرآن الكريم)، (اتخاذ المحاريب في المساجد)، (رسم خطوط على سجاد المساجد لتنظيم الصفوف)، (سكتة الإمام بعد قراءة الفاتحة)، (قبض اليدين قبل الركوع)، (تخصيص صلاة القيام في العشر الأواخر من رمضان)، (الزيادة على إحدى عشرة ركعة في قيام رمضان)، (تطويل اللحية زيادة على القبضة)، (عقد ندوات وملتقيات سنوية للتعريف بالعلماء الماضين)، (التهنئة بدخول العام الهجري)، (تحرّي بداية السنة الهجرية للحديث عن الهجرة النبوية في الخطب والمحاضرات ويوم السابع من رمضان للحديث عن غزوة بدر وغير ذلك).

کە پێویست بوو وەهابیەکان وەك ئەو دەڵێت: دوودڵ نەبن و دژە فەتوا بەرانبەر یەکتر دەرنەکەن چونکە تێکڕایان بە رەوالّەت هەموو داهێنراوێك لە عیباداتدا گچکە بێت یان گەورە بە بیدعەت و گومڕایی دەزانن، پاشان بە (١٣٢) لاپەڕە فەتوا دژ بە یەکەکانی نەقڵ کردوون لە سەرچاوەکانی خۆیانەوەو پاشان نەخشەیەکی کێشاوە بۆ زیاتر ئاشناکردنی خوێنەر بە (تناقضات)ی وەهابیەکان لەو مەسئەلانەدا کە چۆن (ابن باز) موخالەفە و دژایەتی (ابن عثيمين)ی کردووە وچۆن (ابن

عثيمين) موخالەفەو دژایەتی (ألباني)ی کردووەو چۆن(ألباني) موخالەفە ودژایەتی (ابن باز)ی کردووە..هتد. بەنمونە:

١ـ هەر کەس بە قەول و فەتوای (ابن عثيمين و ألباني صالح فوزان) بکات کە پێیان وایە و ئامادەبوون بۆ مەجلیسی تەعزێ بیدعەتە ئەوا پێویستە (ابن باز و عبد الله بن جبرين) بە بیدعەچی بزانێت، چونکە ئەمان دەڵێن بیدعەت نییە!

٢ـ هەروەها هەرکەسێك بە قسەی (ابن عثيمين) بکات کە پێی وایە (عشاء الوالدين) واتە نان دروستکردن و خەڵك کۆکردنەوە بۆ سفرەو خوانێك کە دەکرێتە صەدقەو قوربانی بۆ مردوو پاش مانگێك یان دوو مانگ لە لایەن یەکێك لە ئال وبەیتی مردووەکەوە ــ ئەوا پێویستە (ابن جبرين و صالح الفوزان) بە بیدعەچی بزانێت، چونکە ئەمان بە پێچەوانەوە، پێیان کارێکی دروستە!

٣ـ هەروەها هەرکەسێك بە فەتوای (ابن باز و ابن عثيمين و صالح الفوزان) بکات کە پێیان وایە تایبەتمەندکردنی رۆژی هەینی بە زیارەتی گۆڕستانەوە بیدعەتە، ئەوا پێویستە (ابن جبرين) بە بیدعەت چی بزانێت، چونکە ئەم پێی بیدعەت نییە و لای دروستە!

٤ـ هەروەها هەرکەسێك بە قسەی (ألباني و صالح الفوزان) بکات کە پێیان وایە بەکارهێنانی تەسبیح بۆ یادی خودا بیدعەتە، ئەوا پێویست ولازمە کە (عبد العزيز بن باز و محمد بن عثيمين و عبد الله بن جبرين) بە بیدعەچی بزانێت، چونکە ئەمان بە پێچەوانەوە پێیان دروست وشایستەیە!

٥ـ هەروەها هەرکەسێك بە قەولی (بكر أبو زيد و ألباني) بکات کە پێیان وایە (نزای پاش خەتمی قورئان لە نوێژدا بیدعەتە، ئەوا پێویستە

(عبد العزيز بن باز ومحمد بن عثيمين وعبدالله بن جبرين وصالح الفوزان) به بيدعەت چی بزانێت، چونکە ئەمان پێیان کارێکی شایستەو دروستە!

٦ـ هەروەها هەرکەسێك بە فەتوای (بكر أبو زيد و عبد الرزاق عفيفي) بکات کە پێیان وایە دەست پێکردنی ئاهەنگە ئایینیەکان بە خوێندنی قورئانی پیرۆز بیدعەتە، ئەوا پێویستە (ألباني و صالح الفوزان) بە بیدعەچی بزانێت چونکە ئەمان فەتواکەیان پێچەوانەیەو پێیان کارێکی دروست و شایستەیە!

٧ـ هەروەها هەرکەسێك بە فەتوای (ألباني) بکات کە پێی وایە دەست بەرزکردنەوە پاش هەستانەوە لە رکوع بیدعەتە ئەوا لازمە و پێویستە (عبد العزيز بن باز و محمد بن عثيمين و صالح الفوزان) بە بیدعەتچی بزانێت، چونکە ئەمان بە پێچەوانەی ئەوەوە بە کارێکی دروست وشایستەی ئەزانن!

٨ـ هەروەها هەرکەسێك بە فەتوای (ابن عثيمين) بکات کە پێی وایە دووبارە کردنەوەی عومرە زیاتر لە یەك جار بیدعەتە، ئەوا پێویستە (ابن باز) بە بیدعەت چی بزانێت چونکە فەتواکەی ئەم بە پێچەوانەی ئەوەوەیەو پێی دروستە..هتد! زۆر نمونەی تریش کە هەم فەتواکانیان بە پێچەوانەی یەکترەوەیەو هەروەهاش تەبدیعی یەکتر دەکەن [١].

٩ـ ئەڵبەتە (تناقضات)ی وەهابیەکان لە ژماردن نایەت، هەرکەسێك موتابەعەی فەتواکانیانی کردبێت ئەو حەقیقەتەی بۆ روونبووتەوە، بۆیە یەکێکی ترش لەو دیاردە روونەیان رەنگ دەداتەوە لە مەسئەلەی

١. مفهوم البدعة وأثره في اضطراب الفتاوى المعاصرة، د. عبد الإله بن حسين العرفج الشافعي: (ص ٢٢٥ـ٣٥٣).

خوێندنەوەی نزای (الوسیلة والفضیلة)ی پاش قامەت کە هەندێك لە وەهابیەکان بە تایبەت هەندێك لە وەهابیەکانی (اللجنة الدائمة للإفتاء) هەموو جۆرە نزایەکی پاش قامەتیان بەلاوە بیدعەتێکی گومڕاییە، هەندێك لە ناحاڵیەکانی کوردستانیش بە پێ خاوسی شوێنی ئەو فەتوا نا دروستەیان کەوتوون و دەبینین ئەو دۆعایان لە پاش قامەت تەرك کردووە وتەقلیدێکی کوێرانەی ئەوانیان کردووە و بەو پێیەش پشتیان کردووەتە رای هەرچوار مەزهەبی ئیسلام لەو رووەوە کە لەمەودوا لە فەصڵی پێنجەم - باسی دووەمدا (باسی دووەم: خوێندنەوەی صەڵات و سەلام و نزای وەسیلە لە دوای بانگ و قامەت) بە روونتر باسی دەکەین.. کەچی لە عەینی کاتدا وەك (تناقض)ێکی ئاشکرا گەورە وەهابی ناسراو بە (ألباني) بە پێچەوانەی وەهابیەکانی ترەوەو رای دروستی زانایانی ئیسلامی پەسەند کردووە لەم مەسئەلەدا و ئەو نزایەی پێ دروست و سوننەتە و بە ئینصافەوە وەڵامی پرسیارێکی داوەتەوە کە لەو رووەوە لێی کراوە بەم شێوە: «السؤال نريد القول الفصل في هذه المسألة: الدعاء الذي يقوله بعض أئمة المساجد بعد إقامة الصلاة وقبل الصلوات المفروضة وهو: اللهم ربّ هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة...الخ وهناك بعض الأئمة لا يقولون هذا الدعاء، مثل أئمة الحرمين وغيرهم، ما أدلة الذين يقولون، والذين لا يقولون؟ وهل كان النبي (ﷺ) قبل كل صلاة يقول هذا الدعاء أم لا؟ الذي نعرفه أن الوارد عنه أنه كان فقط يأمرهم بتسوية الصفوف وسد الخلل.. الذين يقولون هذا الدعاء استنبطوا من حديث(ما بين كل أذانين صلاة) فاعتبروا الإقامة كالأذان وهذا اجتهاد منهم، فهل هذا الاجتهاد المستنبط من حديث يقدم هنا أم فعل النبي (ﷺ) والثابت عنه أنه لم يقل هذا الدعاء؟ وما القول الراجح في هذا الأمر، والمؤيد بالأدلة الصريحة الواضحة، أن يقول إمام المسجد هذا الدعاء أم لا؟» له

وەلامدا (الباني) گوتويەتی: « الإجابـة الحمد لله والصلاة والسلام على رسـول الله وعلى آله وصحبه، أما بعـد: فقبل الشروع في جواب مسألتك نحبُ أن ننبهك على قاعـدة مهمـة، وهـي أن السـنة لا يلـزمُ في ثبوتهـا أن يتـوارد عليهـا القـول والفعل، بل من السنن ما ثبت بقوله (ﷺ) دون فعله، ومنها ما ثبت بفعله دون قوله، ومنها ما ثبت بالقول والفعل معاً، ومـن السـنن مـا يثبـتُ بـإقراره (ﷺ) لفاعلها، كما هو مبسوط مبين في كتب الأصول .ومن السنن الثابتة بقوله (ﷺ) الذكر المسؤول عنه عقب الأذان ففي البخاري :من قال حين يسمع النداء: اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة، آت محمـداً الوسـيلة والفضـيلة، وأبعثـه مقاماً محموداً الذي وعدته، حلت له شفاعتي يوم القيامـة .رواه البخـاري. وقـد اختلف الفقهاء في سنية هذا الدعاء عقب الإقامة بناء على اختلاف فهمهم لحديث (بين كل أذانين صلاة) متفق عليه، فقال كثيرٌ منهم: إنه سمى الإقامة أذاناً فدل على أنه يُشرع فيه من ترديدها والذكر بعدها، ومنه الدعاء المسؤول عنه ما هو مشروعٌ عقب الأذان، قال ابن حجر الهيتمي: لم أر من قال بندب الصلاة والسلام أول الإقامة وإنما الـذي ذكـره أئمتنـا أنهمـا سـنتان عقـب الإقامـة كـالأذان ثـم بعدهما: اللهم رب هذه الدعوة التامة .انتهى وقـال الخطيـب الشـربيني)و (يسـن) لكل (من مؤذن وسامع ومستمع قال شـيخنا ومقـيم ولم أره لغـيره) أن يصـلي على النبي (ﷺ) (ويسلم أيضا لما مر من أنه يكـره إفرادهـا عنـه) بعـد فراغـه (من الأذان أو الإقامة على ما مر لقوله (ﷺ) إذا سمعتم المؤذن فقولوا مثل ما يقول ثم صلوا علي فإنه من صـلى علـيّ صـلاة صـلى الله عليـه بهـا عشـرا) ثـم (يقول) اللهم (أصله يا الله حذفت منه يا وعوض عنه الميم ولهذا لا يجوز الجمع بينهما) رب هذه الدعوة (بفتح الدال أي الأذان أو الإقامة علـى مـا مـر) التامـة. انتهى. وقال جماعةٌ من أهل العلم إنه إنما سمى الإقامة أذاناً على جهة التغليب، كما يُقال للشمس والقمر القمران، وللتمر والماء الأسودان ونظـائر ذلـك، ولـيس يلزم من هذا أن تكون للإقامة أحكام الأذان من ترديدها والذكر بعدها، بل هـذا

يفتقر إلى دليل يخصه، وإذ لا دليل ثمّ فيبقى الأصل وهو عدم المشروعية، لأن مبنى العبادات على التوقيف، وممن رجح هذا القول العلامة العثيمين رحمه الله. قال (رحمه الله) والقول الراجح: أنه لا يقول شيئاً، ولا يتابع المقيم، ولا يدعو بدعاء الأذان. انتهى. ورجح هذا القول أيضاً العلامة بكر أبو زيد (رحمه الله) في كتابه النافع تصحيح الدعاء، فالمسألة كما رأيت كغيرها من مسائل العلم التي يسوغ فيها الخلافُ بين العلماء، ومن ترجح له أحد القولين عمل به، ومن لم يترجح له شيءٌ قلد من يثق به من العلماء، والمفتى به عندنا هو مشروعية قول هذا الذكر بعد الإقامة وانظر الفتوى رقم(٩٣٩١) وقد رجح هذا القول أيضاً جمعٌ من العلماء المعاصرين. فقد جاء في فتاوى اللجنة: السنة أن المستمع للإقامة يقول كما يقول المقيم" لأنها أذان ثانٍ فتجاب كما يجاب الأذان، ويقول المستمع عند قول المقيم) حي على الصلاة، حي على الفلاح(لا حول ولا قوة إلا بالله، ويقول عند قوله (قد قامت الصلاة) مثل قوله، ولا يقول :أقامها الله وأدامها" لأن الحديث في ذلك ضعيف، وقد صح عن رسول الله (ﷺ) أنه قال :إذا سمعتم المؤذن فقولوا مثل ما يقول وهذا يعم الأذان والإقامة، لأن كلا منهما يسمى أذانا .ثم يصلي على النبي (ﷺ) بعد قول المقيم (لا إله إلا الله) ويقول: اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة.. إلخ. كما يقول بعد الأذان .انتهى. و قال الألباني في الثمر المستطاب: وعلى من يسمع الإقامة مثل ما على من يسمع الأذان من الإجابة والصلاة على النبي (ﷺ) وطلب الوسيلة له كما سبق بيانه في المسألة من الأذان وذلك لعموم قوله(ﷺ): « إذا سمعتم المؤذن فقولوا مثلما يقول..الحديث». ولأن الإقامة أذان لغة وكذلك شرعا لقوله (ﷺ) (بين كل آذانين صلاة) يعني أذانا وإقامة) قال الحافظ في شرح الحديث: أي أذان وإقامة. قال: وتوارد الشراح على أن هذا من باب التغليب كقولهم: القمرين للشمس والقمر ويحتمل أن يكون أطلق على الإقامة أذان لأنها إعلام بحضور فعل الصلاة كما أن الأذان إعلام بدخول الوقت ولا مانع من حمل قوله(أذانين) على ظاهره.

(وعلى هذا جرى الإمام ابن حزم فإنه فهم من قوله (ﷺ): «فإذا حضرت الصلاة فليؤذن لكم أحدكم..» الحديث وقد مضى، فهم منه أن الإقامة داخلةٌ في هذا الأمر بدليل الحديث الذي نحنُ في صدد الكلام عليه "انتهى»[1].

١٠ـ جۆرێکی تر لە (تناقضات)ی وەهابیەکان تەفرەقەو تەکفیرکردن و تەبدیع کردن و تەفسیق کردنی یەکترە لە ناوخۆیاندا کە (نجم الدین فرج) کە بۆ خۆشی وەهابییە ئەو حەقیقەتەی باس کردووە بە ئینصافەوە لە تەرجەمەکەیدا بە ناونیشانی (بلّق و کەفی یەك دوو گومانی سەلەفی) لە نوسینی (محمد بوننیەت) باسی وەهابیەکانی کردووە و کردوونی بە چوار تاقمەوە، (حەق و زەق ودەق ولەق)[2]. بەڵام لە حەقیقەتدا تەنها لە کوردستاندا چەندین بەش و تاقم و گروهن خیلافەکانیشیان لە بابی عەقیدە و تەکفیر و وەلائو بەرائدایەو جۆری تەمویلەکانیان وتەقلیدکردنیان بۆ تاقمە جیاوازەکانی وەهابییەت لە دەرەوەی هەرێمی کاریگەر بووە لە سەریان، ئەم حەقیقەتەش لای هەموان زانراوەو گرتە ڤیدۆیی وتیلفۆنەکانیان باشترین شاهیدە لە سەر ئەو بەش بەشبوونەیان..

هەرچەندە ئێمە لە گەڵ ئەو بۆچونەی ئەو نوسەرەدا نیین بە تەواوەتی، چونکە بە بەڵگەوە پێمان وا نییە هیچ تاقمێك لە وەهابیەکان نمونەی سەلەفی هەق بن، نە لە کوردستان نە لە هیچ شوێنێکی دونیادا، چونکە سەلەفی حەق کە سەلەفی صاڵحە بریتتیە لە موسڵمانانی چوار

---

١. حكم دعاء الوسيلة بعد الإقامة، رقم الفتوى(١٢٤٠٠٨) التصنيف أحكام الإقامة، الأحد (٥) رجب ١٤٣٠هـ /٦/٢٨ ٢٠٠٩هـ، عن موقع: اسلام ويب http://fatwa.islamweb.net/fatwa/index.php_ بتاريخ: ٢٠١٣/٥/٢٧م.

٢. بنوارە: بلّق و کەفی یەك دوو گومانی سەلەفی) ن/ (محمد بونێت) و/ (نجم الدین فرج): (ص ١١ـ١٣).

سـەدەکەی ئیسـلام، ئاشکراشـە کـە ئـەتوار ورەفتـار و کـردار و گوفتـاری وەهابیەکان لە مێژوو و ئێستاشدا بە هیچ ڕوویەك یـەك ناگرێتـەوە لـە تـەك بیرو بـاوەڕی سـەلەفی صـالّح دا، چـونکە سـەلەفی صـالّح (مُنَزِّهــ) بـوون، ئـەمان (مُجَسِّمْ)ن، سـەلەفی صـالّح (مَـذْهَبي) بـوون، ئـەمان (لا مـذهب)، سـەلەفی صـالّح (موحِّـد)ی ئوممـەت بـوون، ئـەمان (مفـرِّق)ی ئوممـەتن، سەلەفی صالّح ڕەحمەت بوون بۆ تێکڕای ئوممەتی ئیسلام، ئەمان نیقمەت و زەحمەتن بۆ تێکڕای ئوممەتی ئیسلام، تەنانەت بـۆ خۆشـیان، سـەلەفی صالّح خەڵکێکی شارستانی و حەزار ی پیاو چاك و خـاکی تـەبع و شـیرین گوفتار و ناوچاو پاك و ئەهلی کەرامەت بوون، ئەمان خەڵکێکی دەشـتەکی تەبیعەت ووشکی لووت بەرزی ناوچاوتاریکی گوفتارزبر وزوبان درێژن، کـە بە هیچ شێوەیەك ریعایەتی ئەدەب ناکەن تەنانەت لە خزمـەت پێغەمبـەری خوداشدا(ﷺ)، بە ئاشکراش بێ ئەدەبی و دوژمنایەتی زانـا وفەقیهـەکانی چـوار مەزهــەبی ئیسـلام و پیاوچـاك و ئـەولیای کـیرام دەکـەن، ئـەهلی ئیهانـەتن نـەك ئـەهلی کەرامـەت، سـەلەفی صـالّح ئـەهلی زیکـر و یـاد و تەسبیحاتی پەروەردگار بوون و بەردەوام زوبانیان شیرین بوو بە صەڵاوات لـە دیداری پێغەمبـەری خـودا(ﷺ)، ئـەمان دوژمنایـەتی ئـەو سـوننەتانە دەکـەن، سـەلەفی صـالّح بـەردەوام لـە محەببـەتی خـودا و پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) وپیاوچـاکاندا ژیـن و دینیـان دەبـردە سـەر، ئـەمان ئەصـڵەن بڕوایان بە محەببەت نییـەو بـە بیدعـەتی دەزانـن! ؟... ئەمانـەو زۆر شـتی تـریش.. بۆیـە بـە هـیچ شـێوەیەك ڕەوای هـەق نییـە بـەراورد بکـرێن بـە سەلەفی صالّح، چونکە (تباین) هەیە لە نێوانیاندا، با خۆشیان وا رایگەیێنن وبەخۆیان بڵێن سەلەفی، ئەو پڕوپاگەندانە لە مێووی ئیسلامیدا لە دروشـم و باق وبریقی هەموو فیرقـەکانی دەرەوەی ئـەهلی سـوننەت و جەماعەتـدا

بەدی دەکرێت، چونکە گوفتار و دروشم هیچ نییە، مەرج کردار و جێ بەجێ کردنە، خەڵکیش بە گشتی ووشیارو بەئاگایە سوپاس بۆ خوا..

بەو پێیەش دەرکەوت کە وەهابیەکان شایستەی فەتوا نیین ومەنهەجێکی دروستیان نییە لە فەتواکانیاندا و بە پێوەری هەواو ئارەزوبازی فەتوا دەدەن نەك پێوەری بنەماو مەبەست لە دەقەکانی شەریعەتی ئیسلام، تەنانەت لە تەك مەنهەجەکەی خۆشیاندا راست ودروست نین، چونکە کۆمەڵێك داهێنراویان پێ دروستە وکۆمەڵێکیشان پێ بیدعەتە، ئەو مەسئەلانەی کە هەندێکیان پێیان بیدعەتە لای هەندێکی تریان شایستەیەو چاکە و پەسەندەو دروستە، کەواتە هیچیان دەرباز نەبوون لە چوارچێوەی ئەو بیدعەتەی کە خۆیان پێناسەیان کردووەو بە دەستی خۆیان پەتی بیدعەتیان لە گەردنی خۆیان ناوە! بەوپێیەش هەمویان لە هەندێك مەسئەلەدا موبتەدیع و گومڕان، ئەمە قسەی من نییە، بەڵکو بە پێی فەتوا دژ بەیەکانیان ئەو حەقیقەتانە روون دەبێتەوە. (اللهُمَّ وفّقهم للحق واهدهم إلى صراطك المستقيم، ووفق جميع المسلمين لما تحبه وترضاه آمين).

## ( رووی سێیەم )

بانگەوازخوازانی وەهابییەت ئەگەر پێیان دەڵێت: خەلیفە راشیدەکان کاری چاکیان لە عیباداتدا دامەزراندووە وەك (جەمعی قورئان و بانگی دووەمی جومعەو تەراویحی بە جەماعەت و زۆر شتی تریش.. لە وەڵامدا دەڵێن: ئەو کارانە نابنە بەڵگە لە سەر دروستی بیدعەتی حەسەنە و داهێنانی چاك لە عیباداتدا، چونکە هەر شتێك چوار خەلیفەی ئیسلام

دایانهێنابێت حوکمی سوننەتی پێغەمبەرەی هەیە (ﷺ) بە فەرموودەی:
« عليكم بسنّتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين من بعدي..» [1].

ئێمەش دەڵێن: ئەمە راستە کە حوکمی سوننەتی پێغەمبەری هەیە (ﷺ)، بەڵام ئێوە پابەند نین بە مەنهەجەکەی خۆتانەوە و لێی لادەدەن و بەهەوەسکاری بژاری تیادا دەکەن، واتە هەرشتێك پێتان باش بوو لە داهێنراوەکانی خەلیفەراشیدەکان ئەوا پابەند دەبن و هەرشتێکیش لە تەك فیکری وەهابییەتدا نەگونجا لێی هەڵدێن و پابەند نابن پێیەوە با خەلیفە راشیدینەکانیش کردبێتیان وسەلەفی صالحیشی لە سەر بوبێت، بە نمونە:

١- کەوتنی طە لاقی سێ بەسێ لە یەك مەجلیس و بە یەك لەفز، ئایا جێ بەجێ نەکرا لە سەر فەرمانی حەزرەتی عومەر (رضـي الله عنـه) وپاشان ئیجماعی سکوتیی صەحابەی لە سەر پەیدا بوو؟ ئەی بۆچی لەم مەسئەلەیەدا پشت دەکەنە خەلیفەی دووەمی راشید حەزرەتی عومەر وئیجماعی سکوتی صەحابەو مەزهەبی هەر چوار پێشەوایانی سەلەف (حەزرەتی شافیعی و مالیك و ئەبوو حەنیفەو ئەحمەد) ؟ ئایا بانێکەو دوو هەوا؟ هەروەها ئایا تەراویح بە فەرمانی حەزرەتی عومەر (رضـي الله عنـه) نەکرا بە بیست رکاعەتی بە جەماعەت؟ ئەی بۆ زۆربەی زۆری وەهابی مەشرەبەکان پەیڕەو ناکەن لەو سوننەتەی خەلیفەی دووەمی راشید ؟! مەگەر بانێکەو دوو هەوا؟ ئەمانەو زۆر نمونەی تریش.. [2]

---

١. (رواه الحاكم في (المستدرك على الصحيحين) (١٧٤/١)برقم(٣٢٩)، وابن خزيمة في صحيحه (١٤٣/٣)برقم(١٧٨٥). من حديث العرباض بن سارية السلمي (رضي الله عنه).

٢. بنوارە بۆ درێژەی سەلماندنی ئەو دوو مەسئەلەو هاووێنەکانی بۆ: (حكم الإفتاء بمذهب الصحابي وتقليده في الوقائق والمستجدات) دراسة أصولية فقهية، (دانەر): د. حسن خالد مصطفى محمود المفتي: (ص٤٢-٦٧).

٢ـ ئايا دامەزراندنی چوار پەیڕەوەکەی ئیسلام واتە (مەزهەبی شافعی و ئەبو حەنیفەو مالیك و ئەحمد) کە تێکڕای ئەهلی سوننەت و جەماعەتی لە سەرە، ئایا سەرمەزهەبانی ئەو چوار مەزهەبە لە گەورە زانایانی سەلەف نەبوون؟ بێگومان بەڵێ، ئەی بۆچی ئێوە بەدمەزهەب و لا مەزهەبن و بانگەشە بۆ بیدعەتی لامەزهەبییەت دەکەن و خەڵکی نەفام چەواشە دەکەن؟

٣ـ ئێوە بە رەفتار و کردار رایدەگەیێنن دەڵێن: ئێمە (تەیمی) مەزهەبین ولەلایەکیش بانگەشە بۆ بێ مەزهەبی دەکەن، واتە، لە لایەك نەفی تەقلید ومەزهەب دەکەن، لە لایەکیش تەقلیدی کوێرانەی (ابن تیمیە) و (ابن عبد الوهاب) وپاشماوەکانیان دەکەن؟ ئایا بانێکەو دوو هەوا؟! واتە ئێوە دەڵێن تەقلیدی ئیمامی شافیعی و ئیمامی نەوەوی وباقی ئیمامە باوەڕپێکراوەکانی ئیسلام دروست نییە، کە بە تێکڕای دەنگ مەرجەکانی فەتوای شەرعی تیایاندا هاتووە جێگە، بەڵام تەقلیدکردنی وەهابیەکانی نەجدتان پێ واجبە، لادان لە راو بۆچوونەکانیان بە گومڕایی دەزانن! کە هەندێکیان بە تەواوەتی راست و چەپی خۆیان نازانن لە مەڕ مەسئەلە ئوصولییەکان و دەیان (تناقض)ی گەورە هەیە لە فەتواکانیاندا لە بەرانبەر یەکتردا؟! کەواتە ئەگەر مەنهەجی خۆتان پیادەدەکەن پێویستە واز لە رای هەموو کەسێك بهێنن و راستەوخۆ کار بە دەقەکانی قورئان و سوننەت بکەن، ئایا ئەتوانن؟ ئایا ئەتوانن واز بهێنن لە فەتوای وەهابیەکانی مەملەکەو دەرەوەی مەملەکە؟ ئەگەر نا دەی واز بهێنن لە موسڵمانان و رێگەی راستیان لێ مەشێوێنن کە پابەندن بە فەتوای زانایانی مەزهەبی راست و دروستەوە نەك رێچکەی لارو فەتوای ناپەسەند! کە بێگومان مەزهەبیەکان لە سەر فەرمانی قورئانی

پیرۆز دەڕۆن کە لـە دوو جێگـەدا فـەرمانی داوەو دەفـەرموێت: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْـلَ الـذِّكْرِ إِنْ كُنْـتُمْ لا تَعْلَمُـونَ﴾ [1] هـەروەها لـە ژێـر تیشـکی ئایـەتی هەڕەشەکاری قورئان کە دەفەرموێت: ﴿وَلا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا﴾ [2].

٣ـ ئەگەر وەهابیەکان راست دەکەن تەیمی مەزهەبن، خۆ (ابن تیمیـة) حەنبەلی مەزهەب بووە و بانگەشەی بۆ ئەو مەزهەبـە کـردووە لـە (مجمـوع الفتـاوی) و (الرسـائل والمسـائل) و زۆر کتێبـی تریـدا روون و ئاشـکرایەو هــەموو قوتابیەکانیشـــی ئــەو راســـتییەیان بـــاس کـــردووە، هـــەروەها حەنبەلیـەکان لـە کتێبـی (طبقـات)ی خۆیانـدا ژیاننامـەی ئـەویان دەرج کردووە، کەوابوو ئەوان کـە خۆیـان بـە تـەیمی مەزهـەبن ئـەزانن پێویسـتە حەنبــەلی مەزهــەبیش بــن، کەواتــە بۆچــی دژی مەزهــەب دەوەســتنەوە وبانگەشەی بۆ دەکەن، ئایا ئەمە دەرچـوون نییـە لـەو مەنهەجـەی کـە بـە رواڵـەت بانگەشـەی بـۆ دەکـەن؟ یـان گوفتـارو کرداریـان وەك ئاسمـان و رێسمان وایە؟! هەرچەندە بـیرو بۆچـونیان لـە رووی عەقیـدەوە زیـاتر لـە تەك (غـلاة الحنابلـة) و (فِـرَقُ المشـبهة و المجسـمة و الكراميـة والجهميـة)دا یەکدەگرێتــەوە، لــە رووی فیقهیشــەوە لــە تــەك مەزهــەبی (ابـن حـزم) ی زاهیریدا و لە رووی سلوکیشەوە لە تـەك (عەلمانیەکانـدا) گونجـاوترن وەك ئاشکرایەو خۆشتان فەخری پێوە دەکەن!؟ لە هەر شوێنێك هـەبن ملکـەچ و گەردن کەچی رەهای دەسەڵاتن باش بێت یـان خـراپ، دادپـەروەر بێـت یان سـتەمکار، ـ گـرنگ ئەوەیـە لایـان زەرەری بـۆ پـەزەکـە نـەبێت ـ ئـیتر

---

١. (سورة النحل: ٤٣)، (سورة الأنبياء: ٧).

٢. (سورة الإسراء: ٣٦).

نازانم ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَلا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ ثُمَّ لا تُنْصَرُونَ﴾ [1] و فەرموودەی پیرۆزی: « لاطاعة لمخلوق في معصية الله عزَّ وجلّ» [2] لە قیامەتدا چۆن وەڵام دەدەنەوە؟

٤ـ ئەگەر ئێوە راست دەکەن تەیمی مەزهەبن، پێویستە کە فەتوا دەدەن لە سەر پەیڕەوی چوار مەزهەبەکە فەتواکە تاووتوێ بکەن و نیسبەتی فەتواو قەولەکان بدەنە پاڵ پێشەوایانی مەزهەب، چونکە (ابن تیمیة) بەو شێوە بووە، وەك (ابن القیم) دەیگێرێتەوە و دەڵێت: « ولقد شاهدت من شيخ الإسلام ابن تيمية قدس الله روحه في ذلك أمرا عجيبا: كان إذا سُئل عن مسألة حُكمية ذكر في جوابها مذاهب الأئمة الأربعة إذا قدر »[3].

هەروەها لە (مجموع الفتاوى)کەیشیدا ئەو حەقیقەتە روون دەبێتەوە، بەنموونە: «سئل رحمه الله تعالى عن رجل أراد أن يواقع زوجته في شهر رمضان بالنهار فأفطر بالأكل قبل أن يجامع ثم جامع فهل عليه كفارة أم لا ؟ وما على الذي يفطر من غير عذر ؟ فأجاب: الحمد لله هذه المسألة فيها قولان للعلماء مشهوران: أحدهما: تجب وهو قول جمهورهم كمالك وأحمد وأبي حنيفة وغيرهم. والثاني: لا تجب وهو مذهب الشافعي وهذان القولان مبناهما: على أن الكفارة سببها الفطر من الصوم أو من الصوم الصحيح بجماع أو بجماع وغيره على اختلاف المذاهب فإن أبا حنيفة يعتبر الفطر بأعلى جنسه ومالك يعتبر الفطر مطلقا فالنزاع بينهما إذا أفطر بابتلاع

١. (سورة هود: ١١٣).

٢. رواه أحمد في المسند بسند صحيح عن أبي عبد الرحمن السلمي عن علي (رضي الله عنه). مسند أحمد بن حنبل (١/١٣١)برقم(١٠٩٥) قال المحقق شعيب الأرنؤوط: « إسناده صحيح على شرط الشيخين ».

٣. مدارج السالكين لابن القيم بتحقيق: محمد حامد الفقي (٢/٢٩٤).

حصاة أو نواة ونحو ذلك وعن أحمد رواية أنه إذا أفطر بالحجامة كفر كغيرها من المفطرات بجنس الوطء فأما الأكل والشرب ونحوهما فلا كفارة في ذلك، ثم تنازعوا هل يشترط الفطر من الصوم الصحيح ؟ فالشافعي وغيره يشترط ذلك فلو أكل ثم جامع أو أصبح غير ناو للصوم ثم جامع أو جامع وكفر ثم جامع: لم يكن عليه كفارة ؟ لأنه لم يطأ في صوم صحيح، وأحمد في ظاهر مذهبه وغيره يقول: بل عليه كفارة في هذه الصور ونحوها لأنه وجب عليه الإمساك في شهر رمضان فهو صوم فاسد فأشبه الإحرام الفاسد، وكما أن المحرم بالحج إذا أفسد إحرامه لزمه المضي فيه بالإمساك عن محظوراته فإذا أتى منها شيئا كان عليه ما عليه من الإحرام الصحيح وكذلك من وجب عليه صوم شهر رمضان إذا وجب عليه الإمساك فيه وصومه فاسد لأكل أو جماع أو عدمِ نية فقد لزمه الإمساك عن محظورات الصيام فإذا تناول شيئا منها كان عليه ما عليه في الصوم الصحيح وفي كلا الموضعين عليه القضاء..» [1].

بەڵام ئایا وەهابیەکان بەو شێوەی (ابن تیمیة) وەڵامی پرسیارە شەرعییەکان دەدەنەوە؟ کەواتە ئەوان ئەو ئەندازە تەیمی مەزهەبن کە لە تەك بۆچوونەکانیاندا یەکبگرێتەوە، هەر لە بەر ئەوەشە کە لە کاتی گفتوگۆ لە تەك وەهابیەکدا، کە قسەی کەس وەرناگرێت جگە لە (ابن تیمیه) و (ابن القیم)، وەختێکیش ئەگەر نەقڵی قسەی (ابن تیمیە)ت بۆ کرد لە (مجموع الفتاوی)یدا یان (ابن القیم) لە (مدارج السالکین) و (کتاب الروح)یدا ئەوا قەناعەت ناکەن و مل بادەدات و قسەکەی ئیمامی مالیك دووبارە دەکاتەوە کە فەرموویەتی: « کل واحد یؤخذ منه ویردّ إلا صاحب

---

١. الفتاوى الكبرى لابن تيمية بتحقيق: حسنين محمد مخلوف: (٢/٤٧١)برقم(٣٤٣).

هـذا القـبر (ﷺ) ». هەرچـەند ئـەو قەولـەی پێشـەوا مالیـك بـە رەهـا وەرناگیرێت، چونکە (الخلفاء الراشدون) و (إجماع الأمة) و (القیاس الجلي) بەڵگەی شەرعین وکەسیش ناتوانێت رەدیان کاتەوە، بـەڵام ئەوەشـتان لـە بیر نەچێت کە ئیمامی مالیك وەختێك ئەو فەرموودەی فەرمووە لە خزمەت مەرقەدی پێغەمبەردا بووە و لە خزمەت قەبری شەریفیدا (ﷺ) تەدریسـی کردووە بە بەڵگەی ئیشارەتەکەی کە دەفەرموێت: « صـاحب هـذا القـبر». دەی بۆ پەندی لێ وەرناگرن، یان خودا مەحروومی کردوون لە جیواری پـڕ بەرەکەتی ئەو زاتە، وەختێك کە خۆتانتان مەحرووم و دورەپەرێزگرت!

## ( رووی چوارەم )

پابەند نەبوونی تەیمییەکان بە مەنهـەجی ئاشـکراکراوی خۆیانـەوە لـە سەردەمی خودی (ابن تیمیه)وە تا ئەمڕۆ، رەنگی داوەتـەوە لـە نوسـراو و دانراوەکانیانـدا، بـە دانراوەکـانی خـودی (ابـن تیمیه)شـەوە، جیـاوازی و (تناقض)ێکی زۆر دەبینین بە نموونە:

١ـ لە لایەك بەرهەڵسـتی زانسـتی تەصـەووف و رابـەرانی دەکـەن، لـە لایەکیش چەندین نوسین و دانراو لە سەر شایسـتەیی تەصـەووف و چـاکی ئـەو زانسـتە لـە لایـەن (ابـن تیمیـە) و (قوتابییـەکانی) دەنوسـرێت، کـە مەجبوورن لە بڵاوکراوەکانیاندا ووتەی بەنرخی پیـاوانی تەصـەووف نـەقڵ بکەن، لەوانە کتێبی (مراتـب العبودیة لابـن تیمیـة)، یـەك بـەرگ زیـاتر لـە فەتواکانی (ابن تیمیة) فـەتوای تەصـەووف و زانسـتی ئـەخلاق ورابـەرانی، (کلمات في التصوف) لابن تیمیة، (الاستقامة لابن تیمیة)، (مـدارج السـالکین لابن القیم، (کتاب الـروح) لابـن القـیم.. هتـد. !؟ ئەگـەر وەك وەهابیـەکان

دەڵێن زانستی تەصەووف خراپە یان پیاوانی تەصەووف جێگەی متمانە نین بۆچی مەجبووریان دەبنەوە لە نوسراو وئامۆژگاریەکانیاندا؟!

٢ـ جگە لەمەش (ابن تیمیة) لە دەیان جێگەدا ستایشی ئەهلی تەصەووفی کردووەو کەچی وەهابیەکان بەردەوام زەمیان دەکەن ئەمەش (تناقض) وتێنەگەشتنە یاخود خۆ تێنەگەیاندنە لە باوەڕی (ابن تیمیة) بە ئەهلی تەصەووف، چونکە ئەو بە (مشایخ أهل الکتاب والسنة) ناو بردوون، وەك دەڵێت: «مشایخ أهل الکتاب والسنة کالفضیل بن عیاض وإبراهیم بن أدهم و أبي سلیمان الداراني ومعروف الکرخي و الجنید بن محمد و سهل بن عبد الله التستري وأمثالهم رضوان الله علیهم أجمعین»[1].

هەروەها گوتویەتی: ووشەی (عیلم) لە زاراوەی ئەهلی تەصەووفدا زیاتر بە واتای (شەریعەت) هاتووە، و چەندین نمونەی لە پێشەوایانی تەصەووفەوە نەقڵ کردووە، وەك دەڵێت: « قلت: العلم في لسان الصوفیة ووصایاهم کثیرا ما یریدون به الشریعة، کقول أبي یعقوب النهرجوري: " أفضل الأحوال ما قارن العلم". وکقول أبي یزید: " عملت في المجاهدة ثلاثین سنة فما وجدت أشد علی من العلم ومتابعته ولولا اخلتلاف العلماء لبقیت، واختلاف العلماء رحمة إلا في تجرید التوحید". وهذا کقول سهل بن عبد الله التستري: " کل فعل تفعله بغیر اقتداء طاعة أو معصیة فهو عیش النفس وکل فعل تفعله بالاقتداء فهو عذاب علی النفس". وقال أبو سلیمان الداراني:" ربما یقع في قلبي النکتة من نکت القوم أیاما فلا أقبل منه إلا بشاهدین عدلین الکتاب والسنة". وقال صاحبه أحمد بن أبي الحواري: " من عمل بلا اتباع سنة فباطل عمله ". وقال أبو حفص النیسابوري: " من

---

١. أولیاء الرحمن وأولیاء الشیطان لابن تیمیة: (ص ٨٠).

لم يزن أفعاله وأقواله كل وقت بالكتاب والسنة ولم يتهم خواطره فلا تعده في ديوان الرجال". وقال الجنيد بن محمد: " الطرق كلها مسدودة على الخلق إلا من اقتفى أثر الرسول (ﷺ)". وقال ايضا من لم يحفظ القرآن ويكتب الحديث لا يقتدى به في هذا الأمر لأن علمنا هذا مقيد بالكتاب والسنة". وقال أبو عثمان: " من امر السنة على نفسه قولا وفعلا نطق بالحكمة، ومن أمر الهوى على نفسه قولا وفعلا نطق بالبدعة، قال الله تعالى: (وإن تطيعوه تهتدوا)".[1] وقال أبو حمزة البغدادي: " من علم الطريق إلى الله سهل عليه سلوكه ولا دليل على الطريق إلى الله إلا متابعة الرسول في أحواله وأقواله وأفعاله". ومن لفظ العلم في كلامهم قول أبي عثمان النيسابوري: " الصحبة مع الله بحسن الأدب ودوام الهيبة والمراقبة والصحبة مع رسول الله (ﷺ) بأتباع سنته، ولزوم ظاهر العلم، والصحبة مع أولياء الله تعالى بالاحترام والخدمة، والصحبة مع الأهل بحسن الخلق، والصحبة مع الإخوان بدوام البشر ما لم يكن أثما، والصحبة مع الجهال بالدعاء لهم والرحمة عليهم". ومنه قول أبي الحسين النوري: " من رأيته يدعي مع الله حالة تخرجه عن حد العلم الشرعي فلا تقترين منه". وقال: " أعز الأشياء في زماننا شيئان عالم يعمل بعلمه وعارف ينطق عن حقيقته ". وقال أبو عبد الرحمن السلمي: " سمعت جدي أبا عمرو بن نجيد يقول كل حال لا يكون عن نتيجة علم فإن ضرره أكثر على صاحبه من نفعه وسئل عن التصوف فقال: الصبر تحت الأمر والنهي". وسبب تعبيرهم عن الشريعة بالعلم أن القوم أصحاب إرادة وقصد وعمل وحال..» [2].

---

١. (سورة النور: ٥٤).

٢. الاستقامة لابن تيمية، بتحقيق: د. محمد رشاد سالم (١ /٩٤- ٩٩).

هەروەها گوتویەتی: « وهذا من أصول أهل السنة وأئمة المشايخ خصوصا مشايخ الصوفية، فإن أصل طريقهم الإرادة التي هي أساس العمل، فهم في الإرادات والعبادات والأعمال والأخلاق أعظم رسوخا منهم في المقالات والعلوم، وهم بذلك أعظم اهتماما وأكثر عناية، بل من لم يدخل في ذلك لم يكن من أهل الطريق بحال، وهذا حقٌ، فإن الدين والإيمان قول وعمل، وأوله: قول القلب وعمله، فمن لم ينقد بقلبه ولم يذل لله لم يكن مؤمنا ولا داخلا في طريق الله ولهذا لم يتنازع المشايخ أن الإيمان يزيد وينقص وأن الناس يتفاضلون فيه وأن أعمال القلوب من الإيمان كما يتنازع غيرهم. وذكر أبو القاسم بعد هذا كلاما عن المشايخ في جمل مستحسنة»[1].

لە جێگەیەکی تردا لە (الفتاوى)یدا هاتووە و دەڵێت: کە دروستە وەقفی ماڵ وسەروەت لە سەر صۆفیەکان، بۆیە ئەوکات کەسێك رەوشتی جوان تیایدا بەرجەستە نەبوو، ئادابی شەریعەت تیایدا بەرکەماڵ نەبوو، رەوشتی خراپ غاڵب بوو بە سەریدا و پارەشی هەبوو ئەوا بەر ئەو وەقفە ناکەوێت و دروست نییە بۆی، چوونکە صۆفی بە مەفهومی قسەکانی (ابن تيمية) کەسێکە کە دارای گشت رەوشتە بەرزەکان و ئادابە شەرعییەکان بێت، وەك دەڵێت: «ويصحّ الوقف على الصوفية فمن كان جماعا للمال ولم يتخلق بالأخلاق المحمودة ولا تأدب بالآداب الشرعية وغلبت عليه الآداب الوضيعة أو فاسقا لم يستحق شيئا»[2].

هەروەها (ابن تيمية) لە کتێبی (شرح العقيدة الاصفهانية)یدا بە کورتی باسی ئەزموونی ئیمام ئەبو حامیدی غەزالی کردووە و کورتکراوەی

---

١. الاستقامة لابن تيمية: (١ / ١٤٤).

٢. الفتاوى الكبرى لابن تيمية (٥ / ٤٢٥).

کتێبەکەی (المنقذ من الضلال)ی نەقڵ کردووەکە تیایدا باسی تەجرەبەی خۆی دەکات کە چۆن هەرچی قوتابخانەکان هەیە بشکنیویەتی تا دواجار گەیشتووەتە حەقیقەت لە مەدرەسەی تەصەووفدا، کە بە هۆیەوە رزگاری بووە لە گومڕایی، وەك (ابن تيمية) لێیەوە نەقڵ دەکات و دەڵێت: « ثم إني لما فرغت من هذه أقبلت بهمتي على طريق الصوفية وعلمت أن طريقهم إنما يتم بعلم وعمل وكان حاصل علمهم قطع عقبات النفس والتنزه عن أخلاقها المذمومة وصفاتها الخبيثة حتى يتوصل بها إلى تخلية القلب عن غير الله تعالى وتحليته بذكر الله وكان العلم أيسر علي من العمل فابتدأت بتحصيل علمهم من مطالعة كتبهم، مثل قوت القلوب لأبي طالب المكي وكتب الحارث المحاسبي والمتفرقات المنثورة عن الجنيد والشبلي وأبي يزيد البسطامي قدس الله أرواحهم وغير ذلك من كلام المشائخ حتى اطلعت على كثير من مقاصدهم العلمية وحصلت ما يمكن أن يحصل من طريقهم بالتعلم والسماع وظهر لي أن أخص خواصهم مالا يمكن الوصول إليه بالتعلم بل بالذوق والحال وتبدل الصفات وكم من الفرق بين أن يعلم حد الصحة وحد الشبع وأسبابهما وشروطهما وبين أن يكون صحيحا شبعان وبين أن يعرف حد السكر وإنه عبارة عن حالة تحصل عن استيلاء أبخرة تتصاعد من المعدة إلى معادن الفكر وبين أن يكون سكران بل السكران لا يعرف حد السكر وأركانه وهو سكران وما معه من علمه شيء والطبيب يعرف حد السكر وأركانه وما معه من السكر شيء والطبيب في حالة المرض يعرف حد الصحة وأدويتها وهو فاقد الصحة. فكذلك الفرق بين من يعرف حقيقة الزهد وشروطها وأسبابها وبين من يكون حالة الزهد عزوف النفس عن الدنيا فعلمت يقينا أنهم أرباب أحوال لا أصحاب أقوال وأن ما يمكن تحصيله بطريق العلم قد حصلته. ولم يبق إلا ما لا سبيل إليه بالتعلم والسماع بل

بالذوق والسلوك وكان قد حصل معي من العلوم التي مارستها والمسالك التي سلكتها في تفتيشي عن صنفي العلوم الشرعية والعقلية إيمان يقيني بالله تعالى وبالنبوة وباليوم الآخر. وهذه الأصول الثلاثة كانت رسخت في نفسي بلا دليل محرر، بل باسباب وقرائن وتجارب لا تدخل تحت الحصر تفاصيلها، وكان قد ظهر عندي أنه لا مطمع في سعادة الآخرة إلا بالتقوى وكف النفس عن الهوى وإن رأس ذلك كله قطع علاقة القلب عن الدنيا والتجافي عن دار الغرور والإنابة إلى دار الخلود والإقبال بكنه الهمة على الله تعالى وإن ذلك لا يتم إلا بالإعراض عن الجاه والمال[1]. وانكشف لي في أثناء هذه الخلوات أمور لا يمكن إحصاؤها واستقصاؤها، والقدر الذي أذكره لينتفع به أني علمت يقينا أن الصوفية هم السالكون لطرق الله تعالى الخاصة وأن سيرتهم أحسن السير وطريقتهم أصوب الطرق وأخلافهم أزكى الأخلاق بل لو جمع عقل العقلاء وحكمة الحكماء وعلم والواقعين على أسرار الشريعة من العلماء ليغيروا شيئا من سيرتهم وأخلاقهم ويبدلوه بما هو خير منه لم يجدوا إليه سبيلا فإن جميع حركاتهم وسكناتهم في باطنهم وظاهرهم مقتبسة من نور مشكاة النبوه فليس وراء نور النبوة على وجه الأرض نور يستضاء به إلى أن قال ومما بان لي بالضرورة من ممارسة طريقهم حقيقة النبوة وخاصتها ثم تكلم في حقيقة النبوة واضطرار كافة الخلق إليها..»[2].

پاشان تەصدیقی ئیمامی غەزالی کردووە لە هەموو ئەو زانیاریانەی کە دەستی کەوتوون و ئەو تەجرەبەی کە کردووە یەتی و ئەو زانستە تەصەووفیانەی کە چەشتوونی و بۆی پەیدا بووە بە هۆی هەڵبژردنی

---

١. شرح العقيدة الأصفهانية لابن تيمية بتحقيق: إبراهيم سعيداي (ص ١٤٦ـ ١٤٨).

٢. شرح العقيدة الأصفهانية: لابن تيمية: (ص ١٤٨).

زانستی تەصەووفەوە، هەروەها هانی خەڵکی داوە کە چاوی لێ بکەن، چونکە ئەوەی ئەو فەرمویەتی و پێی گەشتووە راست و حەققە، پێویستە موسڵمانان ئەوەش کە ئەو نەیگوتووە قیاسی بکەن بەوەی کە ئەو دیویەتی و گوتویەتی لە عالەمی موکاشەفاتدا و باوەڕی پێبەکەن وەك دەڵێت: « قلت: فهذه الطريق التي ذكرها أبو حامد وغيره تُفضي أيضا إلى العلم من النبوة، والتصديق منها، بأكثر من القدر الذي تقر به المتفلسفة، وما ذكره من المشاهدات والكشوفات التي تحصل للصُّوفية، وأنهم يشهدون تحقيق ما أخبر به الرسول (ﷺ) ونفع ما أمر به، فهذا أيضا حقٌ في كثير مما أخبر به، وأمَرَ بهِ. ثم إذا عُلم ذلك صار حجة على صدقه فيما لم يعلمه، كمن سلك طريقا من العلم بفن من الفنون إذا رأى كلام متكلم في ذلك العلم ورآه يحقق ما عنده ويأتي بزيادات لا يستطيعها، فإنه يعلم بما رآه من مزيد تحقيقه لما شاركه في أصل معرفته أنه أعلم منه بما وراء ذلك، كمن نظر في الطب إذا رأى كلام بقراط ومن نظر في النحو إذا رأى كلام الخليل وسيبويه ومن نظر في العلوم الدينية إذا رأى كلامه أئمة السلف وكذلك من سلك مسلك الزهد والعبادة إذا بلغه سير زهاد السلف وعبادتهم ومن والى الناس وساسهم إذا رأى سيرة عمر ابن الخطاب رضي الله عنه وعمر بن عبد العزيز ونحوهما. فهذا كله مما يبين له عظمة قدر هؤلاء وأنهم كانوا أئمة في هذه الأمور وفيما يصلح ويجب من ذلك..» (١)

٣ـ (تناقض) هەیە لە تەك مەزهەبی بوونی (ابن تيميه) و قوتابیەکانی، و بەد مەزهەبی ئەمڕۆی وەهابەکاندا، وەك پێشتریش باسمانکرد. با بنوارنە فەتواکانی (ابن تيميه) و (ابن القيم) بزانن هیچ

١. شرح العقيدة الأصفهانية لابن تيمية: (ص ١٥٦).

بابەتێکی فیقهی یان عەقائیدی یان سلوکیان توانیوە باس بکەن بە بێ باسکردن و هێنانەوەی قەول و فەتوای زانایانی مەزهەبە فیقهی و ئوصوڵی و عەقەدی و تەصەووفیەکان؟!

٤ـ (تناقض) هەیە سەبارەت بە نوسراوەکانی خودی (ابن عبد الوهاب) و (کوڕەکەی) لە تەك فیکری ئێستای وەهابیەکاندا، وەك بەدی دەکرێت لەو نامەیەیدا کە کاتی خۆی (ابن عبد الوهاب) ناردوویەتی بۆ ناوچەی (قصیم) کە تیایدا هاتووە: « فهذه عقيدة وجيزة حررنها وأنا مشتغل البال لتطلعوا على ما عندي والله على ما نقول وكيل. ثم لا يخفى عليكم أنه بلغني أن رسالة سليمان بن سحيم قد وصلت إليكم وأنه قبلها وصدقها بعض المنتمين للعلم في جهتكم والله يعلم أن الرجل افترى علي أموراً لم أقلها ولم يأت أكثرها على بالي. (فمنها) قوله: إني مبطل كتب المذاهب الأربعة، وإني أقول إن الناس من ستمائة سنة ليسوا على شيء وإني أدعي الاجتهاد، وإني خارج عن التقليد وإني أقول إن اختلاف العلماء نقمة، وإني أكفر من توسل بالصالحين، وإني أكفر البوصيري لقوله يا أكرم الخلق، وإني أقول لو أقدر على هدم قبة رسول الله (ﷺ) لهدمتها، ولو أقدر على الكعبة لأخذت ميزابها وجعلت لها ميزاباً من خشب وإني أحرم زيارة قبر النبي (ﷺ) وإني أنكر زيارة قبر الوالدين وغيرهما، وإني أكفر من حلف بغير الله، وإني أكفر ابن الفارض وابن عربي، وإني أحرق دلائل الخيرات وروض الرياحين وأسمية روض الشياطين. جوابي عن هذه المسائل أن أقول سبحانك هذا بهتان عظيم. »[1].

١. الرسائل الشخصية، لمحمد بن عبدالوهاب، القسم الأول، الرسالة الأولى، عقيدته وبيان حقيقة دعوته ورد ما ألصق به من التهم (ص ٤). و مؤلفات ابن عبد الوهاب: بتحقيق: عبد العزيز زيد

هەروەها لە (الرسالة الحادية عشرة) یدا هاتووە: « بسم الله الرحمن الرحيم من محمد بن عبد الوهاب إلى عبد الله بن سحيم وبعد:..إذا تبين هذا فالمسائل التي شنع بها منها: ماهو من البهتان الظاهر وهي قوله: إني مبطل كتب المذاهب، وقوله: إني أقول إن الناس من ستمائة سنة ليسوا على شيء وقوله إني أدعى الاجتهاد، وقوله: إني خارج عن التقليد، وقوله إني أقول: إن اختلاف العلماء نقمة، وقوله إني أكفر من توسل بالصالحين، وقوله: إني أكفر البوصيري لقوله يا أكرم الخلق، وقوله إني أقول لو أقدر على هدم حجرة الرسول لهدمتها ولو أقدر على الكعبة لأخذت ميزابها وجعلت لها ميزاباً من خشب، وقوله إني أنكر زيارة قبر النبي (ﷺ)، وقوله إني أنكر زيارة قبر الوالدين وغيرهم وإني أكفر من يحلف بغير الله فهذه اثنتا عشرة مسألة جوابي فيها أن أقول: «سبحانك هذا بهتان عظيم » ولكن قبله من بهت النبي محمداً (ﷺ) أنه يسب عيسى ابن مريم ويسب الصالحين «تشابهت قلوبهم » وبهتوه بأنه يزعم أن الملائكة، وعيسى، وعزيراً في النار فأنزل الله في ذلك (إن الذين سبقت لهم الحسنى أولئك عنها مبعدون) الآية»[1].

هەروەها لە (مؤلفات الشيخ ابن عبد الوهاب)دا هاتووە لە وەڵامدانەی (ابن سحيم)دا: کە دەڵێت: « والله يعلم أن الرجل افترى عليّ أموراً لم أقلها،

---

الرومي + د. محمد بلتاجي + د. سيد حجاب: (ص ١١)، وينظر كذلك: مفاهيم يجب أن تصحح، للشيخ محمّد بن علوي المالكي: (ص ٣٠٥).

١. بنواڕە: الرسائل الشخصية، لمحمد بن عبدالوهاب، القسم الأول، الرسالة الحادية عشرة: رسالة أرسلها جواباً لعبد الله بن سحيم مطوع أهل المجمعة حين سأله عن الكتاب الذي أرسله سليمان بن محمد بن سحيم مطوع أهل الرياض (ص ٣١ـ ٣٣). ومؤلفات ابن عبد الوهاب بتحقيق: عبد العزيز زيد الرومي، د. محمد بلتاجي، د. سيد حجاب، (ص ٦٤).

ولم يأت أكثرها على بالي، فمنها قوله: أني أقول أن الناس من ستمائة سنة ليسوا على شيء، وأني أكفر من توسل بالصالحين، وأني أكفر البوصيري، وأني أكفر من حلف بغير الله.. جوابي عن هذه المسائل أن أقول سبحانك هذا بهتان عظيم» [1].

هەروەها لەو نامە کورتکراوەی کە کوڕەکەی (ابن عبد الوهاب) نوسیویەتی بە ناونیشانی «رسالة للشيخ عبد الله بن الإمام محمد بن عبد الوهاب اختصرها من رسالة لأبيه الشيخ الإمام رحمهما الله تعالى» سەبارەت بە وەزع و عەقیدەی باوکی کە لە سەرچاوەکانی خودی وەهابیەکاندا وەرگیراوە و لە زۆرێك بیر و عەقیدە وبۆچووندا دژایەتی هەیە لە تەك بیرو باوەڕی وەهابیەکان و هەندی دانراوی تری (ابن عبد الوهاب) لەوانە (مسائل الجاهلیه)کەی.

کە ئەمەی لای خوارەوە دەقەکەیەتی: « قال الشيخ عبد الله بن محمد بن عبد الوهاب رحمه الله تعالى: «إن مذهبنا في أصول الدين مذهب أهل السنة والجماعة، وطريقتنا طريقة السلف، ونحن في الفروع على مذهب الإمام أحمد، ولا ننكر على من قلّد الأئمة الأربعة دون غيرهم، لعدم ضبط مذاهب غيرهم كالرافضة والزيدية والإمامية، فلا نقرهم على شيء من مذاهبهم الفاسدة، بل نجبرهم على تقليد أحد الأئمة، ولا نستحق مرتبة الاجتهاد المطلق، ولا أحد يدعيها لدينا إلا أننا في بعض المسائل إذا صحّ لنا نهي جلي من كتاب الله أو سنّة غير منسوخ ولا مخصص ولا معارض بأقوى منه وقال به أحد الأئمة أخذنا به، وتركنا المذهب كإرث الجد والأخوة، فإنا

---

١. مؤلفات ابن عبد الوهاب: بتحقيق: عبد العزيز زيد الرومي، د. محمد بلتاجي، د. سيد حجاب (ص ١٢) ودعاوى المناوئين لدعوة الشيخ محمد ين عبد الوهاب لعبد العزيز بن محمد بن علي: (ص ٢٠٤).

نتقدم الجد بالإرث، وإن خالف مذهب الحنابلة، ولا نفتش على أحد في مذهبه، ولا نعترض عليه. وإذا اطلعنا على نهي جلي كذلك مخالف لمذهب بعض الأئمة وكانت المسألة مما يحصل بها شعارٌ ظاهر كإمام الصلاة فنأمر الحنفي والمالكي مثلاً بالمحافظة على نحو الطمأنينة والاعتدال والجلوس بين السجدتين لوضوح دليل ذلك بخلاف جهر الإمام الشافعي بالبسملة، وشتان بين المسألتين، فإذا قوي الدليل أرشدناهم للنص، وإن خالف المذهب وذلك إنما يكون نادراً جداً، ولا مانع من الاجتهاد في بعض المسائل دون بعض، فلا مناقضة لعدم دعوى الاجتهاد المطلق، وقد سبق جمع من علماء المذاهب الأربعة إلى اختيارات لهم في بعض المسائل مخالفين للمذهب الملتزمين تقليد صاحبه، ثم إنا نستعين على فهم كتاب الله بالتفاسير المتداولة المعتبرة، ومن اجلها لدينا تفسير ابن جرير ومختصره لابن كثير الشافعي، وكذلك البيضاوي والبغوي والخازن والحداد والجلالين وغيرهم. وعلى فهم الحديث بشروحه كالقسطلاني والعسقلاني على البخاري والنووي على مسلم والمناوي على الجامع الصغير، ونحرص على كتب الحديث خصوصاً الأمهات الست وشروحها ونعتني بسائر الكتب في سائر الفنون أصولاً وفروعاً وقواعد وسيراً وصرفاً ونحواً وجميع علم الأمة. ولا نأمر بإتلاف شيء من المؤلفات أصلاً إلا ما توقع الناس في الكفر كروض الرياحين، أو يحصل بسببه خلل في العقائد كعلوم المنطق، فإنه قد حرمه كثير من العلماء، على أنا لا نفحص على مثل ذلك، وكالدلائل إلا إن تظاهر به صاحبه معانداً أتلف عليه[1]، وما اتفق لبعض البدوان في إتلاف كتب أهل

---

١. شايەنی وەبیرهێنانەوەیە کە ئەو سەرچاوانەی (ابن عبد الوهاب) باسی کردوون و بەو رەهایە فەتوای بە سوتاندنی داوە، هەروەها بیرو بۆچوونی بەرانبەر زانستی (المنطق)، ئەوە رای خۆیەتی و زانایانی ئیسلام لە سەردەمی خۆیەوە تا ئەمڕۆش بە دانراوی بەهێز وەڵامیان

الطائف إنما صدر لجهله وقد زجر هو وغيره عن مثل ذلك. ولا نرى قتل النساء والأطفال، وأما ما يكذب علينا ستراً للحق وتلبيساً على الخلق بأنا نقرأ القرآن لرأينا، ونأخذ من الحديث ما وافق فهمنا من دون مراجعة شروح، ولا نعول على شيخ، وأنا نضع من رتبة نبينا محمد (ﷺ) بقولنا: النبي رمة في قبره، وعصا أحدنا أنفع منه، وليس له شفاعة، وأن زيارته غير مندوبة، وأنه كان لا يعرف معنى (لا إله إلا الله) حتى أنزل عليه (فاعلم أنه لا إله إلا الله) مع كون الآية مدنية، وأنا لا نعتمد أقوال العلماء، ونتلف مؤلفات أهل المذاهب، لكون فيها الحق والباطل، وأنا مجسمة، وأنا نكفر الناس على الإطلاق، ومن بعد الست المائة إلا من هو على ما نحن عليه. ومن فروع ذلك أن لا نقبل بيعة أحد حتى نقرّر عليه بأنه كان مشركاً وأن أبويه ماتا على الإشراك بالله، وأنا ننهى عن الصلاة على النبي (ﷺ)، ونحرم زيارة القبور المشروعة مطلقاً، وأن من دان بما نحن عليه سقط عنه جميع التبعات حتى الدّيون، وأنا لا نرى حقاً لأهل البيت (رضوان الله عليهم)، وأنا نجبر على تزويج غير الكفؤ لهم، وأنا نجبر بعض الشيوخ على فراق زوجته الشابة لتنكح شاباً على مرافعة لدينا ولا وجه لذلك، فجميع هذه الخرافات وأشباهها لما استفهمنا عنها من ذكر أولاً ما كان جوابنا عليه في كل مسألة من ذلك إلا «سبحانك هذا بهتان عظيم». فمن روى عنّا شيئا من ذلك، أو نسبه إلينا، فقد كذب علينا وافترى، ومن شاهد حالنا، ورأى مجلسنا، وتحقق ما عندنا علم قطعاً أن جميع ذلك وضعه علينا وافتراه جماهير أعداء الدين، وإخوان الشياطين، تنفيراً للناس عن الإذعان لإخلاص التوحيد لله

---

داوەتەوە، کە لێرەدا جێگەی ئەو باسانە نییە، چونکە بۆ خۆشی پێشتر وەڵامی خۆی داوەتەوە لە نامەکەی پێشویدا بۆ (أهل القصيم) کە دەڵێت من فەتوای سوتاندنی ئەو کتێبانەم نەداوە ئەوە ئیفتیرایە بە دەم منە کراوە!؟ والله كما ترى هذا غاية في التناقض؟

بالعبادة، فإنا نعتقد أن من فعل أنواعاً من الكبائر كالقتل للمسلم بغير حق والزنا والربا وشرب الخمر وتكرّر ذلك منه لا يخرج بفعل ذلك عن دائرة الإسلام، ولا يخلد به في دار الانتقام، إذا مات موحداً لله في جميع أنواع العبادة. والذي نعتقده في مرتبة نبينا محمد (ﷺ) أنها أعلى مراتب المخلوقات على الإطلاق، وأنه حيٌّ في قبره حياةً مستقرةً أبلغ من حياة الشهداء المنصوص عليها في التنزيل، إذ هو أفضل منهم بلا ريب، وأنه يسمع سلام من يسلم عليه، وتسن زيارته إلا أنه لا يشد الرّحال إلا لزيارة المسجد والصلاة فيه، وإذا قصد مع ذلك الزيارة فلا بأس، ومن أنفق نفيس أوقاته في الاشتغال بالصلاة عليه الواردة عنه فقد فاز بسعادة الدارين وكُفي همه كما جاء في الحديث، »[1].

شايەنی باسە ئەو نامەیەی (ابن عبد الوهاب) بە تەواوەتی (أبو المعالي الآلوسی) نەقڵی کردووە لە کتێبەکی خۆیدا بە ناونیشانی (تاريخ نجد) کە (د. صالح بن عبدالله بن عبد الرحمن العبود) لە کتێبی (عقيدة الشيخ محمد بن عبد الوهاب السلفية وأثرها في العالم الإسلامي) یاداشتی کردووە تیایدا بەرگری لە (ابن عبد الوهاب) دەکات و دەڵێت شتی زۆر بە دەمەوە هەڵبەستراوەو پاشان بەرگری لێ دەکات و دەڵێت: « ولأصالتهم في عقيدة السلف الصالح" فإننا نجد عقيدة الشيخ محمد بن عبد الوهاب السلفية لديهم يحكيها العلامة أبو المعالي محمود شكري الألوسي في مؤلفه (تاريخ نجد) فقد قال (رحمه الله): "اعلم أن أهل نجد كلهم مسلمون مؤحدون، بل وجميع سكنة جزيرة العرب، وقد دخلوا في الإسلام في العصر

١. بنواڕە: حوار مع الصوفية، للمدعو أبي بكر العراقي: (ص ٣٥ـ٣٨). وصيانة الإنسان، لمحمد بشير الهندي: (ص٤٨٣–٤٨٤).

الأول عند ظهور أنوار الشريعة الغراء، وهم على عقائد السلف الصالح". ثم ذكر اعتقادهم في الله تعالى، وذكر اعتقادهم في الرسول(ﷺ) واعتقادهم في الآل والأصحاب، إلى أن قال: "والحاصل أن مذهبهم في أصول الدين مذهب أهل السنة الجماعة، وأن طريقتهم طريقة السلف التي هي الطريق الأسلم، بل الأحكم". ثم ذكر: "وأنهم في الفروع على مذهب الإمام أحمد بن حنبل نضر الله وجهه، ولا ينكرون على من قلد أحدا من الأئمة الأربعة، دون غيرهم" لعدم ضبط مذهب الغير، كالشيعة، والزيدية، والكرامية، ونحوهم...." إلى آخر ما حكاه في هذا الموضوع. إلى أن قال: « وأنهم لا ينكرون كرامات الأولياء، ويعترفون لهم بالحق، وأنهم على هدى من ربهم مهما ساروا على الطريقة الشرعية والقوانين المرعية" غير أنهم لا يستحقون شيئا من أنواع العبادة" لا حال الحياة ولا بعد الممات، بل يطلبون من أحدهم الدعاء في حال الحياة، بل ومن كل مسلم، فقد جاء في الحديث: " دعاء المرء مستجاب لأخيه " ويثبتون الشفاعة للنبي (ﷺ) يوم القيامة حيثما ورد، وكذا سائر الأنبياء والملائكة والأولياء والأطفال حيثما ورد أيضا، ويسألونها من الله تعالى المالك لها والآذان فيها لمن شاء من الموحدين الذين هم أسعد الناس بها كما ورد، فإنهم يقولون متضرعين إلى الله تعالى: اللهم شفع نبينا محمدا (ﷺ) فينا يوم القيامة أو عبادك الصالحين أو ملائكتك ونحو ذلك، ولا يلزم أن يكونوا مجسمة، وإن قالوا بالجهة، كما ورد الحديث بها، ويقولون فيمن مات: تلك أمة قد خلت، لها ما كسبت، ولكم ما كسبتم، ولا تسألون عما كانوا يعملون، ولا يقولون بكفر من صحت ديانته واشتهر صلاحه وعلمه وورعه وزهده وحسنت سيرته وبالغ في نصح الأمة، وإن كان مخطئا في هذه المسألة أو غيرها، كابن حجر الهيتمي المكي رحمه الله، فإنهم يعلمون كلامه في "الدر المنظم"، ولا ينكرون سعة علمه، ولهذا يعتبرون ما بقي من كتبه

ك"شرح الأربعين" و "الزواجر" وغيرها، ويعتمدون على نقله. وما كتبناه في هذا الحاصل هو مضمون رسالة كتبها أحد فضلاء علماء نجد، وهو الشيخ عبد الله ابن العلامة الشيخ محمد بن عبد الوهاب عليهم الرحمة، وقد قرئت عند دخول الأمير سعود بن عبد العزيز في الحرمين الشريفين بمحضر علماء المذاهب الأربعة، وبمسمع منهم »[1].

ئێمه لێرەدا كه نەقڵی ئەم نامانەمان كردووه مەبەستمان ئەوه نییه هەرچی هاتووه تیایداو و (ابن عبد الوهاب) گوتویەتی راست و دروستە، چونكه هەم رەخنەمان لە هەندێك عیبارەتی هەیە كه بە ئاشكرا هەڵەیە، هەم ناشزانین عاقیبەتی ئەو كابرا چۆن بووه، ئایا بڕوا بەمەی بكەین یان بڕوا به نامه ونوسواوەكانی تری به تایبەت (مسائل الجاهلیة)كەی. بەڵام لە نەقڵی ئەم نامانەیدا كه راستەو خودی كوڕەكەیی هەوادارانی گێڕاویانەتەوەو وەهابیەكانی سەردەمیش لە سەرچاوەكانی خۆیاندا یاداشتیان كردووه، مەبەستمان ئەوەیه كه تەنانەت لەو ئەندازەشدا كه (ابن عبد الوهاب) پاكانەی كردووه و لە سەر پەیڕەوی زانایانی ئیسلام رۆشتووه ئێوەی وەهابی ئەم سەردەمە بڕواتان پێی نییە، بۆیە یان دەبێت بڵێن (ابن عبد الوهاب)یش موبتەدیع و گومڕا بووه، چونكه بڕوای بەو كۆمەڵە شتانە هەبووه كه باسی كردووه، یان ئیقرار بكەن كه ئێوه لاتان داوه تەنانەت له بیرو بۆچوونی (ابن عبد الوهاب)یش! كەواتە یان ئەو راست دەكات لە شتانەی كه دانی پێادا ناوه و ئێوه درۆدەكەن كه نایسەلمێنن، یان ئێوه راست دەكەن و ئەو درۆی كردووه به نیفاقەوه ئەو

١. بنواره: عقيدة الشيخ محمد بن عبد الوهاب السلفية وأثرها في العالم الإسلامي، د. صالح بن عبدالله بن عبد الرحمن العبود(ص٣٣٧ـ٣٤٠). وتاريخ نجد لمحمود شكري الألوسي بتحقيق محمد بهجة الأثري:(ص٤٠–٨٧).

قسانەی کردووە بۆ ئەوەی سۆزی موسڵمانان و زانایان بۆ لای خۆی رابکێشێت؟!

٥ــ زۆر زاراوەی تەصەووفی هەیە ئەگەر صۆفیەکان لە رووی شایستەیی یەوە بۆ رابەرانی تەصەوف بەکاری بهێنن ئێوە بە بیدعەتی دەزانن، لەو زاراوەو دەستەواژانە (قدس الله روحه)، (نور الله ضريحه)،(قطب العارفين)، (النور المحمدي) (تاج العرفين)، (الواسطة)(قطب فلك الأنام) (قطب الدنيا)..هتد کەچی خودی (ابن تيمية) و قوتابیەکانی لە دەیان جێگەدا لە نوسراوەکانیاندا بۆ پیاوانی تەصەووف وبۆ خۆشیان بەکار هێناوە و قوتابیەکانی (ابن تیمیه) بەرانبەر خودی (ابن تیمیه) تەواوی ئەو زاراوانەیان بە زیاترەوە لە مەدح و ستایشیدا بەکاریان هێناوە!

ئیتر نازانین ئایا مەوقیفی ئێوە لە بەرانبەر ئەو زاراوەو دەستەواژانەدا دەگۆڕێت؟ یان (ابن تيمية) و (ابن القيم) و (ابن ناصر الدين الدمشقي و ابن عبد الهادي و..هتد) پێتان گومڕاو موبتەدیعن؟ یان بانێکەو دوو هەوا؟ واتە (ئەگەر بە شایستەیی بەکار هات بۆ دۆستانی خودا ئەوا پێتان نادروستە، بەڵام ئەگەر بۆ شان وتاریفاتی (ابن تیمیه) بەکار هات ئەوا دروستە بیدعەیەکی و چاکە)!؟ نمونەکان زۆرن تەنها چەند نمونەیان دەهێنینەوە لەم دەقانەی لای خوارەوەدا:

أ- (ابن تيمية) لە کتێبی (أولياء الرحمن)یدا بەرانبەر (سيد الطائفتين الجنيد بن محمد البغدادي) بەکاری هێناوە کە ئەمە دەقەکەیەتی: « فإن الجنيد قدس اللهُ روحه كان من أئمة الهُدى، فسُئل عن التَّوحيد فقال:

"التوحيد إفراد الحدوث عن القدم " فبيّن أن التوحيد أن تميّز بين القديم والمحدث، وبين الخالق والمخلوق»[1].

ب ـ (شمس الدين ابن القيم) قوتابی (ابن تيمية) له كتێبی: (مدارج السالكين)يدا: بەرانبەر دانەری مەتنی كتێبەكە واتە: (منازل السائرين) للإمام الصوفي شيخ الإسلام أبي إسماعيل عبدالله بن محمد الهروي الأنصاري المتوفی ٤٨١هـ) ئەو دەستەواژەی بەكارهێناوە وەك دەڵێت: «فصلٌ: قال صاحب المنازل قدس الله روحه: الرجاء على ثلاث درجات الدرجة..» [2]

هەروەها له دەیان جێگەدا به رانبەر (ابن تیمیه) له پاش مردنیشی بەكاری هێناوە، لەوانە: وەك دەڵێت: « وكثيرا ما كنت أسمع شيخ الإسلام ابن تيمية قدس الله روحه يقول إياك نعبد تدفع الرياء وإياك نستعين تدفع الكبرياء» [3]. «وسمعت شيخ الإسلام ابن تيمية قدس الله روحه يحكي عن بعض العارفين أنه قال..» [4]. «فإنه لا نعيم له ولا لذة ولا ابتهاج ولا كمال إلا بمعرفة الله ومحبته والطمأنينة بذكره، والفرح والابتهاج بقربه، والشوق إلى لقائه، فهذه جنته العاجلة، كما أنه لا نعيم له في الآخرة،ولا فوز إلا بجواره في دار النعيم في الجنه الآجلة، فله جنتان لا يدخل الثانية منهما إن لم يدخل الأولى، وسمعت شيخ الإسلام ابن تيمية قدس الله روحه يقول: إن

---

١. أولياء الرحمن وأولياء الشيطان لابن تيمية الحراني(ص ٨٧).
٢. مدارج السالكين لابن القيم بتحقيق: محمد حامد الفقي: (٢ / ٥٢).
٣. مدارج السالكين لابن القيم: (١ / ٥٤).
٤. مدارج السالكين لابن القيم: (١ / ٢٦٠).

في الــدنيا جنــة مــن لم يدخلــها لم يــدخل جنــة الآخــرة، وقــال بعــض العارفين..»[1].

ج ـ قوتابى(ابن تيمية) واته (ابـن ناصـر الـدين الدمشـقي) لـه وهصـف وتاريفاتى (ابن تيمية)دا له كتێبى (الرد الوافر)يدا دهڵێت: « شيخ الاسلام، علم الزهاد، قطب فلك الأنام، أبـي العبـاس أحمـد بـن عبـد الحلـيم بـن عبـد السلام ابن تيمية الحراني قدس الله روحه..» [2]. بنـوارِن لـهو عيبارهتانـهى (ابـن ناصـر الـدين) چ غولـو زيـادهڕهوى و إطـرائێكـى تيادايـه، كـه تيايـدا تهوصيفى (ابن تيميه)ى كردووه به: ١ـ شيخ الإسلام، ٢ـ علـم الزهـاد، ٣ـ قطب فلك الأنام. پاشان به (قدس الله روحه) كۆتايى هێناوه.

بێگومان پلهى (القطبية) زاراوهيهكى تهصهووفييه،و نازنـاوى هەنـدێك له دۆسـتانى خودايـه كـه گهشـبن بـه مهرتهبـهى (القطبيـة) لـه بهندايـهتى خودادا[3].

---

١. مدارج السالكين لابن القيم: (١/ ٤٥٤).

٢. الرد الوافر لابن ناصر الدين الدمشقي بتحقيق: زهير الشاويش (ص ٩٧).

٣. شايەنى باسه زۆرێك له زانايانى ئيسلام لـه سـەر سـەلماندن و واتـاى دروسـتى ئـەو زاراوانـه دانراويان هەيه، لەوانه:

١ـ (رسالة القطب والنقباء). للشيخ الأكبر محي الدين محمد بن عمر الأندلسي الطائي أبي عبد الله الشهير بابن عربي المتوفى ٦٣٨هـ ذكرها الباباني في هدية العارفين (٢/٥).

٢ـ (رسـالة الخـبر الـدال علـى وجـود القطـب والأوتـاد والنجبـاء والأبـدال) للحـافظ جـلال الـدين السيوطي، مطبوعة ضمن كتابه (الحاوي للفتاوي) قال في مقدمتها:« فقد بلغني عن بعض من لا علم عنده إنكار ما اشتهر عن السادة الأولياء من أن منهم أبدالاً ونقباء ونجباء وأوتاداً وأقطاباً، وقد وردت الأحاديث والآثار بإثبات ذلك فجمعتها في هذا الجزء لتستفاد ولا يعول على إنكار أهل العناد وسميته الخبر الدال على وجود القطب والأوتاد والنجبـاء والأبـدال والله الموفـق. فـأقول: ورد في ذلك مرفوعاً وموقوفاً من حديث عمر بن الخطاب، وعلي بن أبـي طالـب، وأنـس، وحذيفـة بن اليمان، وعبادة بن الصامت، وابن عباس، وعبد الله بن عمر، وعبد الله بن مسعود، وعوف بن

له گەڵ ئەوەشدا لە نەزانینیانەوە وەهابیەکان خەڵکی لە سەر گومڕا دەکەن، ئەگەر ڕاست بێت (ابن تیمیة) گەشتبێتە ئەو مقام و پلەیە، باشە چۆن و بە شەهادەتی کام لە (أولیاء الله) و لە ڕێگەی چ مورشیدێکی تەصەووفەوە؟ هەروەها (قوتبی فەلەکی ئەنام) بە بێ (استثناء) گشت مەخلوقات ئەگرێتەوە بە (أنبیاء، ملائکة، صدیقین، شهداء، صالحین)ەوە، بە (صەحابەو تابیعین و پێشەوایانی سەلەفەوە)، ئایا ئەمە ڕاستە و ئەم دەعوا بە پێی شەریعەتی ئیسلام موسەڵلەمە؟ ئایا ئەمە لە قاڵبی (إطراء) و (إسراف) لە مەدح و ستایشدا دەرنەچووە بۆ درۆیەکی ڕوون و ئاشکرا؟ کە بە تێکڕای دەنگی زانایانی تەصەووف هیچ وەلییەك ناگاتە پلەی هیچ صەحابەیەك نەك پێغەمبەران؟! وەك پێشەوا (عبد الوهاب الشعرانی) سێ مەبحەسی بۆ تەرخان کردووە بە تەفصیل لە کتێبی (الیواقیت والجواهر في بیان عقائد الأکابر) بەم شێوەیە دەفەرموێت: « المبحث الثاني والأربعون: في بیان أن الولایة وإن جلّت مرتبتها وعظمت فهي آخذة عن النبوة شهودا ووجودا.. المبحث الثالث والأربعون: في بیان أن أفضل الأولیاء المحمدیین بعد الأنبیاء والمرسلین أبو بکر ثم عمر ثم عثمان ثم علي رضي الله عنهم

---

مالك، ومعاذ بن جبل، وواثلة بن الأسقع، وأبي سعید الخدري، وأبي هریرة، وأبي الدرداء، وأم سلمة رضي الله تعالى عنهم ومن مرسل الحسن، وعطاء، وبکر بن خنیس ومن الآثار عن التابعین ومن بعدهم ما لا یحصى » الحاوي للفتاوي للحافظ السیوطی بتحقیق: عبد اللطیف حسن عبد الرحمن: (٢ / ٢٢٩-٢٤٢). وذکرها المحدث محمد بن جعفر الکتاني في الرسالة المستطرفة لبیان مشهور کتب السنة المصنفة (ص ٢١٨). والکاتب الحلبي حاجي خلیفة في کشف الظنون (١/٧٠٠) والباباني في هدیة العارفین (١/٢٨٣).

٣- (رسالة إجابة الغوث ببیان حال النقباء والنجباء والأبدال والاوتاد والغوث) تألیف السید محمد امین بن عمر المشهور بابن عابدین الحنفي. ذکرها الباباني في إیضاح المکنون في الذیل على کشف الظنون (٣/٢٥).

أجمعين..المبحث الخامس والأربعون: في بيان أن أكبر الأولياء بعد الصحابة (رضي الله عنهم) القطبُ ثم الأفراد على خلاف في ذلك، ثم الإمامان، ثم الأوتاد، ثم الأبدال، رضي الله عنهم أجمعين..» [1].

له جێگەیەکی تردا(ابن ناصر الدين الدمشقي) نەقڵی کردووە لە وەصفی (ابن تيمية)دا و دەڵێت: « سئل الشيخ، الامام، العلامة، شيخ الاسلام، مفتي الأنام، بقية السلف الكرام، العالم، الرباني، والحبر، النوراني، مظهر آثار المرسلين، وكاشف حقائق الدين، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن عبد السلام ابن عبد الله بن أبي القاسم ابن تيمية الحراني قدس الله روحه..» [2]. کە تیایدا دوازدە تەعریف وتەوصیفی (ابن تيمية)ی کردووە کە هەندێکیان تەواو (غلو و إطراء و تقديس)ی تیادایە، بەڵام چونکە بۆ (ابن تيمية)ی بەکار هێناوە، هیچ وەهابیەك هەڵوێستی نەبووەو ناشیبێت، بەڵام ئەگەر بە چارەکی ئەو تاریفاتە وەصفی حەزرەتی رسول الله بکرێت(ﷺ) لە لایەن زانایانی ئیسلامەوە، دەمەودەست دەڵێن: ئەوە دەرچوون و رۆچوونە لە ستایشدا؟! ئەم رەوشتەیان بێگومان (تعصُّب) و (تناقض) یان ئەسەلمێنێت، کە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەو تاریفاتانە بە شایستە نازانن، بەڵام بۆ (ابن تيمية) لەوەش زیاترش بە شایستە دەزانن!؟

د ـ هەروەها قوتابییەکی تری (ابن تيمية) وەصفی مامۆستاکەی کردووە لە سەر زمانی یەکێکی تر لە قوتابیەکانی بە (القُطب وصاحب النور المحمدي) ئەویش بریتییە لە (ابن عبد الهادي المقدسي المتوفى

---

١. بنوارە: اليواقيت والجواهر في بيان عقائد الأكابر أبي المواهب عبد الوهاب الشعراني المصري الحنفي المتوفى ٩٧٣هـ: (ص ٤٣٥ـ ٤٥٥).

٢. الرد الوافر لابن ناصر الدين الدمشقي(ص ٤٢).

٧٤٤هـ) كه له كتێبی (العقود الدرية)یدا كه دهڵێت: « كشف الله لنا ولكم بواسطة هذا الرجل (ابن تيمية) عن حقيقة دينه الذي أنزله من السماء وارتضاه لعباده، وبيّن لكم بهذا النور المحمدي ضلالات العباد وانحرافاتهم »[1] واته: « خودا به واسیطه ی ئهو پیاوهوه كه (ابن تیمیه) به حهقیقهتی دینی ئیسلامی بۆ روونكردینهوه، كه له ئاسمانهوه رهوانهی كردبوو وه رازی بوو كه ببێته مهنههجی بهندهكانی، ههروهها به هۆی ئهو نوری موحهممهدهوه واته (ابن تيمية)، گومڕایهكانی بهندهكانی بۆ ئاشكرا كردن ». باشه خۆ وههابیهكان و تهیمییهكانیش بڕوا یان نه به واسیته ههیهو نه به وهسیله، نه به نوورو رۆشنایی حهزرهتی موحهممهد (ﷺ). بهڵام چوونكه ئهو صیفهتانه بۆ (ابن تيمية) بهكار هاتووه ههمویان پێی رازین و نوتوقیان لێ نایه! له كاتێكدا ئهو مهدحه ئهوهنده رۆچوونی تیادایه، (ابن تیمیه)ی كردووه به واسیتهی نێوان خودا و بهندهكانی وهیچ رۆڵ ودهورێكی بۆ پێغهمبهری خودا (ﷺ) نههێشتووتهوه! ؟ له كاتێكدا ههر وههابیهكانن دهڵێن: واسیتهو وهسیله نییه له نێوان عهبد و خودادا!

له جێیهكی تردا كردوویانه به (معصوم) و به (قطب)ی ههموو دونیا، ههروهها به (حهزرهتی عالی) ناویان بردووه، كه وههابیهكان و تهیمییهكان ووشهی (حهزرهتیان) پێ ووشهیهكی بیدعهته و به شایستهی نازانن تهنانهت بۆ پێغهمبهری خوداش(ﷺ)، بهڵام بۆ (ابن تيمية) هیچ عهیبی نییه! وهك (ابن عبد الهادي) له ستایشی (ابن تيمية)دا دهڵێت: « وليس يقع من مثله أمرٌ ينقم منه عليه، إلا أن يكون أمراً قد لبس عليه ونسب إلى

---

١. العقود الدرية في مناقب أحمد بن تيمية لابن عبد الهادي المقدسي بتحقيق: محمد حامد الفقي: (ص ٣٢٥).

ما لا ينسب مثله إليه، والتطويل على الحضرة العالية لا يليق، إن يكن في الدنيا قطبٌ فهو القطب على التحقيق »[1]. واتە « هەرگیز لە (ابن تیمیه)وە شتێك روو نادات كە جێگەی رەخنەو سەرزەنشت بێت، مەگەر شتێك كە لێی تێكچووبێت، كە ئەوەش ئاستەمە بدرێتە پاڵ ئەو زاتە چونكە ئەو دوورە لە زەڵلەو گوناه، بۆیە ئەكاتیش ئەو زەڵلەیە نابێت بدرێتە پاڵی، درێژەدان بە ستایشی ئەو حەزرەتە عالی جەنابە لێرەدا جێگەی نییە، بەڵام ئەوەندە بزانن ئەگەر لە دونیادا قوتب هەبێت، ئەوا بە دڵنیایی ئەو قوتبە ئەوە، واتە ابن تیمیە یە».

لە جێگەیەكی تردا(ابن عبد الهادی) لە باسی پاش مردنی(ابن تیمیە)ی مامۆستایدا باسی مەشهەدەكە دەكات كە چۆن بووە خەڵكی چییان بۆ كردووە دەڵێت: « وشرب جماعة الماء الذي فضل من غسله، واقتسم جماعة بقية السدر الذي غسّل به، وقيل: إن الطاقية التي كانت على رأسه دفع فيها خمسمائة درهم، وقيل: إن الخياط الذي فيه الزنبق الذي كان في عنقه بسبب القمل دُفع فيه مائة وخمسون درهما، وحصل في الجنازة ضجيج وبكاء وتضرّع، وختمت له ختم كثيرة بالصالحية والبلد، وتردّد الناس إلى قبره أياما كثيرة ليلاً ونهاراً، ورؤيت له منامات كثير صالحة»[2] واتە: « خەڵكی تەبەرروكیان دەكرد بە پاشماوەی ئاوی شۆردنەكەیەوە و خواردیانەوە، پاشماوەی ئەو سیدرو صابوونەی پێی شۆردرا دابەش كرا بە سەر خەڵكی دا بۆ تەبەرروك، هەروەها كڵاوەكەی سەری بە پێنج سەد دیرهەم فرۆشرا، ئەو خەیت و پەتەی كە وەك تەمیمە بە گەردنیەوە

١. (العقود الدرية لابن عبد الهادي المقدسي بتحقيق: محمد حامد الفقي: (ص٣٧٣).

٢. (العقود الدرية: ص٣٨٧).

هەڵیواسیبوو وە لە زەنبەق دروستکرابوو بە مەبەستی مەحفوزی و پاراستنی لە کێچ و ئەسپێ بە سەدوو پەنجا دیرهەم فرۆشرا، هەروەها وەختێك کە مرد هەراو گرمەو گریان و لالانەوە گەڕەکی (صالحیة)ی شاری دیمەشقی داگرت و چەندین خەتمی قورئانی بە سەرەوە کرا وخەڵکی بەردەوام شەوو رۆژ دەچوونە زیارەتی گۆڕەکەی و چەندین خەونی چاکی پێوە بینرا ».

باشە خوێنەرانی دانیشمەند: ئایا وەهابیەکان تەواوی گفتوگۆیان لە سەر وەلامدانەوەی ئەو بابەتانە نییە، کە پێیان نادروستە بۆ پێغەمبەران و دۆستانی خودا، با چەندین بەڵگەی شەرعیشی لە سەر بێت، (جگە لە گرمەو ناڵەو لاواندنەوە ولالانەوە کە کە ئەوە بیدعەتێکی خراپە) ئەی ئەو شتانەیان بۆ (ابن تیمیة) چۆن پێ دروستە؟! ئەگەر دروستە بۆ ئەو، ئەی بۆ چاکتر لەو بە ئیتیفاق بۆ دروست نییە؟ ئەگەر بۆ ئەویش دروست نییە بۆچی هەڵوێستان نییە و ناڵێن قوتابیەکانی (ابن تیمیة) درۆیان بەدەمەوە کردووە، یان درۆیان بەدەم خەڵکی دیمەشقەوە کردووە، یان هۆگران وموریدانی (ابن تیمیة) کە ئەوکارانەیان کردوووە گومڕاو سەر لێ شێواو بوون؟! ئەمانە هەمووی نا مەنهەجییەتی و نار استی و نا مەوزوعییەتی تەیمییەکان و وەهابیەکانی پاشماوەی ئەو دەسەلمێنێت، شتێکیش نییە ئێمە گوتبێتمان، یان خەڵکێکی نا تەبا لە تەك (ابن تیمیە)دا، بەڵکو هەمووی لە خودی قوتابیەکانی (ابن تیمیە)و هۆگرانیەوە دەیانگێڕینەوە..

هـ ـ هەروەها یەکێکی تر لە موریدان و موقەللیدانی (ابن تیمیە) واتە (الشیخ مرعي بن یوسف الکرمي التیميّ الحنبلي المتوفی ١٠٣٣هـ) لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناونیشانی (الشهادة الزکیة في ثناء الأئمة لابن تیمیة) دەیان عیبارەت دەبینیت کە (ما أنزل الله بها من سلطان)! لە ستایش

وتەقدیسی بیّ سنووری (ابن تیمیة)دا موقەللیدەکانی گوتویانە، هەر ئەوەیە نالّێن خودایە، یان پێغەمبەرە(والعیاذ بالله)، ئەگەر نا زۆر لە ئەوصافی پێغەمبەریان داوە پێی لەو عیبارەتانەی وەك هاتووە: «قال (ابن القيم) رحمه الله في ترجمته لابن تيمية: شيخ الاسلام والمسلمين، القائم ببيان الحق ونصرة الدين، الداعي الى الله ورسوله، المجاهد في سبيله، الذي اضحك الله به من الدين ما كان عابسا، وأحيى من السنة ما كان دارساً، والنور الذي اطلعه الله في ليل الشبهات، فكشف به غياهب الظلمات، وفتح به من القلوب مقفلها، وازاح به عن النفوس عللها، فقمع به زيغ الزائغين، وشك الشاكين، وانتحال المبطلين، وصدقت به بشارة رسول رب العالمين، يقول: "ان الله يبعث لهذه الامة على رأس كل مائة سنة من يجدّد لها دينها" ويقوله: " يحمل هذا العلم من كل خلف عدوله ينفون عنه تحريف الغالين وانتحال المبطلين"، وهو الشيخ، العلامة، الزاهد، العابد، الخاشع، الناسك، الحافظ، المتبع، تقي الدين أبو العباس احمد بن الشيخ الامام العلامة شيخ الاسلام ابي المحاسن عبد الحليم بن شيخ الإسلام، ومفتي الفرق، علامة الدنيا، مجد الدين عبد السلام ابن الشيخ الامام العلامة الكبير شيخ الاسلام فخر الدين عبد الله بن ابي القاسم بن محمد بن تيمية الحراني، قدَّس الله روحه، ونوَّر ضريحَه..» [1].

له جێگەیەکی تردا هاتووە دەڵێت: «وهو الشيخ العلامة الزاهد العابد الخاشع الناسك الحافظ المتبع تقي الدين أبو العباس احمد بن الشيخ الامام العلامة شيخ الاسلام ابي المحاسن عبد الحليم بن الشيخ الإسلام ومفتي الفرق علامة الدنيا مجد الدين عبد السلام ابن الشيخ الامام العلامة الكبير

---

١. الشهادة الزكية للكرمي مرعي بن يوسف الحنبلي بتحقيق: نجم عبد الرحمن خلف (ص ٣٤).

شيخ الاسلام فخر الدين عبد الله بن ابي القاسم بن محمد بن تيمية الحراني قدس الله روحه ونور ضريحه »[1].

و- موريدێكی تری (ابن تيمية) به ناوی (بهاء الدين عبد الله بن محمد بن خليل) وەك (الحافظ العسقلاني) لە (الدرر الكامنة)یدا لێیەوە دەیگێرێتەوە، كە بەڕاستی لە شان و باڵایدا ئەوەندە ستايشی كردووە كە خۆی ئەدا لە پەنجا صيفەتی زۆر گەورەو موبالەغەی سەیرو سەمەر.. مرۆڤ كە دەیخوێنێتەوە بەراستی تەریق دەبێتەوە چونكە ئەو هەموو ستايشە بڕواناكەم بۆ پێغەمبەرانیش(علیهم الصلاة السلام) گوترابێت، كە ئەیسەلمێنێت قوتابیەكانی تەنها بۆ مەحەببەتی خۆی پەروەردەكردوون، كە چەندێ رۆچوون لە مەدح و ستايش و پیاهەڵدانیدا، تەنانەت بە (القطب النوراني، و بركة الأنام) ناويان هێناوە، وەك گوتويەتی: « قال العسقلاني: قال بهاء الدين المذكور مانصه: شيخنا، وسيّدنا، وإمامنا، فيما بيننا وبين الله تعالى، شيخ التحقيق، السالك بمن اتبعه أحسن طريق، ذي الفضائل المتكاثرة، والحجج القاهرة، التي أقرت الأمم كافة أن هممها عن حصرها قاصرة، ومتعنا الله بعلومه الفاخرة، ونفعنا به في الدنيا والآخرة، وهو الشيخ، الإمام، العالم، الرباني، والحبر، البحر، القطب النوراني، إمام الأئمة، بركة الأمة، علامة العلماء، وارث الأنبياء، آخر المجتهدين، أوحد علماء الدين، شيخ الإسلام، حجة الأعلام، قدوة الأنام، برهان المتعلمين، قامع المبتدعين، سيف المناظرين، بحر العلوم، كنز المستفيدين، ترجمان القرآن، أعجوبة الزمان، فريد العصر والأوان، تقي الدين، إمام المسلمين، حجة الله على العالمين، اللاحق بالصالحين، والمشبه بالماضين، مفتي الفرق، ناصر الحق،

١. الشهادة الزكية: (ص ٣٤).

علامة الهدى، عمدة الحفاظ، فارس المعاني والألفاظ، ركن الشريعة، ذو الفنون البديعة، أبو العباس ابن تيمية»! ؟[1].

ز ـ هەروەها لە وەهابیەكانی نەجدیش هەمان رۆچوون لە ستایشی (ابن تیمیة)دا دەبینرێت، ئەوەتانێ لە كتێبی (طريقك إلى السعادة الأسرية)دا هاتووە كە ئەمە دەقەكەیەتی: « ومثل ذلك ما دوى به البحر الخضم، والجبل الأشم، عَلَمُ الأعلام، وشامخ الشام، وشيخ الإسلام، ابن تيمية قدّس الله روحه، ونوّر ضريحه، لما سجن ظلماً وعدواناً في سجن القلعة..» [2].

ح ـ هەروەها كەسێكی رۆچووی تر لە ستایشی (ابن تيمية)دا كە بریتییە لە(سليمان بن سحمان) لە نامیلكەیەكیدا بە ناوی: (نظم ماانفرد به شيخ الإسلام ابن تيمية عن الأئمة الأربعة)دا لە پێشەكی شیعرەكانیدا (ابن تيمية)ی ناوبردووە بە (شيخ الوجود) واتە: مامۆستاو شێخی هەموو مەوجودات وهەموو بوونەوەر، واتە: تەنانەت پێغەمبەران ومەلائیكەتە موقەررەبەكانیشی لێ تەرك نەكردووە! هەروەها ناوی بردووە بە (مُبيد العدى) واتە: فەوتێنەر وبكوژی هەموو دوژمنان!

وەك دەڵێت:

بحمدِ وليٍّ الحمد مُسدي الفضائل * أُؤَلِّفُ نظماً فائقاً في المسائلِ
مسائلُ عن (شيخِ الوجودِ) أُولى التُّقى*(مبيدِ العدَى) من كلِّ غاوٍ وَجَاهِلِ

---

١. الدرر الكامنة في أعيان المائة الثامنة للحافظ البن حجر العسقلاني: بتحقيق: محمد عبد المعيد ضان: (١٨٦/١).

٢. طريقك إلى السعادة الأسرية، عامر بن عيسى اللهو: (ص ٢).

وأعنِي به الحبرَ بنَ تيميةَ الرِّضَى * وفي بعضِها جاءت عضالُ الـزَّلازل[1]

که بێگومان صیفەتی یەکەمیان تەنها شایستەی پێغەمبـەرە(ﷺ)! وصیفەتی دووەمیشـیان تایبەتمەنـدە بـە پـەروەردگارەوە(جـل جلالـه)!، بەڵام چونکە ئەم مەدح و ستایشە پڕ لە غولـوە لـە کەسـێکی وەهابییـەوە گوتراوەو بۆ ستایشی (ابن تیمیه)ش گوتراوە هـیچ کـەس لـە وەهابیـەکان باسیان نەکردووە، بگرە وەك توتیش لە دانراوەکانیاندا گوتویانەتەوە، کە ئەمەش بە داخەوە ئەوپەڕی دوریيان دەسەلمێنێت لەو مەنهەجەی کـە بـە رواڵەت بانگەشەی بۆ دەکەن، لە کاتێکدا کەمتر لەو جۆرە ستایشەیان پـێ دروست نییە بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ)، بەڵام بەلایانەوە ئاساییە لەوەش زیاتر بۆ (ابن تیمیه)؟! لێرەدا با خوێنـەری دانیشـمەند بـۆ خـۆی حەکـەم بێت..

شـایەنی باســە لــە ئەصــڵدا ئــەو ستایشــە پــڕ لــە (غلــو)وە، واتــە وەصفکردنی (ابن تیمیه) بە (شیخ الوجود)، (ابن القیم) دایمەزرانـدووە بـە شان و باڵیدا هەڵیداوە وەك روونە لە (القصيدة النونية)یدا کە دەڵێت:

فاقرأ تصانيف الإمام حقيقة * شيخِ الوجود العالم الرباني

أعني أبا العباس أحمد ذلـ ـك البحر المحيط بسائر الخلجان

واقرأ كتاب العقل والنقل الـذي مـا في الوجـود لـه نظير ثان[2]

٦ـ باشە دەستەواژەی (قدّس الله روحه ونوّر ضريحه) تایبەتمەندە بـە گـەورە پیـاوانی ئـەهلی تەصـەووفەوە، ئـەی بـۆ ئێـوەی وەهـابی بـەکاری

---

١. نظم ما انفرد به شيخ الإسلام ابن تيمية عن الأئمة الأربعة، المؤلف: سليمان بن سحمان، المقدمة (ص٢ ).

٢. متن القصيدة النونية لابن القيم: (٢/ ٢٢٧).

دەهێنن، باشە خۆ ئێوە دەڵێن: خەڵکی کە مرد ئێمە نازانین موسڵمانە یان نا بەردەوام دەڵێن (لا نزكي أحدا على الله) ئەی ئەو هەموو تەزکییەتان لەچی بۆ (ابن تيمية)؟، بە چ بەڵگەیەکی شەرعی و چۆن ئەو دەستەواژانەی بۆ بەکاردەهێنن؟! باشە دەستەواژەی (قدس الله روحه ونوّر ضريحه) کە دەقە لە نزادا، واتە (خودایە تەقدیسی رۆحەکەی بکەیت و نێوەندی قەبرەکەشی پڕ لە نوور بکەیت) چ دەقێکی قورئان و سوننەتی لە سەرە؟ بە پێی مەنهەجەکەی خۆتان دەچێتە چوارچێوەی بیدعەتەوە لە عیباداتدا، ئەی بۆ ئەو بیدعەتە دەکەن؟ یان ئەوە دەرچوونی تەواوە لە مەوزوعییەت و مەنهەجییەت، کە لە سەرەوە بانگەشەی بۆ دەکەن و لە ژێریشەوە ژێر پێی دەنێن؟! خۆ زانایانی ئەهلی تەصەووف ئەو دەستەواژانە بەکار دەهێنن لە بەر ئەهلییەتە و هەم لە بەر ئەوەشە ئەوان بڕوایان بە داهێنانی چاك هەیە لە نزاکاندا.. کە ئێوە بڕواتان پێی نییە بۆچی بەکاری دەهێنن، بە تایبەت بۆچی دەستەواژەی ئەهلی تەصەووف بەکار دەهێنن بۆ خۆتان؟

پێویستیشە بڵێم: یەکەم کەس کە دیبێتم ئەو دەستەواژەی بەکار هێنابێت بریتییە لە پێشەوا حەزرەتی شافیعی کە لە بەرانبەر حەزرەتی شێخ حەسەنی بەصریدا (قدّس اللهُ روحهما) بەکاری هێناوە، کە دەست خەتەکەی پارێزراوە لە مۆزەخانەی (تۆپ قاپی) لە ئەستەنبول، کە تیایدا لە هامیشی دەستخەتی نوسراوێکی ئەودا لە ستایشیدا فەرموویەتی: «سلطانُ المشايخ في الآفاق، وهادِ الأقطاب بالاستحقاق، الشيخ حسن البصري قدس الله سرّه العزيز، في عاشر رجب الفرد، سنة سبع وتسعين من

الهجرة النبوية، وأنا محمّد بن إدريس الشافعي حامداً اللهَ، ومصلّياً على نبيِّة وآله وصحبه » [1].

ئاشكرايه كه ئەو ووشەو زاراوه و دەستەواژانەی ئیمامی شافیعی لەو نوسراوەیدا بەكاری هێناون وەك: (سلطان المشايخ، هادي الأقطاب، قدّس الله سره العزيز) تێكڕایان له زاراوەكانی زانستی (تەصەووف)ەو صوفێتی و شارەزایی ئیمامی شافعی لەو زانستەشدا ئاشكرا و دەسەلمێنێت وێڕای دروستی بەكارهێنانی ئەو دەستەواژانه بەڵام بۆ كەسی شایستەو بە پێی ئیستیحقاق[2].

٧ـ ئێوه دەڵێن: مەجاز لە قورئان و سوننەتدا نییە و تەئویلكردن دروست نییە، ئەی كه بڕواتان بە مەجاز و تەئویل نییە، چۆن وەڵامی دەستەواژەی (شيخ الإسلام) دەدەنەوە كە بۆی بەكارهاتووه، ئایا (ابن تيمية) شێخی ئیسلام بووه یان شێخی هۆگرانی خۆی لە موسڵمانان؟ چونكه شێخی ئیسلام ئەگەر تەئویلی نەكەین واتە شێخی قورئان وسوننەت؟ نەخێر بێگومان (ابن تيمية) مامۆستای قورئان سوننەت نەبوە، بەڵكو تەنها مامۆستای هەوادارانی خۆی بووە، ئەگەر پێی بگوترێت (شيخ طائفة من المسلمين) بە هەرحاڵ، ئەگەرنا (شيخ المسلمين)یش درۆیەكی شاخداره، چونكه مەعلومه لە كاتی خۆیدا موفتی هەر چوار مەزهەبی ئیسلام فەرمانی تەعزیركرنیان داوە بە سجنكردنی بە داخەوە لە بەر

---

١. ئەو پارچە نوسراو و روقعەیە وەك خۆی پارێزراوه كە خەتی پیرۆزی ئیمام شێخ حەسەنی بەصری و ئیمامی شافیعی پێوەیە لە مۆزەخانەی (طوب قاپی سرای) له (استانبول ـ تركيا)، بنواره بۆ بینینی دەستخەتەكان لە: رسم المصحف، د. غانم قدوري: (ص ٧٧٨).

٢. بنواره: جیهادی ئەهلی تەصەووف بە درێژایی مێژووی ئیسلامی (دانەر)، د. حەسەن خالید موستەفا موفتی: (ص ١٤).

هەندێك بیرو رای ناپەسەند و دەرچووی لە عەقیدەی ئەهلی سوننەت وجەماعەت، بۆیە زانایانی ئیسلام لەوانە: (تقي الدين أبو الحسن السبكي) لە هەردوو كتێبی (شفاء السقام في زيارة خير الأنام) و(الدرة المضيئة في الرد على ابن تيمية)یدا و (تقي الدين أبو بكر الحصني) لە كتێبی(دفع شبه من شبه وتمرّد ونسب ذلك إلى السيد الجليل الإمام أحمد)یدا و (الحافظ العسقلاني) لە (فتح الباري)یدا لە چەند جێیەكدا لەوانە شەرحی فەرمودەی (لا تشدوا الرحال) و فەرمودەی (كان الله ولم يكن شيء قبله)دا و (شهاب الدين ابن حجر المكي) لە(تحفة المحتاج) و(الفتاوى)یدا و زۆری تریش لە كاتی خۆیی و لە پاشتریش وەڵامیان داوەتەوەو هەموشیان لە چاپ دراون، كە لێرەدا ئەو مەسئەلانە بابەتی ئێمە نییە و لای رۆشنبیرانی ئیسلام زانراوە..

هەروەها ئەگەر بڕواتان بە مەجاز نییە چۆن وەڵامی ئەم عیبارەتەی (ابن تيمية)دەدەنەوە كە مەلائیكەتی خودای كردووە بە شەریكی پەروەردگار لە كاری خەرقولعادەكانیاندا(والعياذ بالله) وەك دەڵێت: « والله يحيي ويميت وما يتولّدُ عن أفعال الملائكة وغيرهم ليسوا مستقلين به بل لهم فيه شركة كطمس ابصار اللوطية وقلب مدينتهم وكذلك النصر.. » [1]. كە بێ گومان عیبارەتی «بل لهم فيه شركة» زۆر خەتەرە، بۆیە لە زۆر جێگەدا ئەگەر تەئویل و مەجاز نەبێت (ابن تيميه) بە ئاسانی رزگاری نابێت[2].

---

١. النبوات لابن تيمية (١/٢٩٥).

٢. بۆ درێژەی ئەو باسە بگەڕێرەوە بۆ كتێبی(دانەر): أحكام الاستعانة ومدلولاتها في الشريعة الإسلامية: د. حسن خالد مصطفى محمود المفتي، موضوع (المجاز والتأويل ينقذان ابن تيمية في بعض عباراته: (ص ٣٣١-٣٣٢).

٨ـ ئەگەر بگوترێت: یەکێك لە ئەولیای خودا لە سەر دەستیدا شێتێك چاك بوویەوە وەهابیەکان دەڵێن ئەوە خۆرافاتەو هەقیقەتێکی نییە، کە چی (ابن تیمیة) بۆ خۆی و لە تاریفاتی خۆیدا دەیگێڕێتەوە کە چەندین شێتی چاککردووەتەوە بە دۆعا و جنوکەی لە لاشەیان وەدەرکردووە،و ئیسپاتیشی کردووە بۆ پیاوچاکان وەك دەڵێت: « وقد ضربنا نحن من الشياطين في الإنس ما شاء الله، حتى خرجوا من الإنس، ولم يعاودوه. وفيهم من يخرج بالذكر والقرآن. وفيهم من يخرج بالوعظ والتخويف. وفيهم من لا يخرج إلا بالعقوبة" كالإنس. الشياطين يخافون الرجل الصالح أعظم مما يخافه فجّار الإنس »[1].

٩ـ ئایا وەصفکردنی (ابن تیمیة) بە (قطب فلك الأنام) بۆ شایستەیە ودروستە، وەك پێشتر نەقڵمان کرد لە قوتابیەکەیەوە (ابن ناصر الدين الدمشقي)[2] ئەی هەمان زاراوە بۆ پیاوانی خوداناس بۆ بیدعە بێت و دروست نەبێت؟! لە کاتێکدا هەمان زاراوە (ابن تیمیة) بۆ شێخی گەیلانی حەزرەتی (محيي الدين عبد القادر) بەکاری هێناوەو نەقڵی کردووە و رازی بووە پێی؟! ئەگەر ئێوە دەڵێن ئێمە تەیمی مەزهەبین ئەوا ئەو زۆر بە راشکاوی ستایشی پیاوانی تەصەووف دەکات، کەچی ئێوە شەوو رۆژ غەیبەتیان دەکەن و موعاداتی دۆستانی خودا دەکەن لە وانە شێخی گەیلانی کە (ابن تیمیة) بە (قطب العارفين) وەصفی کردووە لە نەقڵێکیدا، کە لە کتێبی (الاستقامة)یدا هاتووە ستایشی رابەرانی تەصەووف دەکات و دەڵێت: « فأما المشايخ الذين عاصرناهم والذين أدركناهم، وإن لم يتفق لنا

---

١. النبوات لابن تيمية (ص ٢٨١).

٢. الرد الوافر للدمشقي (ص ٩٧).

لقياهم، مثل الأستاذ الشهيد لسان وقته وواحد عصره أبي علي الدقاق، والشيخ شيخ وقته أبي عبد الرحمن السلمي وأبي الحسن علي بن جهضم مجاور الحرم، والشيخ أبي العباس القصاب بطبرستان، وأحمد الأسود الدينوري، وأبي القاسم الصيرفي بنيسابور، وأبي سهل الخشاب الكبير بها، ومنصور بن خلف المغربي، وأبي سعيد الماليني، وأبي طاهر الجحدري قدس الله أرواحهم وغيرهم، فإن هؤلاء المشايخ مثل أبي العباس القصاب له من التصانيف المشهورة في السنة.. وكذلك سائر شيوخ المسلمين من المتقدمين والمتأخرين الذين لهم لسان صدق في الأمة كما ذكر الشيخ يحيى بن يوسف الصرصري ونظمه في قصائده عن الشيخ علي بن إدريس شيخه أنه سأل قطب العارفين أبا محمد عبد القادر بن عبد الله الجيلي فقال: يا سيدي هل كان لله ولي على غير اعتقاد أحمد بن حنبل؟ فقال: ما كان ولا يكون، وكذلك نقل الشيخ شهاب الدين أبو حفص عمر بن محمد السهروردي، وحدثنيه عنه الشيخ عز الدين عبد الله بن أحمد بن عمر الفاروقي أنه سمع هذه الحكاية منه، ووجدتها معلقة بخط الشيخ موفق الدين أبي محمد بن قدامة المقدسي، قال السهروردي: كنت عزمت على أن أقرأ شيئًا من علم الكلام وأنا متردِّدٌ، هل أقرأ الإرشاد لإمام الحرمين أو نهاية الإقدام للشهرستاني أو كتاب شيخه فذهبت مع خالي أبي النجيب، وكان يصلي بجنب الشيخ عبد القادر، قال: فالتفت الشيخ عبد القادر وقال لي: يا عمر ما هو من زاد القبر، ما هو من زاد القبر، فرجعت عن ذلك، فأخبر أن الشيخ كاشفه بما كان في قلبه..»[1].

---

١. الاستقامة لابن تيمية بتحقيق: د. محمد رشاد سالم: (ص ٨٤ـ٨٧).

ئەگەر رای (ابن تیمیە) بەو شێوەیە بێت بۆ پیاوانی تەصەووف کە وایشە، کەواتە وەهابیەکان دوای کلاَوی با بردوو کەوتوون، یان پێیان وایە (ابن تیمیە)ش گومڕایە، چونکە ستایشی شێخی گەیلانی و ئەو مشایخانەی کردووە کە ناوی بردوون ئەوانەش کە ناوی نەبردوون وەك دەڵێت، هەروەها باسی کەرامەتی شێخی گەیلانی گێڕاوەتەوە کە بە خەتەرەی دڵی شێخی سوهرەوەردی زانایوە پێش ئەوەی ئەو پرسیارەکەی لێ بکات ئەم وەڵامەکەی داوەتەوە!

ئەم جۆرە زانینە سەرسوڕهێنەر نییە، چونکە کەراماتی دۆستانی خودا راستەو ئەوەی بڕوای پێی نەبێت بڕوای بە دەیان ئایەتی قورئان و فەرموودەی صەحیح نییە لەو بارەوە!

١٠ـ ئەوەی کە رابوورد وەك گوتمان عەجایب نییە، بەڵام ئەوە عەجایبە کە وەهابیەکان ئینکاری ئەو حەقائیقانە دەکەن، ئەگەر لە زاتێکی وەك شێخی گەیلانی و شاهی نەقشبەندەوە(قدس الله سرهما) بگێڕدرێتەوە، بەڵام ئینکاری ئەوە ناکەن کە (ابن القیم) لە (مدارج السالین)یدا باسی لە کەراماتی (ابن تیمیة) کردووە کە غەیبی زانیوەو موتالەعەی لەوحی مەحفوزی کردووە راستەوخۆ لە (لوح المحفوظ)ەوە هەواڵی سەرکەوتنی موسڵمانانی داوە بە سەر سوپای تەتاردا لە وڵاتی شام و حەفتا سوێنی لە سەر ئەو کەرامەتەی خۆی خواردووەو گوتوشیەتی (ان شاء الله)ی ناوێت مەگەر بۆ (تحقیق)؟!

وەك دەڵێت: « وكان إياس بن معاوية من أعظم الناس فراسة وله الوقائع المشهورة وكذلك الشافعي رحمة الله وقيل: إن له فيها تآليف ولقد شاهدت من فراسة شيخ الإسلام ابن تيمية رحمه الله أمورا عجيبة وما لم أشاهده منها أعظم وأعظم ووقائع فراسته تستدعي سفرا ضخما أخبر

أصحابه بدخول التتار الشام سنة تسع وتسعين وستمائة وأن جيوش المسلمين تكسر وأن دمشق لا يكون بها قتل عام ولا سبي عام وأن كلب الجيش وحدته في الأموال: وهذا قبل أن يهم التتار بالحركة، ثم أخبر الناس والأمراء سنة اثنتين وسبعمائة لما تحرك التتار وقصدوا الشام: أن الدائرة والهزيمة عليهم وأن الظفر والنصر للمسلمين وأقسم على ذلك أكثر من سبعين يمينا فيقال له: قل إن شاء الله فيقول: إن شاء الله تحقيقا لا تعليقا، وسمعته يقول ذلك قال: فلما أكثروا علي قلت: لا تكثروا كتب الله تعالى في اللوح المحفوظ: أنهم مهزومون في هذه الكرة وأن النصر لجيوش الإسلام قال: وأطعمت بعض الأمراء والعسكر حلاوة النصر قبل خروجهم إلى لقاء العدو وكانت فراسته الجزئية في خلال هاتين الواقعتين مثل المطر..» [1].

هەروەها باسی لەوە کردووە کە زۆر جار (ابن تیمیة) دڵ و دەروونی خوێندوەتەوەو خەبەری پێ داوە پێش ئەوەی کە پرسیارەکەی لێ بکات، هەروەها ناوچاوانی خەڵکی خوێندووەتەوە وەك لێیەوە نەقڵی کردووە دەڵێت: « وقال (أي ابن تيمية) مرة: يدخل علي أصحابي وغيرهم فأرى في وجوههم وأعينهم أمورا لا أذكرها لهم، فقلت له: أو غيري لو أخبرتهم فقال: أتريدون أن أكون معرّفا كمعرف الولاة، وقلت له يوما: لو عاملتنا بذلك لكان أدعى إلى الاستقامة والصلاح، فقال: لا تصبرون معي على ذلك جمعةً، أو قال: شهراً، وأخبرني غير مرة بأمور باطنة تختص بي ممّا عزمت عليه، ولم ينطق به لساني، وأخبرني ببعض حوادث كبار تجري في المستقبل، ولم

---

١. مدارج السالكين لابن القيم: (٢ / ٤٨٩).

يعين أوقاتها، وقد رأيت بعضها وأنا أنتظر بقيتها، وما شاهده كبار أصحابه من ذلك أضعاف أضعاف ما شاهدته، والله أعلم» [1].

لێرەدا قسەمان لە سەر ئەوە نییە کە ئایا ئەو نەقڵانە راستن یان نا، چونکە پیاوێکی وەك (ابن القیم) بەش بەحاڵی خۆم بە راستگۆی دەزانم، ئەگەر چی لە چەند مەسئەلەیەکیشدا پێم وایە بەهەڵەدا چووەو نەپێکاوە، بەڵام قسەمان لە سەر ئەمەیە: باشە ئەگەر بە نیوەی ئەو ئیددیعایەی (ابن تیمیة) و (ابن القیم) بۆ کەرامات و غەیب زانیین و داهاتوو خوێندنەوە، ئەهلی تەصەووف لێیانەوە بگێڕدرێتەوە ئێوەی وەهابی چی دەڵێن؟! ئایا بۆ ئەبێ بۆ (ابن تیمیة) دروست بێ و شیاو بێ، بەڵام بۆ هەزارجار لەو بەتەقواتر نا دروست؟! ئایا بانێکەو دوو هەوا؟

١١ـ تەیمییەکان بۆ خۆیان بە دروستی دەزانن پشت ببەستن بە خەونو و لە کتێبەکانیاندا خەون بگێڕنەوە، بەڵام ئەگەر زانایەکی سەر بە چوار مەهەبەکەی ئیسلام خەونێکی باس کرد تەنانەت لە بۆ (استئناس) نەك بۆ (استدلال) یەکسەر رووبەڕووی دەبنەوە، ئەوەتانێ (ابن القیم) لە زۆرێك لە کتێبەکانیدا خەونەکانی بە (ابن تیمیة)وە دەگێڕێتەوەو و حوکمیشی لێوە وەردەگرێت و پرسیاری لێ دەکات و وەڵامیشی لێ وەردەگرێتەوەو کەسیش لە وەهابیەکان وەڵامی نادەنەوا چوونکە مەقامەکە مەقامی (ابن تیمیە) و رۆحیانەتی ئەویش لە تەصەرروف و کارکردن و تەعلیمی قوتابیەکانیدایە پاش مردنیشی، بەڵام ئەو مەنزیلەتە تەنانەت بۆ پێغەمبەری خوداش(ﷺ) بە دروستی نازانن، أما بۆ (ابن تیمیە) ئەوە زۆر تەصەرروفێکی ئاساییە، وەك لە (مدارج السالین)یدا دەڵێت: « ورأیت شیخ

---

١. مدارج السالكين لابن القيم بتحقيق: محمد حامد الفقي: (٢ / ٤٩٠).

الإسلام ابن تيمية قدس الله روحه في المنام، وكأني ذكرت له شيئاً من أعمال القلب، وأخذت في تعظيمه ومنفعته لا أذكره الآن، فقال: أما أنا فطريقتي الفرح بالله والسرور به أو نحو هذا من العبارة»[1].

١٢ـ هەروەها تەیمییەکان کەراماتی ئەولیا نەفی دەکەن لە پاش مردنیان، کەچی قوتابییەکی (ابن تیمیة) بەناوی (الشیخ شهاب الدین الأذرعي) باس لە یەکێ لە کەراماتی (ابن تیمیة) دەکات، کە رووی داوە لە رۆژی وەفاتکردنی دا و پێی وایە ئەو خەرق و عادەتە لە بەرەکەتی (ابن تیمیة)وە بووە کە بریتییە لە وون بوونی تاکێك پاپووجی لە بەر قەرەباڵغی و پاشان دۆزینەوەی! وەك (الحافظ العسقلاني) بە بێ تەعلیق نەقڵی دەکات و دەڵێت: « وقرأتُ بخط الشيخ برهان الدين محدّث حلب، قال: اجتمعت بالشيخ شهاب الدين الأذرعي(سنة ٧٧٩هـ): ذكر لي في ذلك المجلس الشيخ تقي الدين ابن تيمية، وأثنى عليه، وذكر شيئا من كراماته، وذكر أنه حضر جنازتَه وأن الناس خرجوا من الجامع من كل باب، وخرجت من باب البريد، فوقعت سرموزتي، فلم أستطع أن أستعيدها، وصرت أمشي على صدور الناس، ثم لما فرغنا ورجعت لقيت السرموزة، وذلك من بركة الشيخ رحمه الله»[2]. باشە ئەمە بۆ ئەبێ کەرامەت بێت، خەڵکی یەك تاك پاپوچ و کەوشی بۆچییە هەتا بیبات تەنانەت ئەگەر تازەش بێت! ئەگەر کەرامەتیشە و بڕوایان پێیەتی وەهابیەکان دەی با بڕواشیان هەبێت بە بەرەکەتی دۆستانی خودا لە ئەولیای کیرام لە پاش مردنیشیان، ئەگەر نا دەبێتەوە دیسان بە بانێك و دوو هەوا ؟!

---

١. مدارج السالكين لابن القيم بتحقيق: محمد حامد الفقي: (٢/١٧٦).

٢. الدرر الكامنة للعسقلاني: بتحقيق: محمد عبد المعيد ضان: (١ / ١٨٦).

## هەموو خێرو چاکەیەك دەگات بە مردوو لای ( ابن تيمية ) و ( ابن القيم ) بە قورئان خوێندنیشەوە

١٣ـ وەهابیەکان دەڵێن: (قورئان خوێندن ناگات بە مردوو) لە کاتێکدا ئیددیعای ئەوە دەکەن کە تەیمی مەزهەبن، خۆ (ابن تيمية) و (ابن القيم) جگە لەوانیش پێیان وایە کە هەموو شتێك لە کاری چاکە بە مردوو دەگات، لە (العبادات المالية والعبادات البدنية)، بۆچی بە گوێیان ناکەن، وێڕای رای زانایانی هەرچوار مەزهەبی ئیسلام! ؟ ئەوەتانێ (ابن تيمية) لە (الفتاوى)یدا دەڵێت: « فصل: وأما القراءة والصدقة وغيرهما من أعمال البر فلا نزاع بين علماء السنة والجماعة في وصول ثواب العبادات المالية كالصدقة والعتق كما يصل إليه أيضا الدعاء والاستغفار والصلاة عليه صلاة الجنازة والدعاء عند قبره. وتنازعوا في وصول الأعمال البدنية: كالصوم والصلاة والقراءة والصواب أن الجميع يصل إليه فقد ثبت في الصحيحين عن النبي (ﷺ) أنه قال: « من مات وعليه صيام صام عنه وليه » وثبت أيضا: « أنه أمر أمرأة ماتت أمها وعليها صوم أن تصوم عن أمها » وفي المسند عن النبي (ﷺ) أنه قال لعمر بن العاص: « لو أن أباك أسلم فتصدقت عنه أو صمت أو اعتقت عنه نفعه ذلك » وهذا مذهب أحمد وأبي حنيفة وطائفة من أصحاب مالك والشافعي. وأما احتجاج بعضهم بقوله تعالى:{وأن ليس للإنسان إلا ما سعى} فيقال له قد ثبت بالسنة المتواترة وإجماع الأمة: أنه يصلى عليه ويدعى له ويستغفر له وهذا من سعي غيره وكذلك قد ثبت ما سلف من أنه ينتفع بالصدقة عنه والعتق وهو من سعى غيره وما كان من جوابهم في موارد الإجماع فهو جواب الباقين في مواقع النزاع وللناس في ذلك أجوبة متعددة. لكن الجواب المحقق في ذلك أن الله

تعالى لم يقل: إن الإنسان لا ينتفع إلا بسعى نفسه وإنما قال: { ليس للإنسان إلا ما سعى} فهو لا يملك إلا سعيه ولا يستحق غير ذلك وأما ما سعى غيره فهو له كما أن الإنسان لا يملك إلا مال نفسه ونفع نفسه فمال غيره ونفع غيره وهو كذلك للغير لكن إذا تبرع له الغير بذلك جاز. وهكذا هذا إذا تبرع له الغير بسعيه نفعه الله بذلك كما ينفعه بدعائه له والصدقة عنه وهو ينتفع بكل ما يصل إليه من كل مسلم سواء كان من أقاربه أو غيرهم كما ينتفع بصلاة المصلين عليه ودعائهم له عند قبره» [1].

هەروەها هاتووه لە (مجموع الفتاوى)یدا کە ئەمە دەقەکەیەتی: «سئل: عن قراءة أهل الميت تصل إليه ؟ والتسبيح والتحميد والتهليل والتكبير إذا أهداه إلى الميت يصل إليه ثوابها أم لا ؟ الجواب: يصل إلى الميت قراءة أهله وتسبيحهم وتكبيرهم وسائر ذكرهم لله تعالى إذا أهدوه إلى الميت وصل إليه والله أعلم» [2].

هەروەها (ابن القيم) لە سەرەتای (كتاب الروح)یدا گوتویەتی: «وقد ذكر عن جماعة من السلف أنهم أوصوا أن يقرأ عند قبورهم وقت الدفن قال عبد الحق يروى أن عبد الله بن عمر أمر أن يقرأ عند قبره سورة البقرة وممن رأى ذلك المعلى بن عبد الرحمن وكان الامام أحمد ينكر ذلك أولا حيث لم يبلغه فيه أثرٌ، ثم رجع عن ذلك. وقال الخلال في الجامع (كتاب القراءة عند القبور): أخبرنا العباس بن محمد الدورى حدثنا يحيى بن معين حدثنا مبشر الحلبي حدثني عبد الرحمن بن العلاء بن اللجلاج عن أبيه قال قال أبي إذا أنامت فضعني في اللحد وقل بسم الله وعلى سنة رسول الله،

---

١. الفتاوى الكبرى لابن تيمية بتحقيق: حسنين محمد مخلوف: (٣ / ٦٣).

٢. الفتاوى الكبرى: (٣/٣٨)برقم(٣٨٦).

وسن على التراب سنا واقرأ عند رأسى بفاتحة البقرة فإنى سمعت عبد الله بن عمر يقول ذلك قال عباس الدورى سألت أحمد بن حنبل قلت: تحفظ في القراءة على القبر شيئا فقال لا وسألت يحيى ابن معين فحدثنى بهذا الحديث. قال الخلال وأخبرني الحسن بن أحمد الوراق حدثنى على بن موسى الحداد وكان صدوقا قال كنت مع أحمد بن حنبل ومحمد بن قدامة الجوهرى في جنازة، فلما دفن الميت جلس رجل ضرير يقرأ عند القبر فقال له أحمد: يا هذا إن القراءة عند القبر بدعةٌ، فلما خرجنا من المقابر قال محمد بن قدامة لأحمد بن حنبل: يا أبا عبد الله ما تقول في مبشر الحلبي قال: ثقة، قال كتبت عنه شيئا، قال: نعم، فأخبرني مبشر عن عبد الرحمن بن العلاء اللجلاج عن أبيه أنه أوصى إذا دفن أن يقرأ عند رأسه بفاتحة البقرة وخاتمتها، وقال سمعت ابن عمر يوصي بذلك، فقال له أحمد فارجع وقل للرجل يقرأ". وقال الحسن بن الصباح الزعفراني:" سألت الشافعي عن القراءة عند القبر فقال لا بأس بها". وذكر الخلال عن الشعبي قال:" كانت الأنصار إذا مات لهم الميت اختلفوا إلى قبره يقرءون عنده القرآن" قال: وأخبرني أبو يحيى الناقد قال: سمعت الحسن بن الجروي يقول:" مررت على قبر أخت لي فقرأت عندها تبارك لما يذكر فيها فجاءني رجل فقال إنى رأيت أختك في المنام تقول جزى الله أبا علي خيرا فقد انتفعت بما قرأ"، أخبرني الحسن بن الهيثم قال سمعت أبا بكر بن الأطروش ابن بنت أبي نصر بن التمار يقول:" كان رجل يجيء إلى قبر أمه يوم الجمعة فيقرأ سورة يس فجاء في بعض أيامه فقرأ سورة يس ثم قال اللهم إن كنت قسمت لهذه السورة ثوابا فاجعله في أهل هذه المقابر فلما كان يوم الجمعة التي تليها جاءت امرأة فقالت أنت فلان ابن فلانة قال نعم قالت إن بنتا لي ماتت فرأيتها في النوم جالسة على شفير قبرها فقلت ما أجلسك ها هنا فقالت إن

فلان ابن فلانة جاء إلى قبر أمه فقرأ سورة يس وجعل ثوابها لأهل المقابر فأصابنا من روح ذلك أو غفر لنا أو نحو ذلك »[1]. پاشان له (المسألة السادسة عشرة) دا به تەفصيل برگه برگەی سەلماندووه به بەڵگەی قورئان و سوننەت و ئيجماع و قياس وەك دەڵێت: « وهي هل تنتفع أرواح الموتى بشيء من سعى الأحياء أم لا. فالجواب أنها تنتفع من سعى الأحياء بأمرين مجمع عليهما بين أهل السنة من الفقهاء وأهل الحديث والتفسير. أحدهما ما تسبب إليه الميت في حياته. والثاني دعاء المسلمين له واستغفارهم له والصدقة والحج على نزاع ما الذي يصل من ثوابه هل ثواب الإنفاق أو ثواب العمل فعند الجمهور يصل ثواب العمل نفسه وعند بعض الحنفية إنما يصل ثواب الإنفاق. واختلفوا في العبادة البدنية كالصوم والصلاة وقراءة القرآن والذكر فمذهب الإمام أحمد وجمهور السلف وصولها، وهو قول بعض أصحاب أبي حنيفة نص على هذا الإمام أحمد في رواية محمد بن يحيى الكحال قال: قيل لأبي عبد الله: الرجل يعمل الشيء من الخير من صلاة أو صدقة أو غير ذلك فيجعل نصفه لأبيه أو لأمه قال: أرجو أو قال الميت يصل إليه كل شيء من صدقة أو غيرها. وقال أيضا: اقرأ آية الكرسي ثلاث مرات وقل هو الله أحد وقل اللهم إن فضله لأهل المقابر. والمشهور من مذهب الشافعي ومالك أن ذلك لا يصل. وذهب بعض أهل البدع من أهل الكلام أنه لا يصل إلى الميت شيء البتة لادعاء ولا غيره...[2] پاشان دەڵێت: « وأما قراءة القرآن وإهداؤها له تطوعا بغير أجرة فهذا يصل إليه كما يصل ثواب الصوم والحج. فإن قيل: فهذا لم يكن معروفا في

---

١. الروح لابن القيم (ص ١١).

٢. الروح المسألة السادسة عشرة لابن القيم: (ص ١١٧).

السلف ولا يمكن نقله عن واحد منهم مع شدة حرصهم على الخير ولا أرشدهم النبي وقد أرشدهم إلى الدعاء والاستغفار والصدقة والحج والصيام فلو كان ثواب القراءة يصل لأرشدهم إليه ولكانوا يفعلونه. فالجواب أن مورد هذا السؤال إن كان معترفا بوصول ثواب الحج والصيام والدعاء والاستغفار. قيل له: ما هذه الخاصية التي منعت بوصول ثواب القرآن واقتضت وصول ثواب القرآن واقتضت وصول ثواب هذه الأعمال وهل هذا إلا تفريق بين المتماثلات وان لم يعترف بوصول تلك الأشياء إلى الميت فهو محجوج بالكتاب والسنة والإجماع وقواعد الشرع. وأما السبب الذي لأجله يظهر ذلك في السلف فهو أنهم لم يكن لهم أوقاف على من يقرأ ويهدى إلى الموتى ولا كانوا يعرفون ذلك البتة ولا كانوا يقصدون القبر للقراءة عنده كما يفعله الناس اليوم ولا كان أحدهم يشهد من حضره من الناس على أن ثواب هذه القراءة لفلان الميت بل ولا ثواب هذه الصدقة والصوم ثم يقال لهذا القائل: لو كلفت أن تنقل عن واحد من السلف أنه قال: اللهم ثواب هذا الصوم لفلان لعجزت فإن القوم كانوا أحرص شيء على كتمان أعمال البر فلم يكونوا ليشهدوا على الله بإيصال ثوابها إلى أمواتهم. فإن قيل: فرسول الله أرشدهم إلى الصوم والصدقة والحج دون القراءة؟ قيل: هو يبتدئهم بذلك بل خرج ذلك منه مخرج الجواب لهم فهذا سأله عن الحج عن ميته فإذن له وهذا سأله عن الصيام عنه فإذن له وهذا سأله عن الصدقة فإذن له ولم يمنعهم مما سوى ذلك. وأي فرق بين وصول ثواب الصوم الذي هو مجرد نية وإمساك بين وصول ثواب القراءة والذكر. والقائل أن أحدا من السلف لم يفعل ذلك قائل مالا علم له به فإن هذه شهادة على نفي ما لم يعلمه فما يدريه أن السلف كانوا يفعلون ذلك ولا يشهدون من حضرهم عليه بل يكفي اطلاع علام الغيوب على نياتهم ومقاصدهم لا سيما والتلفظ بنية الإهداء لا

يشترط كما تقدم. وسر المسألة أن الثواب ملك العامل فإذا تبرع بـه وأهـداه إلى أخيه المسلم أوصله الله إليه فما الذي خص من هذا ثـواب قـراءة القـرآن وحجر على العبد أن يوصله إلى أخيه وهذا عمل سائر الناس حتى المنكـرين في سائر الإعصار والأمصار من غير نكير من العلماء. فإن قيل: فمـا تقولـون في الإهداء إلى رسول الله قيل من الفقهاء المتأخرين من استحبه ومنهم من لم يستحبه ورآه بدعة فان الصحابة لم يكونوا يفعلونه وأن الـنبي لـه أجـر كـل من عمل خيرا من أمته من غير أن يـنقص مـن أجـر العامـل شـيء لأنـه هـو الذي دل أمته على كل خير وأرشدهم ودعاهم إليه ومن دعا إلى هدى فله من الأجر مثل أجور من تبعه من غير أن ينقص من أجـورهم شـيء وكـل هـدى وعلم فإنما نالته أمته على يده فله مثل أجـر مـن اتبعـه أهـداه إليـه أول لم يهده والله أعلم»[1].

**( قورئـان خوێندن بۆ مردوو، لای قەبرەکەی سوننەتە لای ئیمامی شافیعی )**

شایەنی باسە وەها مەشهەرە کە ئیمامی شافیعی فەرموویێتی قورئان ناگـات بـە مـردوو یـان قورئـان لـە سـەر قـەبر نەخوێنـدرێت، بـەڵام پـاش گەڕانێکی زۆر لە کتێبی(الأم)ی ئیمامی شـافیعیدا پێچـەوانەی ئـەو نەقڵـەم دیتـەوە، خـۆ ئەگـەر شـتێکی واش هـەبووبێت ئـەوا قـەولی قەدیمیـەتی و فـەتواش لـە سـەر قـەولی جەدیـدە، ئـەوەتانێ ئیمـامی شـافیعی بـۆ خـۆی دەفەرموێت: «وأحبُّ لو قرئ عند القبر، ودعى للميت، ولـيس في ذلـك دعـاءٌ مؤقت، وأحب تعزية أهل الميت، وجاء الاثر في تعزيتهم، وان يخص بالتعزيـة كبارهم وصغارهم العاجزون عن احتمال المصيبة وأن يجعل لهم أهل رحمهـم

١. الروح لابن القيم: (ص ١٤٢ـ ١٤٣).

وجيرانهم طعاما لشغلهم بمصيبتهم عن صنعة الطعام»[1]. واتە: « پێم باشە قورئان بخوێندرێت لای قەبری مردووەکە، واتە بۆ مردووەکە، هەروەها دۆعای خێری بۆ بکرێت، هەرشێوە دۆعایەك بێت، چونکە دۆعایەکی تایبەتمەندی نییە..». هەروەها ئیمامی نەوەوی لە (المجموع)یدا لە ئیمامی شافیعییەوە نەقڵی کردووە و فەرمویەتی: « قال أصحابنا.. ويستحب إن يقرأ من القرآن ما تيسَّر، ويدعو لهم عقبها، نصَّ عليه الشافعيّ واتفق عليه الأصحاب »[2]. واتە: «هاوەڵانمان ـ واتە لە گەورە زانایانی شافیعی ـ فەرمویانە: سوننەتەو باشە کە قورئانی پیرۆز بخوێندرێت لە سەر مردووەکان، ئەوەندەی کە بتوانرێت، پاشان دۆعای خێریان بۆ بکرێت، ئەمە دەقی ئیمامی شافیعی لە سەرە و هەموو هاوەڵانمان کۆ دەنگن لە سەری ». هەروەها لە جێگەیەکی تردا لە (المجموع) فەرمویەتی: « يستحب أن يمكث على القبر بعد الدفن ساعة، يدعو للميت ويستغفر له نص عليه الشافعي واتفق عليه الاصحاب، قالوا: ويستحب أن يقرأ عنده شئ من القرآن وإن ختموا القرآن كان أفضل»[3]. واتە: «سوننەت و موستەحەببە وەستان لە سەر گۆڕی مردوو پاش ئەسپەردەکردنی بۆ ماوەی کاتژمێرێك، بپاڕێیتەوە بۆ مردووەکەو دۆعای لێخۆشبوونی بۆ بکرێت، ئەمە دەقی فەرموودەی شافیعییە و هەموو هاوڵانی یەك دەنگن لە سەری، هەروەها گوتویانە: موستەحەببە کە هەندێك قورئانی بە سەرەوە بخویندرێت، خۆ ئەگەر تەواوی قورئانی بۆ مردووەکە خەتم کرد ئەوا باشترە».

---

١. الأم مع مختصر المزني ط: دار الفكر: (١ / ٣٢٢).

٢. المجموع شرح المهذب: (٥ / ٣١١).

٣. المجموع شرح المهذب للنووي: (٥ / ٢٩٤).

هـەروەها ئیمـامی نـەوەوی ئـەو عیبارەتـەی نـەقڵ کردووەتـەوە لـە (ریاض الصالحین)دا لە خـودی ئیمـامی شـافیعی یـەوە وەك دەفـەرموێت: «قال الشافعي (رحمه الله): ويستحب أن يقرأ عنده شيء من القرآن، وإن ختموا القرآن كله كان حسناً »[1].

## ریسالەیەکی (الحافظ أبي بكر الخلال المتوفی٣١١هـ) بە ناونیشانی (القراءة عند القبور) لە سەرگەشتنی قورئان بە مردوو

لێرەدا جێگەی خۆیەتی نامەیەکی بەسـوودی (الحـافظ أبي بكر أحمد بن محمد الخلال الحنبلي المتوفى ٣١١هـ) نـەقڵ بکـەین بـە ناونیشـانی(القـراءة عنـد القبور) بۆ زیاتر دڵنیایی موسڵمانان لە سەر ئەوەی کە قورئان خوێندن بـۆ مردوو سونـنەتەو موستەحەببەو دەگات پاداشتەکەی بە مردوو، کـە یـازدە ئەسەری بە سـەنەدی خـۆی نـەقڵکردووە تیایـدا و پـاش (بسـم الله الـرحمن الرحيم) دەفەرموێت:

« ١ـ أخبرنا الشيخ الإمام شرف الـدين أبـو عبـد الـرحمن عيسـى قـال: أخبرنـا الوالد الإمام محيي الدين أبو محمد عبد القادر بن أبـي صـالح قـال: أخبرنـا أبـو الحسين المبارك بن عبد الجبار الصيرفي قال: أخبرنا أبو إسحاق البرمكـي قـال: أخبرنا أبو بكر عبد العزيز بن جعفر الفقيه قال: أخبرنا أبو بكر أحمد بـن محمـد الخلال قال: أخبرنا العباس بن محمد الدوري، قال: حدثنا يحيى بن معين، قـال: حدثنا مبشر الحلبي، قال: حدثني عبد الرحمن بن العلاء بن اللجلاج، عـن أبيـه، قال: إني إذا أنا مت، فضعني في اللحد، وقـل: بسـم الله، وعلـى سـنة رسـول الله،

---

١. رياض الصالحين من كلام سيّد المرسلين، للإمام النووي عند شرحه لحديث عمرو بن العاص (رضي الله عنه): إذا دفنتموني فأقيموا حول قبري.. الخ. (ص ١٢١٧)برقم(٩٤٧).

وسن علي التراب سنا، واقرأ عند رأسي بفاتحة الكتاب وأول البقرة وخاتمتها، فإني سمعت عبد الله بن عمر يقول ذلك"، قال الدوري: سألت أحمد بن حنبل قلت: تحفظ في القراءة على القبور شيئا، فقال: لا. وسألت يحيى بن معين، فحدثني بهذا الحديث».

٢ـ وأخبرني العباس بن محمد بن أحمد بن عبد الكريم، قال: حدثني أبو شعيب عبد الله بن الحسين بن أحمد بن شعيب الحراني من كتابه قال: حدثني يحيى بن عبد الله الضحاك البابلتي، حدثنا أيوب بن نهيك الحلبي الزهري، مولى آل سعد بن أبي وقاص قال: سمعت عطاء بن أبي رباح المكي، قال: سمعت ابن عمر، قال: سمعت النبي (ﷺ) يقول: « إذا مات أحدكم فلا تجلسوا، وأسرعوا به إلى قبره، وليقرأ عند رأسه بفاتحة البقرة، وعند رجليه بخاتمتها في قبره »[1].

٣ـ وأخبرني الحسن بن أحمد الوراق، قال: حدثني علي بن موسى الحداد، وكان صدوقا، وكان ابن حماد المقرئ يرشد إليه، فأخبرني قال: « كنت مع أحمد بن حنبل، ومحمد بن قدامة الجوهري في جنازة، فلما دفن الميت جلس رجل ضرير يقرأ عند القبر، فقال له أحمد: يا هذا » إن القراءة عند القبر بدعة فلما خرجنا من المقابر قال محمد بن قدامة لأحمد بن حنبل: يا أبا عبد الله، ما تقول في مبشر الحلبي؟ قال: ثقة، قال: كتبت عنه شيئا ؟ قال: نعم، قال: فأخبرني مبشر، عن عبد الرحمن بن العلاء بن اللجلاج، عن أبيه، أنه أوصى إذا دفن أن يقرأ عند رأسه بفاتحة البقرة وخاتمتها، وقال: سمعت ابن عمر يوصي بذلك. فقال له أحمد: فارجع، فقل للرجل يقرأ « وأخبرنا أبو بكر بن صدقة، قال: سمعت عثمان بن أحمد بن إبراهيم الموصلي، قال: كان أبو عبد الله أحمد بن حنبل في جنازة ومعه محمد بن قدامة الجوهري، قال: فلما قبر الميت، جعل إنسان يقرأ عنده، فقال أبو عبد الله لرجل: تمر إلى ذلك الرجل الذي يقرأ، فقل

---

١. القراءة عند القبور لأبي بكر بن الخلال ص١ـ ٣).

له: لا يفعل، فلما مضى، قال له محمد بن قدامة: مبشر الحلبي، كيف هو ؟ فذكر القصة بعينها».

٤ـ أخبرني العباس بن محمد بن أحمد بن عبد العزيز، قال: حدثنا جعفر بن الحسين النيسابوري، عن سلمة بن شبيب، قال: « أتيت أحمد بن حنبل فقلت له: إني رأيت عفان يقرأ عند قبر في المصحف، فقال لي أحمد بن حنبل: ختم له بخير » [1].

٥ـ أخبرني الحسن بن الهيثم البزاز، قال: « رأيت أحمد بن حنبل يصلي خلف رجل ضرير يقرأ على القبور ».

٦ـ أخبرني روح بن الفرج، قال: سمعت الحسن بن الصباح الزعفراني، يقول: « سألت الشافعي عن القراءة عند القبر فقال: لا بأس به ».

٧ـ أخبرني أبو يحيى الناقد، قال: حدثنا سفيان بن وكيع، قال: حدثنا حفص، عن مجالد، عن الشعبي، قال: « كانت الأنصار إذا مات لهم الميت اختلفوا إلى قبره يقرءون عنده القرآن ».

٨ـ أخبرني إبراهيم بن هاشم البغوي، قال: حدثنا عبد الله بن سنان المروزي أبو محمد، قال: حدثنا الفضل بن موسى السيناني، عن شريك، عن منصور، عن إبراهيم، قال: « لا بأس بقراءة القرآن في المقابر ».

٩ـ أخبرني أبو يحيى الناقد، قال: سمعت الحسن بن الحر، وهو يقول: « مررت على قبر أخت لي، فقرأت عندها تبارك لما يذكر فيها، فجاءني رجل فقال: إني رأيت أختك في المنام تقول: جزى الله أبا علي خيرا، فقد انتفعت بما قرأ ».

١٠ـ أخبرني الحسن بن الهيثم، قال: « كان خطاب يجيئني ويده معقودة فيقول: إذا وردت المقابر فاقرأ قل هو الله أحد، واجعل ثوابها لأهل المقابر ».

---

١. القراءة عند القبور لأبي بكر بن الخلال ص٤ـ ٦).

١١ـ أخبرني الحسن بن الهيثم، قال: سمعت أبا بكر بن الأطروش ابن بنت أبي نصر التمار، يقول: « كان رجل يجيء إلى قبر أمه يوم الجمعة، فيقرأ سورة يس، فجاء في بعض أيامه فقرأ سورة يس، ثم قال: اللهم إن كنت قسمت لهذه السورة ثوابا فاجعلها في أهل هذه المقابر، فلما كان في الجمعة التي تليها، جاءت امرأة فقالت: أنت فلان بن فلانة ؟ قال: نعم، قالت: إن بنتا لي ماتت، فرأيتها في النوم جالسة على شفير قبرها، فقلت: ما أجلسك هاهنا ؟ فقالت: إن فلان بن فلانة جاء إلى قبر أمه فقرأ سورة يس، وجعل ثوابها لأهل المقابر، فأصابنا من روح ذلك، أو غفر لنا أو نحو ذلك»[1].

كەواتە وەهابیەکان لە بەر چی و بە چ بەڵگەیەك قورئان خوێندن بۆ مردوو بە بیدعەت دەزانن؟ ئەگەر بە خەیاڵەکەی ئەوان بێت: تێکڕای زانایانی سەلەف وخەلەف بیدعەچین! بە (ابن تیمیة) و (ابن القیم)ی ئەوانیشەوە! جگە لە پێشەوایانی سەلەف و زانایانی هەر چوار مەزهەب بە حەنبەلیەکانیشەوە لەوانە (الحافظ أبو بکر الخلال) کە زۆر جێگەی بایەخە لای تەیمییەکان، بەڵام (لسوء حظ الوهابیة) ئەوانیش پێیان وایە هەموو شتێك بە خوێندنی قورئانیشەوە دەگات بە مردوو؟!

## ( رووی پێنجەم )

لە روانگەی رەخنەی دروستکارەوە لە ناوچەی حوکمڕانی وەهابییەکان بە تایبەت و تیوە دورگەر عەرەبی بە گشتی، و بە مەبەستی راستکردنەوەی هەڵەکان و پێشکەشکردنی ئامۆژگاری چاك بۆ کاربەدەستانیان لە سەروشیانەوە (خادم الحرمین الشریفین) کە بە رواڵەت

١. القراءة عند القبور لأبي بكر بن الخلال ص٧ـ ١٢).

پیاوێکە پێدەچێت حەزی لە چاکسازی هەبێت بە تایبەت لە دامەزراوە ئایینیەکانی مەملەکەدا ئەگەر وەهابیەکان ڕێگری لێ نەکەن. چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «الدين النصيحة قلنا لمن؟ قال لله ولكتابه ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم»[1].

دەڵێن: بە بانگەوازخوازانی وەهابییەت: ئێوە زۆرێك لە سوننەتەکان دەکەنە بیدعەت، وەك پێشتر باسمانکرد، کەچی دەیان کاری بیدعەتی خراپ هەیە لە ناوچەکانتان و لە بەرچاوتاندا دەکرێت و هیچ هەڵوێستێکی شەرعیتان نییە لە بەرانبەریان کە کەس ناتوانێت بەو شتانە بڵێت بیدعەت نییە، ئایا بێدەنگی ئێوە لە بەرانبەریان لە بەر بەرژەوەندی دونیایی خۆتانە؟ یاخود ناوێرن بۆیە بێ دەنگن؟ ئەگەر یەکەمیانە ئەوا بیرتان دێنینەوە بە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان کە دەفەرموێت: ﴿وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ * وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ * يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ فَأَمَّا الَّذِينَ اسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنْتُمْ تَكْفُرُونَ * وَأَمَّا الَّذِينَ ابْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِي رَحْمَةِ اللَّهِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ * تِلْكَ آيَاتُ اللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ وَمَا اللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِلْعَالَمِينَ﴾[2] ئەگەر لەبەر دووهەمیشە ئەوا بێدەنگی لە ئاستی دەربڕینی ڕاستییەکاندا وەك گوتراوە: « شیطانٌ أخرس»[3].

---

١. رواه مسلم في صحيحه (٧٤/١)برقم(٥٥) عن تميم الداري (رضي الله عنه).

٢. (سورة آل عمران: ١٠٤ – ١٠٨).

٣. ذكره النووي في شرح النووي على مسلم: (٢٠/٢) عن الأستاذ أبي القاسم القشيري عن الإمام أبي علي الدقاق (رضي الله عنه) موقوفاً بلفظ: « من سكت عن الحق فهو شيطان أخرس».

له نمونەی ئەو بیدعەتە خراپانەی کە بەر بڵاوەو بونەتە دیاردە، و پێویستە ئێوەی وەهابی حوکمڕان قەڵاچوویان بکەن نەك (کۆڕی زیکری خودا و صەڵاوات لە دیداری پێغەمبەری خودا (ﷺ) و فاتیحە خوێندن بۆ موسڵمانان و خۆشحاڵی دربڕین بە هاتنە دونیای فەخری کائینات (ﷺ) و..هتد، بە بیدعەتی بزانن و هەوڵی نەهێشتنیان بدەن، کە تێکڕایان کاری موستەحەبب و جوان و شایستەن و بەڵگە تایبەت و گشتییەکان و یاسا فیقهیی و ئوصوڵیەکان دەیانگرێتەوە، بەڵام بیدعەتەکانی ئێوە بە چ شەرعێکی خودا دروستە لەوانە:

١ـ لە پێشتر و تا ئەمڕۆش بە فەتوای وەهابیەکان داوای یارمەتی لە موشریك وکافران دەکرێت و لە دژ هەندێ لە وڵاتانی بە رواڵەت ئیسلامی تر وەك ئێران وعێراق پشتیان پێ دەبەسترێت، واتە (استعانة) بە (مشرك) دەکەن، لە کاتێکدا قورئان دەفەرموێت: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ [١] هەروەها فەرموودەی صەحیحە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: « إنا لا نستعين بمشرك» [٢]. واتە: « ئێمە داوای کۆمەکی و یارمەتی لە موشریك ناکەین ». دەیان فەرموودەی تریش. ئایا دروستە داوای یارمەت لە کافر،

---

وينظر: الرسالة القشيرية في علم التصوف للإمام أبي القاسم القشيري بتحقيق معروف مصطفى زريق: (ص ١٢٠).

١. أخرج أبو داود وغيره بسند صحيح عن عروة عن أم المؤمنين سيدتنا عائشة(رضي الله عنها) قال: إن رجلا من المشركين لحق بالنبي (ﷺ) ليقاتل معه فقال: «ارجع» ثم اتفقا، فقال: « إن لا نستعين بمشرك ». سنن أبي داود (٨٣/٢)برقم(٢٧٣٢).قال المعلق: «صحيح».

٢. (سورة التوبة: ٧١).

بەڵام لە موسڵمانان دروست نییە؟! ئایا ئەو کارەیان بیدعەت و (تناقض) یش نییە؟ بێگومان ئێمە ناڵێین لە هیچ کاتێکدا دوروست نییە، چونکە زانایانی ئیسلام دەفەرموون لە هەندێ کاتدا دروستە داوای یارمەتی کردن لە کافر، بەڵام مەبەستمان لێرەدا ئەوەیە: وەهابیەکان دەڵێن: ئیستیعانە و تەوەسوول بە پێغەمبەران و صالیحین دروست نییە! لە کاتێکدا بۆ خۆیان ئیستیعانەو تەوەسسول بە کافران بە جائیز دەزانن؟! باشە ئەگەر ئیستیعانە بە دۆستانی خودا دروست نییە، ئەی بە ئەمەریکا و گاورو جولەوکەو عەلمانیەکان لە کوێ بە چ دەقێك دروستە؟ ئەگەر بە کافر دروست بێ، ئەی بە موسڵمان بۆ دروست نەبێ، ئەگەر بە موسڵمان دروست نەبێ، ئەی بە کافر چۆن دروستە؟ ئایا ئەمە عەینی (تناقض) نییە؟! وەك کاری ئەو وەهابیە وایە کە هاواری دەکرد لە سەر مینبەر: دروست نییە تەوەسسول بە زاتی پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام هەر کە تەنگاو بوو هەڵات لەو جیهادەی کە بڕوای پێی هەبوو و ئەوکات هاواری دەکرد خوایە پارەپارەم کەیت لە سەری! بە تەنها خۆی دەربازکرد و چەندین ڕۆژ بە بەرچاوی خەڵکی شارەوە تەوەسسولی بە چایخانەی بارەگای پارتێکی عەلمانی کرد و پەنای پێ بردن؟! پاشان لە سەدوو هەشتا پلەی وەهابییەتەوە سوڕایەوە بۆ سەدوو هەشتا پلەی عەلمانییەت، واتە بوو بە وەهابییەکی عەلمانی! کە ئەمەش جۆرە مۆدێلێکی تازە بابەتەو ئێستا مۆدەیەتی؟!

هەرچەندە بەلای چاودێرانەوە هیچ عەجایب نییە، چونکە ئەوان گوتەنی: شت وەك وکەرەستە وهزری هەردوولایان بۆ یەك دەشێن لە کۆن و تازەدا، چونکە هەردوولایان ماددە پەرستن و بڕوایان زۆر بە غەیبیات ومەعنەویات و موعجیزات و کەرامات نییە! ئەوان دەڵێن مردوو کە مرد

ئیتر تـەواو، ئـەمانیش دەڵـێن مـردوو کـە مـرد ئـیتر تـەواو! ئـەوان دەڵـێن زیندووبوونەوە نییە، ئەمانیش دەڵێن روحیانەت هـیچ کاریگـەری و سـودی نییـە، نـە سـوود ئەگـەیێنێت، نـە سـوودی پـێ دەگـات! ئـەوان دەڵـێن پێغەمبـەران(علـیهم الصـلاة والسـلام) خـەڵکێکن وەك ئێمـە، ئـەمانیش بـە هەمان شێوەی ئەوان، بێ ئەدەبتریش لەوان چـونکە دەڵـێن: دەسـەڵاتیان نییە و شەفاعەتیان نییەو تەوەسسولیان پێ ناکرێت و زۆر بێ رێزیشـن لـە بەرانبەریان! ئەوان دەڵێن: مەعنەوییات نییە، ئەمانیش بە هەمان شێوەی ئـەوان! ئـەوان بڕوایـان بـە مـوعجیزەو کـەرامات نییـەو ئەوشـتانەیان لا کۆنەپەرسـتییە، ئـەمانیش بـە هـەمان شـێوەی ئـەوان پێیـان هەڵبەسـراو وئەفسانەیە! ئـەوان دەڵـێن: خـوا تەبیعـەت و سـوتفەو ماددەیـە (والعیـاذ بالله)، ئەمانیش دەڵێن: لە خوا لە ئاسماندایە و دێتە خوارەوە و دەسـت و قاچی هەیە، واتە بت و پەیکەرێکیان بە خەیاڵی پوچـی خۆیـان داتاشـیوە لـە ئاسمانـدا بـە حیسـتب عیبـادەتی بـۆ دەکـەن، وەك بـت بەرسـتەکانی زەمانی کۆن، تەنها جیاوازیان وەك پێشەوا (فخر الدين الرازي) فەرمویەتی ئەوەیـە: ئـەوان بتـە پەرسـتراوەکانیان لـە زەویـدا بـوو، ئـەمان بتـە پەرستراوەکەیان لە ئاسماندایە، (سبحان الله وتعالى وتقدّس عما يصفون).. بۆیە ئەمـەی کـە رابـوورد جێگـەی سـەر سوڕمان نییـە، ئـەوە عەجایبـە - وەهابییـەکانی سـەردەم موتوربـەکراون لـە عەلمانیـەکانی چـەپ و راسـت وفەخریشی پێوە دەکەن.. کە ئەمەش صیفەتێکی تری خەواریجە لە کاتی خۆیدا، کە برادەرایەتیان لە تەك بتپەرست و بێ باوەڕاندا بتەو بوو، بـەڵام لـە تـەك موسـڵماناندا کـرو لاواز، بگـرە ئـەوانیان واز لـێ دەهێنـا، بـەڵام

ئـەمانیان دەکوشـت وەك پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویـەتی: «یقتلـون أهـل الإسلام ویدعون أهل الأوثان»[1].

ئێسـتەش بـە داخـەوە بـەهام شـێوازە وەك لـە جیهـانی ئیسـلامیدا دەیبیـنین، ئـەو فـەرموودەی پێغەمبـەر (ﷺ) وەك ئێسـتاو بـۆ ئێسـتا فەرموویێتی وەهایە(صدق رسول الله وبلّغ ونحن علیه من الشـاهدین)... بـە هەرحاڵ ئێمە تەنها مەبەستمان لەو نمونانـە ناسـاندنی ماهییـەتی فیرقـەی وەهابییەتی سـەردەمە وەك تـەوژم و بیرێکـی مـاددی، لـە یـەکتر تـرازاوی (مُتناقض)و دەرچوو لەو مەنهەجەی کە بە رواڵـەت بـەردەوام بانگەشـەی بۆ دەکات، وە بەردەوام لە تەك تاکەکانیاندا لـە گفتوگـۆ وحیـوار دایـن بـە مەبەستی دەرکەوتنی راستی و رۆشنکردنەوەی رێگای راست.

٢ـ وەهابیـەکان وایـان گەیانـدووە کـە تەنانـەت بیدعـەتی حەسـەنەش نییە، ئـەی باشـە پەخشـکردنی بیسـت و چـوار سـەعاتەی دەیـان کـەناڵی ئاسمانی لە نیوەدورگەی عەرەبی کە بەردەوام فلیم و زنجیرە درامـای بـێ شـەرعی و گـۆرانی و سـەما پـەخش دەکـات و هـەموو موسـڵمانانیش ئـەو راستییە دەزانن[2] ئایا لە چ خانەیەکی حـوکمی شـەرعیدان؟ کـە بێگومـان

١. رواه البخاري في صحیحه (٢٧٠٢/٦)برقم(٦٩٩٥). من حدیث أبي سعید (رضي الله عنه).

٢. چونکە ئاشکرایە کۆمەڵەی کەناڵەکانی (رۆتانا و mbc و دەیان کەناڵی تریش کێ تەمویلیان دەکات و لە کوێش بەخش دەکرێن، هەرچەندە من بۆ خۆم بروام نەدەکرد ئەو کەناڵانە هی مەملەکەبن، نەك لە بەر چاکی خەڵکەکەی، بەڵکو لە بەر حەیاکردن لە هەردوو حەرەمەینی پیرۆز، تا بە ئاشکرا لە سایتەکانی نێو (google)دا بۆم روون بوویەوە، کە خۆیان وەك دەستکەوتێکی ئیعلام و راگەیاندن فەخری پێوە دەکەن. بەڵام پەخشی زۆرێکیان بردووەتە دەرەوەی مەملەکە وەك (مدینة دبي الإعلامیة) و شوێنەکانی تر، ئایا بەو گواستنەوە ئەو بیدعەتە قەبیحانە حەڵاڵ دەبێت؟ یان وا دەزانن (والعیاذ بالله) پەروەردگار پێیان نازێنت؟ یان پێیان وایە کە پێویستی پابەندبوون بە شەریعەتەوە تەنها لە مەملەکەدایەو بەس؟! ئەمە

کاری حەرام و خراپ و گومڕایین، ئایا بە چ دەقێکی قورئان و سوننەت بۆ خۆتانتان حەڵاڵ کرد، ئەگەر دەڵێن بیدعەتە بۆ باسی ناکەن

---

شتێك نییە خوانەخواستە ئیفترا کرابێت بنواڕە بۆ: موقع: الموسوعة الحرة، ویکیبیدیا: ملحق: قائمة القنوات الفضائية السعودية: http://ar.wikipedia.org/wiki/بتاريخ:٢٢-٤-٢٠١٣م. هەروەها لە هەمان ویب سایتی (الموسوعة الحرة ویکیبیدیا) لە باسی (روتانا)دا هاتووە: «روتانا شركة ترفيهية يملك السعودي الوليد بن طلال بن عبد العزيز أغلبها واشترت النيوز كوربوريشن (المملوكة من روبرت مردوخ) ٩٪ من روتانا بقيمة ٧٠ $ مليون وهى شركة للإنتاج الموسيقى وأيضا اسم لمجموعة من القنوات الفضائية الترفيهية. انطلقت روتانا في العام ١٩٨٥ وبدأت في تصنيع الاسطوانات حتى غدت في فجر الألفية الجديدة أكبر شركة للإنتاج الفني العربي في عالم الموسيقى والأفلام. وتضم حاليا أكثر من ١٠٠ مطرب ومؤدي». پاشان باسی بەشەکانی کردووە کە هەر هەمووی لە مەجالی فلیم و گۆرانی و سەماو موسیقاو..هتد یدا خۆی دەبینێتەوە کە هیچیان ڕووی باسکردنیان نییە؟! هەروەها لە باسی (مجموعةmbc) هاتووە: «مركز تلفزيون الشرق الأوسط (mbc) هي شركة تلفازية عربية سعودية يمتلكها السعودي وليد البراهيم، تقوم ببث قنوات تلفزيونية منوعة ترفيهية وغير ترفيهية مجاناً. مقرها الرئيسي يوجد حالياً في دبي وتحديدًا مدينة دبي للإعلام». هەروەها تیایدا هاتووە کە لە یەکێك لە بەڵگەنامەکانی (الويكيليكس)وە نەقڵ کراوە کە دەڵێت: «في إحدى تسريبات الويكيليكس ورد ذكر إم بي سي في إحدى الوثائق التي تتحدث عن لقاء بين شخصيتين أمريكيتين في إحدى مقاهي ستاربكس بجدة ويقول أحدهما "أن الحكومة هي التي تدعم هذا الإنفتاح وترى أنها مضادة للفكر المتطرف" و"أن الحرب الفكرية هي السائدة هنا والإعلام الأمريكي عبر قنوات مثل إم بي سي وروتانا تكسب فكر المواطن العادي بطريقة لم تتمكن الحرة أو وسائل البروباجندا الأمريكية الأخرى من فعلها"». کە وەرگیراوە لە ڕاپۆرتێك بە ناوی: الإتجاهات الأيديولوجية والملكية في الإعلام السعودي، عن مجلة الحجاز الالكترونية، http://www.alhejazi.net/seyasah/019810.htm بتاريخ: ٢٥-٤-٢٠١٣م. هەروەها (مجموعة(art) الفضائية، يملكها رجل الأعمال السعودي صالح كامل كانت تبث من روما وفي بداية هذا العام انتقلت إلى عمان– الأردن،ومجموعة(أوربت) الفضائية يملكها الأمير بندر بن محمد بن سعود الكبير مقرها روما – إيطاليا، بنواڕە: أسماء مالكي القنوات الفضائية العربية أغلبهم سعوديون: عن موقع: http://www.muslm.net/vb/showthread.php بتاريخ:٢٥-٤-٢٠١٣م.

وچارەسەریان ناکەن؟ چونکە بێ دەنگیتـان نیشـانەی ڕەزامەنـدی بوونـە، بەڵێ ئوصـوڵیەکان گوتویانـە: « لا یُنسـب إلى سـاكتٍ قـولٌ » بـەڵام ئـەوە نیوەی قاعیدەکەیەو ئەو قاعیدە قەیدێکی موعتەبەری هەیە کە تـەواوکاری قاعیدەکەیە کە بریتییە لە: « لكنّ السُّكوت في معرض الحاجة بيانٌ » [1].

کەواتە ئەو بێدەنگییەتان لە جێگەی پێویستایە بە ڕوونکردنەوە بۆیـە بەڵگە و نیشـانەی ڕازی بوونتانـە بـەو بیدعەتانـە، چـونکە حـوکم حـوکمی خۆتانەوە هیچ عوزرێکی شەرعیشتان نییە، وەك ئیکراهـو..هتـد. هـەرکات وەختێ یەکێك لە گـەورەکانیان دەمرێـت ئـەو کەناڵانـەی بـە باسمـانکردن یەکسەر دەگۆڕێن بە قورئان خوێنـدن و تـەعزێ، ئـیتر بـەوا دەزانرێـت کـە ئەوان تەمویلیان دەکەن. لە کاتێکدا وای بڵاو دەکەنەوە کە قورئان ناگـات بـە مـردووی موسـڵمانان! بـەڵام دیـارە قورئـان لـەو کەناڵـە بیدعەتانـەوە دەگاتە مردووی ئەوان؟! کە تا دوێنێ گۆرانی و سەمای پـەخش دەکـرد و ئێستاش قورئان و پاش تەعزێکەش دیسان گۆرانی و کاری بێ شەرعی؟!

٣ـ ئایا زۆرێك لە بازرگانی و وەبەرهێنان (استثمارات)ی کەنداو لە تەك بانکـە ڕیبەویەکانـدا لـە ئەمـەریکا و چـین و ئـەوروپاو.. هتـد لـە دەرەوەو ناوەوەدا بیدعەت وحەرام نییە؟ کە زۆربەی زۆری ئەگەر نەڵێن تێکـڕای بـە ڕیبا و فەوائیدی سەرمایەدارانی جیهان بەڕێوە دەچێت؟ ئایـا وەهابیـەکان بۆ هەڵوێستێکی شەرعییان نییە لەو بارەوە؟!

٤ـ ئایا داهێنانی زۆرێك لە نیکاحە بیدعەکانی وەك (نكاح المسيار) کـە سەرچاوەی لە وڵاتانی کەنداوەوە گرتـووە بـە تایبـەت مەملەکـە، چـەندین

---

١. شرح القواعد الفقهية (القاعدة السادسة والستون (المادة٦٧) للشيخ أحمد بن الشيخ محمد الزرقا المتوفى ١٣٥٧هـ (ص ١٩٦). وقواعد الفقه، للشيخ محمد عميم الإحسان المجددي البركتي: (ص٢٣) برقم(٢٨٢).

کێشـەی خێزانـی و کۆمەڵایـەتی و ئـایینی دروسـت نـەکردووە؟ یـان لـە بەرانبەی بیدعەتی نیکاحی موتعەی شیعەکاندا دایان ناوە، کە بێگومان وەك گوتویانە: (فإن كلا طرفِي الإفراط ذميمُ). شایەنی باسە موفتییەکانی مەملەکە یەك دەنگ نین لە حەڵاڵکردنی ئەو جۆرە نیکاحە، (عبد العزيز ابن باز) و (عبد الله بن عبد الرحمن الجبرين عضو الإفتاء والدعوة والإرشاد بالمملكة العربية السعودية) دەڵێن حەڵاڵە، بەڵام (يوسف محمد المطلق عضو الإفتاء والدعوة والإرشاد بالمملكة العربية السعودية كذلك) دەڵێت بیدعەیەو حەڵاڵ نییە! ؟[1]

٥- ئایا ئەو هەموو ئیسراف و تەبزیر و زیادەڕەویەی کە لەو وڵاتانی نیوە دورگەی عەرەبیدا دەکرێت بە لە زۆر بواردا بیدعەتی گومڕایی نییە؟ لە نموونەی: پێش پێشێن بە نوێ ترین ئۆتۆمبێل و بە ووشتر لە سەر ملیونەها دۆلار کە کەناڵی پێشبڕکێی (ووشتر) و(سیارات)یان بۆ تەرخانکراوە و راستەو خۆ پەخش دەکرێت و مێشك و بیر و هۆشی هەزاران گەنجی موسڵمانی سەرگەردان کردووەو ئەمیر ومەئموریشی گرتووەتەوە، لە کاتێکدا هەرشتێك موسڵمان لە یادی خودا مەشغوڵ بکات ئەوا حەرامە و حوکمی قوماری هەیە: « كل ما أُلْهي عَنْ ذِكرْ اللهِ فهو مَيْسَرٌ»[2] ...

١. بنواڕە بۆ درێژەی دژەفەتواکانی وەهابیەکان لەو رووەشەوە: بالعلم نرتقي: بعض الأنكحة المختلف فيها، د.عائشة محمد خضر الزهراني عن أرشيف المدونة الالكترونية، عن موقع: http://okse77.blogspot.com/2010/01/10-2.html بتاريخ: ٢١-٤-٢٠١٣م.

٢. قال الحافظ البيهقي: أخبرنا أبو زكريا بن أبي إسحاق ثنا أبو العباس محمد بن يعقوب ثنا بحر بن نصر ثنا بن وهب أخبرني يحيى بن عبد الله بن سالم عن أبي سلمة قال: قلت للقاسم بن محمد: ما الميسر؟ فقال كل ما ألهى عن ذكر الله وعن الصلاة فهي ميسر ». السنن الكبرى ت: محمد عبد القادر عطا: (١٠/٢١٧)برقم(٢٠٧٦٢).

هەروەها یاری ڕاوکردن بە پەلەوەرەکانی نەسر و شاهێن و سەیارە و کات کوشتن لەوپێناوەدا، هەروەها سەرفکردنی پارەیەکی زۆر، تەنانەت چەندین کەناڵێکی تایبەتی لە سەتەلایتدا کە بۆ ئەو بابەتانە تەرخان کراوە[1]، کە بێگومان بیدعەتە، چونکە حەرامی ئەم جۆرە راوە لەوەدایە کە بە تەنها لە بەر هیوایەت وحەزو ئارەزووبازی ئەنجامدەدرێت، نەك لە پێویستی بە گۆشتی راوکراوەکە، لە کاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: « من قتل عصفورة فما فوقها بغير حقها سأله الله عز وجل عن قتلها »، قيل يا رسول الله وما حقها؟ قال: « يذبحها فيأكلها ولا يقطع رأسها فيرمي بها »[2] هەروەها فەرمویەتی: « ما من إنسان يقتل عصفورا فما فوقها بغير حقها إلا سأله الله عز و جل عنها يوم القيامة قيل: يا رسول الله وما حقها ؟ قال: حقها أن يذبحها فيأكلها و لا يقطع رأسها فيرمي به»[3] هەرەرەها فەرمویەتی: «من قتل عصفورا عبثا عج إلى الله (عز وجل) يوم القيامة منه يقول: يا رب ان فلانا قتلني عبثا ولم يقتلني لمنفعة»[4].

٦ــ بەرزکردنەوەی قەسر و بورجەکان و دروستکردنی (ناطحات السحاب) کە لە کەنداودا بەربڵاوە ئایا فەرموودەی « يتطاولون في

١. لە وانە (قناة الحر الفضائية للصقور والطيور).

٢. رواه الإمام الشافعي في السنن المأثورة (٢/ ٩٣)برقم(٥٥٦) والبيهقي في السنن الكبرى (٨٦/٩)برقم(١٧٩٠٧) عن عبد الله بن عمرو بن العاص(رضي الله عنهما).

٣. أخرجه الحاكم في المستدرك على الصحيحين: (٢٦١/٤)برقم(٧٥٧٤) عن عبد الله بن عمرو (رضي الله عنهما).على شرط الشيخين وأقره الذهبي في التلخيص.

٤. رواه الإمام أحمد في مسنده (٤ / ٣٨٩) برقم(١٩٤٨٨) عن عمرو بن الشريد عن أبيه (رضي الله عنه). ورواه كذلك ابن حبان في صحيحه بتحقيق الأرناؤوط (٢١٤/١٣)برقم(٥٨٩٤).

البُنيان»[1] کە لە نیشانەکانی قیامەتە نایگرێتەوە؟ کە ئەمڕۆ تەواوی وڵاتی خلیجی گرتووەتەوەو مونافەسەی ناشەریفانەی لە سەر دەکرێت بە پارەی نەوتی موسڵمانان؟! ئەگەر بورجێك لە وڵاتێکی گاور سەد تابیق بێت ئەمانیش بینایەك دروست دەکەن بەرزتر بێت لەو، واتە بەردەوام شوێنکەوتەی ئەوانن، کە ئەو شوێن کەوتنەش فەرموودەی صەحیحیی لە سەرە کە دەفەرموێت: « لتتبعنَّ سُنن من قبلكم، شبرا بشبر، وذراعا بذراع، حتى لو سلكوا جُحر ضبّ، لسلكتموه. قلنا يا رسول الله: اليهود والنصارى ؟ قال: فمنْ! »[2].

٧- ڕاپۆرتی دامەزراوەی (هیومن رایتس ووج) و ڕاپۆرتی (CNN)کە لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکاوەل (واشنتن) دەرچووە لە ڕۆژی دووشەممەی لە ١٣-٥-٢٠١١م، تیایاندا باس لە بازرگانی بە مرۆڤەوە دەکات لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و وڵاتی سعودیەش یەکێکە لە پێشەوەی ئەو وڵاتانەی کە سیستەمی (الكفالة) تیایدا زۆر خراپ و لاوازە بووتە هۆی بازرگانی بە لەشی کرێکارانەوە بە هەر دوو ڕەگەزەوە، لەو ڕوویشەوە لە خانەی سێیەمی ئەو وڵاتانەدا دانراوە، بەو هۆیەوە مافپەروەران هەستاون بە سازدانی هەڵمەتێك لە فەیس بووکدا بە ناونیشانی (حملة لإلغاء الاتجار بالبشر وإلغاء الكفيل في دول الخليج)؟![3].. ئایا ئیسلام نەهات بە

١. رواه مسلم في صحيحيه عن عمر رضي الله عنه في حديث طويل وفيه: «.. قال: فأخبرني عن الساعة؟ قال ما المسؤول عنها بأعلم من السائل قال فأخبرني عن أمارتها قال أن تلد الأمة ربتها وأن ترى الحفاة العراة العالة رعاء الشاء يتطاولون في البنيان..» صحيح مسلم:(١/٣٦)برقم(٨).

٢. صحيح البخاري (٣ / ١٢٧٤)برقم(٣٢٦٩) عن أبي سعيد (رضي الله عنه).

٣. بنواڕە: تقرير أمريكي يكشف الاتجار بالبشر عبر نظام "الكفالة عن موقع: http://ar-ar.facebook.com/pages بتاريخ: ٢٢-٤-٢٠١٣م. هەروەها:

مەبەستی نەهێشتنی کۆیلایەتی، کەچی ئێستا وولاّتانی نیوە دورگەی عەرەب لە پێشەوەی ئەو وولاّتانەدان بۆ ژیاندنەوەی سیستەمی کۆیلایەتی بە ناوی خزمەتکاری و خزمەتگوازرییەوە بە هەردووو رەگەزی نێر و مێ کە زیاتر ئەو کۆیلایەتیە موسلّمانانی وولاّتانی هەژاری باشوری رۆژهەلاّتی ئاسیای گرتووەتەوە ! ؟ لە کاتێکدا کە پێویست بوو کار بکەن بۆ لابردن و قەلاچۆکردنی سیستەمی کۆیلایەتی وەك چۆن پێشەوایانی تەصەووف و تەریقەت بەتایبەت صۆفیە (سەنوسیەکان و تیجانیەکان و قادریەکان و شازیلیەکان و دەرقاویەکان) لە وولاّتانی ئەفەریقادا کۆششێکی گەورەیان لەو پێناوەدا ئەنجامدا وەك (الأمیر شکیب أرسلان) بە درێژی لە (حاضر العالم الإسلامي)دا و (العلامة أبي الحسن الندوي) لە (رجال الفکر والدعوة)یدا ئەو شەهادەتەیان داوە[1]. بەلّێ ئەمەیە کاری صۆفیەکان کە سوننەتەکانی ئیسلام زیندوودەکەنەوە، و ئەوەش کاری وەهابیەکانە کە سیستەمی کۆیلایەتی جەهالەت زیندوودەکەنەوە !

٨ـ ئایا وولاّتی وەهابیەکان لە پێشەوەی وولاّتانی رۆژهەلاّتی ناوەڕاست نەبوو کە دانیان دا لە سالّی (٢٠٠٠ز) بە رێکەوتننامەی نێودەولّەتی (سیداو)دا وتەصدیقیشیان کرد، سەبارەت بە کۆششکردن لە پێناو نەهێشتنی هەموو جۆرە جیاکاری و تەمیزێك لە دژ ئافرەتان، کە چەندین بەندی راستەوخۆی دژە بە دەقەکانی شەریعەتی پیرۆزی

---

http://fouadzadieke.de/news1/2-flash/ بتاریخ: ٢٣-٤-٢٠١٣م.

١. بنوارە: حاضر العالم الاسلامي: تألیف: لوثروب ستودارد: ترجمة: الأستاذ عجاج نویهض، (تعلیقات): الأمیر شکیب أرسلان:٢/ ٢٩٣ _ ٣٩٦. و رجال الفکر والدعوة في الإسلام للأستاذ أبي الحسن الندوي: ص ٣٤٩.

ئیسـلام؟![1] هەرچـەندە ئێسـتا پـاش ئـەوەی کـەزانییان کـارێکی زۆر ناشەرعییان کردووە هەندێ لە جنوجووڵ هەیە لە سعودیە بەم دواییانە لـە پێناو کشانەوەی مەملەکە لەو رێکـەوتن نامـە، دواییـان بـر یتیـی بـوو لـە: (المؤتمر العالمي للمرأة المعاصرة في السعودية) بـوو کـە زانکـۆی (القصـيم) پێی هەستابوو[2]. لە کاتێکدا دەوڵەتانێکی وەك (ئێـران و سـودان) واژووی ئـەو رێکەوتنامـەیان نـەکردووە تـا ئێسـتا. هـەروەها ئەمـەریکا تـەوقیعی کردووە بـەڵام موصـادەقەیان لـە سـەر نـەکردووە! واتـە رازییـە لـە سـەر بەندەکان بەڵام مولزەم نییە بە جێبەجێ کردنی.

٩ـ ئایا بە پێی راپۆرتی رێکخراوەکانی مافی مرۆڤ وولاتی وەهابیـەکان تا ئەمرۆش لە دواکەوتووترین وولات نییە سەبارەت بە پێشـێلکردنی مـافی ئافرەتان کە تا ئێستاش لێخـوڕینی ژنـان بـۆ سـەیارە لـە لایـان بیدعەتـە، جگە لە مافەکانی هاوڵاتی بوون و رامیـاری و کۆمەڵایـەتی و..هتـد. وە بـە پێـی بەرنامەیـەکی (الجزيـرة مباشـر) ولـاتی وەهابیـەکان لـە پێشـەوەی وولاتـانی عەرەبییـە بـۆ ژن تەڵاقـدان و هـەموو رۆژێـك (٣٣) ئـافرەت لـەو وولاتە تـەڵاق دەدرێـت کـە تـەنها لـە سـاڵێکدا دەکاتـە (١١٨٨٠) حاڵـەت، بێگومان ئەو جۆرە سلوکە ئایینی ئیسلامی ناشـیرین کـردووە و دوژمنـانی

---

١. بنـــــــواره بـــــــۆ بنـــــــوود و ماددەکـــــــانی لـــــــە ســـــــایتی: www.un.org/womenwatch/daw/cedaw/text. بتأريخ ١٤ـ٤ـ٢٠١٣م.

٢. بنـواره: (حملـة سـعودية ضـد اتفاقيـة (سـيداو) لمخالفتهـا الشـرع الإسـلامي عـن موقـع: www.almahmal.com بتأريخ ١٤ـ٤ـ ٢٠١٣

ئیسلام بەکاریدەهێنن بە مەبەستی دوژمنایەتی کردنی ئیسلام و تانەدان لە موسڵمانان![1].

١٠ـ لە ئیسلامدا لە شەوانی ڕەمەزاناندا پێویستە موسڵمانان مەشغوڵ بکرێن بە زیکر و نوێژ و تەراویح و کاری خێرو چاکە، کەچی دەزگا ڕاگەیاندنە فەرمییەکانی وەهابیەکان موسڵمانان لەو شەوە پیرۆزانەدا مەشغوڵ دەکەن بە زنجیرە درامای کۆمیدیەوە، لە وانە: زنجیرەی بەردەوامی (طاش ما طاش)، کە بۆ چەندین ساڵە ئەم بیدعەتە بەرهەم دەهێنرێت و هیچ وەهابییەکیش فززە ناکات[2]، بەڵام ئەگەر موسڵمانێك لە موناسەبەیەکدا یان بێ موناسەبە صەڵاواتێك بدات لە دیداری حەزرەت(ﷺ) دەمەو دەست لێی ڕاست دەبنەوەو پێ دەڵێن: نەکەی ئەوە بیدعەیە، باشە (طاش ما طاش) سوننەتە (والعیاذ باللە)، بەڵام صەڵاوات و فاتیحەو...هتد بیدعەتە؟!

١١ـ بەکارهێنانی زاراوەکانی ڕێزلێنان و تەعزیم بۆ کاربەدەستانی کەنداو لەوانە (جلالـةُ الملك) (الملك المُفَدَّى) (الملك المعظّم) (صاحب السُّمو) (صاحب العظمة) (صاحب السعادة) (حضرة صاحب السُّمُو)

١. وەرگیراوە لە کەناڵی: (الجزیرة مباشر، برنامج حكایة امرأة، یوم السبت، الساعة ٣٠ – ٦ دقیقة، ١٣-٤-٢٠١٣م.

٢. ئەو زنجیرە کۆمیدیە گاڵتە جاڕیە زیاتر لە (١٦) زنجیرەی لە پاش ساڵی (١٩٩٣) تا ئەمڕۆ دەرچووە، لە دەرهێنانی (عبد الخالق غانم) و نواوندنی (عبد الله السدحان و ناصر القصبي) یە، لە نمایشکردنی(قناة السعودیة الأولى) پاشان کەناڵی(MBC). بنوارە: (طاش ما طاش (مسلسل). عن موقع الموسوعة الحرة (ویكیبیدیا): http://ar.wikipedia.org/wiki/ بتاریخ:٢٤-٤-٢٠١٣م. بۆ ئەم ساڵیش وەك بیستومە بە داخەوە هەمان کەناڵی سعودی ئێستا ڕیکلامی بۆ دەکات بە ناونیشانی (رمضان یجمعنا) واتە (یجمعنا مع طاش ما طاش)!؟

..هتـد کـه تێکڕایـان لـه حەقیقەتـدا صـیفاتی پـەروەردگارن، ئایـا بەکارهێنانیان بۆ بەندەکان بیدعەتی چراپەو نزیکیش نییـه لـه کـوفرەوە؟ ئەی بۆ کەس لە وەهابیەکان هەڵوێستیان نییـه؟ بـەڵام ئەگـەر ووشـەیەکی ڕێزلێنانی وەك (سید) بۆ پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) کـه (سـید النـاس)ە بـه ریوایەتی صەحیح و (سید ولد آدم)ە به ریوایـەتێکی تـری صـەحیح، ئەمـه بیدعەته و نابێت بگوترێت! ئایا ئەمه نـاو دەنـێن چـی و چـۆن سـبەی لـه حوزوری پەروەردگاردا(جل جلاله) وەڵام دەدەنەوە؟!

١٢ـ ئایا سیستەمی (توریث) و حوکمڕانی به ویراسـەته بیدعـەت نییـه که لای وەهابیەکان پێیادە دەکرێت و کەسـیش باسـی بکـات؟! ئایـا هـیچ دەقێکی قورئان وسوننەت وچوار خولەفای له سەر هەیە؟ ئایـا مەملەکـەت و عەرەبچێتی و خێڵبازی له کویَ و چ دەقێکی ئیسلامدا هەیە؟

١٣ـ ئایا (الكيل بمكيالين) و(الازدواجية في المعايير) نییه که به ئاشـکرا پیادە دەکرێت لەو ووڵاتەدا له مەڕ مەسئەلەکانی سەر گۆڕە پانی سیاسـی

١. نەك هەر بۆ مـەلیك و پاشا کـانی خۆیان بـەکاری دەهێـنن، بگـەره بـۆ پادشـایانی ئـەوروپا جێگەکانی تر له پاشا بیَ باوەڕاکانی دونیا هەمان ووشەی تەعزیمیان بۆ بەکار دەهێنن، بەڵێ ئێمه بۆ موسڵمانان پێمـان دروسـته لـه سـەر قاعیـدەی مـەجاز لـه زمـانی عەرەبیـدا، بـەڵام کێشـەکه ئەوەیـه وەهابیـەکان بـۆ پاشـاکانی خۆیـان و دونیـا ئـەو زاراوەو دەسـتەواژانه بـه کاردەهێنن له کاتێکدا بڕواشیان به مەجاز نییە، له بەر ڕێگە گـرتن لـه تـەئویلی مـەرج دار لـه ئایات و ئەحادیسی صیفاتدا، بەڵام ئایا نازانین له کاتێکدا که بڕوایان به مەجاز و تەئویل نییه چـۆن تـەئویلی ئـەو دەسـتەواژە ترسـناکانه دەکـەن لـه بـواری عەقیـدەدا؟ چ مـەخرەجێکی شەرعییان بۆ دەبیننەوە؟ ئەگەر بینیانەوە ئەوا با هەمان مەخرەج و تەئویلیش ببیننـەوە بـۆ ئەو دەستەواژانەی که موسڵمانان بـۆ پێغەمبـەران و پیاوچـاکان بـه شـێوازێکی شایسـتەیی بەکاری دەهێنن، وەك (سەیید، حەزرەت،..هتد) ئەگەر نا، بـیَ ئینصـافییەو پێوانەکردنـه بـه دوو پێوانه!

وەك (شۆڕشە عەرەبیەكان)، لە سوریا درووستە شۆڕش بەڵكو واجبە، بەڵام لە (بحرین) حەرامە، لە میصر لە ئەوەڵەوە حەرام بوو، پاشان حەڵاڵكرا، ئێستا راوەستاون لە بەرانبەری، لە تونس دروست نەبوو تەنانەت داڵدەی سەرۆك كۆمارەكەشیان دا، پاشان حەڵاڵ بوو! واتە: هەر وولاتێك دەسەڵات تیایدا سەر بەوان بێت حەرامە تیایدا شۆڕش و سەریەوانیش نەبوو واجبە! ئایا بانێكەو دوو هەوا، مەگەر لە ئیسلامدا زوڵم هەر زوڵم نییە چ شیعە بیكات یان سوننی، كافر بیكات یان موسڵمان!؟

١٤ـ بە بێ هیچ بەهانەیەك، وەهابیەكان هەڵدەستن بە لابردنی ناوی دەرگاكانی حەرەمی مەككەی پیرۆز كە لە ناوی مێژووی ئیسلامەو هی سەردەمی سەلەفە وكلتوری تەواوی موسڵمانانە، وە لە جێگەیاندا ناوی پاشاكانی مەملەكە دادەنێن، وەك لابردنی (باب العمره رقم ٦٢) بۆ (باب الملك سعود) و (باب الفتح رقم ٤٥) بۆ (باب الملك خالد) بە مەرسومێكی گشتی. لە لایەن (الرئیس العام لشؤون المسجد الحرام والمسجد النبوي الشیخ صالح بن عبد الرحمن الحصین). بەو پێیەش ئێستا حەرەمی مەككەی پیرۆز چوار دەرگای سەرەكی هەیەن هەر چواریان بە ناوی پاشاكانی مەملەكەوەیە، (باب الملك سعود، باب الملك خالد، باب الملك عبد العزیز، باب الملك فهد)[1]. كە ئەمە لە لایەك تەشویهكردن و تەزویركردنی مێژووی ئیسلامە و لە لایەكیش تەقدیس كردنی شەخصە كە بێگومان هیچیان لە شەریعەتدا پەسەند نییە.

---

١. بنواڕە: تغيير أسماء أبواب الحرم المكي، مجلة العكاظ السعودية، الصادرة يوم الأربعاء، ١٥ ديسمبر،٢٠١١م. عن تقرير: أبو زيد الفتاح، موقع الجسد http://aljsad.com/forum9/thread وموقع: أون إسلام، الخميس، ١٥سبتمبر،٢٠١١م: http://www.onislam.net/arabic/newsanalysis/analysis بتاريخ: ٢٠_٤-٢٠١٣م.

١٥ـ هەروەها وەهابیەكان وایان گەیاندوویانە كـە هەڵواسـینی رەسـم و وێنەی مرۆڤ درووست نییە، بـەڵام بـۆ خۆیـان لـە هـەر كۆشـكێكدا وەك لـە دەزگاكانی راگەیاندنی خۆیاندا دەبینرێن دەیان وێنەی گەورەكانی خۆیـان هەڵدەواسرێن وكەسیش لە وەهابیەكان باسی ناكات!

ئەمەو زۆرێكـی تـر لـەو بیدعەتانـەی كـە لـە وڵـاتی وەهابیەكانـدا بـە تایبەت و لـە كەنـداودا بـە گشـتی بـەدی دەكرێـت شـتێكی شـاراوە نییـەو بەرجەستەیە كەم تا زۆر تیایاندا، كە لێرەدا مەبەست لـە باسـكردنی ئـەو بیدعەتــە خراپانــەیان بریتییــە لــەوەی كــە ئێمــەی (ئــەهلی ســوننەت و جەماعــەت و پــەیڕەوانی راســتەقینەی چــوار مەزهــەبی ئیســلام) دەڵــێن: هەركات وەهابیەكان ئەم بیدعانەیان گۆڕی بە سوننەت، وچاكسازی ئایینی و كۆمەڵایەتی و ئابووری و..هتد یان كرد ئەو وەختـە بـا باسـی بیدعـەت و سوننەت بكەن لە جیهانی ئیسـلامیدا، وەك عـەرەب گوتوویـەتی: (فمـن لم یكن لنفسه فكیف یكون لغیره) و (مـن كـان بیتـه مـن الزجاجـة فـلا یرمـي بیوت الناس بالحجارة) لە كاتێكدا ئەو شتانەی كـە ئـەوان بـە بیدعـەتی لـە قەڵەم دەدەن و زانا و موسڵمانانی هەر چوار مەزهـەبی ئیسـلامی لـە سـەر تەبدیع و گومڕا دەكەن، ئەو شتانە یا راستەوخۆ بۆ خۆیان سوننەتن، یـان لە داهێنراوە چاكە پەسـەند كراوەكـانن بـە لای زانایـانی ئیسـلامەوە، وەك ئەو شەست و سێ نموونەی كە لەمەو پێش خستمانە بەرچاو (وبـالله تعـالی التوفیق).

( رووی شەشەم )

## چەند نمونەیەك لە بیدعەتی وەهابیەكان لە زانستی عەقیدەدا

جێگەی ئاماژەو نمونە لە سەر هێنانەوەیە كە هەركەسێك عەقیدەی وەهابیەكانی خوێندبێتەوە لە كۆن و تازەدا جگە لەو هەموو (تناقچات)انەی كە باسمانكردن زۆرێك لە بیدعەتی خراپ و داهێنراوی سەیرو سەمەری بەرچاو دەكەوێت كە هیچ زانایەك لە سەلەفی صالّح نە گوتویانەو نە پێشی رازی بوون، لەوانە:

١ـ مەسئەلەی تەوەسوول بە زاتی پاكی پێغەمبەران و پیاوچاكان، بۆ یەكەم جار كە سێك جیاوازی خستە نێوان زات و نوایانەوە لەو مەسئەلەدا، و جیاوازی خستە نێوان حالّی حەیاتی دونیایی و حەیاتی بەرزەخییەوە لە هەمان مەسئەلەدا (أبو العباس أبن تیمیة) بوو، كە ئەو بیدعەتەی دامەزراندو پاشان خەڵكێكی نەفام شوێنی كەوت وەك پێشەوا (تقی الدین أبو الحسن السبكی) دەفەرموێت: « انه لم ینكر احد التوسل بالنبي (ﷺ) وكذا بالصالحين،حال حياتهم، وبعد مماتهم، ولاسمع به في زمن من الازمان،حتى جاء ابن تيمية، فتكلم في ذلك بكلام، لبس فيه على الضعفاء الاعمار، وابتدع مالم يسبق إليه في سائر الاعصار.. »[1]. بۆ زیاتر شارەزایی لەو روانگەوە

---

١. شفاء السقام في زيارة خير الانام: للإمام تقي الدين السبكي: (ص١٢٣).

هەروەها لە چوارچێوەی ئەو مانایەدا بنوارە: دفع شبه من شبه وتمرد، ونسب ذلك إلى السيد الجليل الامام احمد، للعلامة تقي الدين ابوبكر بن محمد الحصني الدمشقي الشافعي المتوفى ٨٢٩هـ، (ص٢١). ونيل الأوطار: للشوكاني: (٤/٣٣)، والتوسل في الإسلام بين الحلال والحرام، للشيخ محمد البداغي: (ص٣٠)، ومصباح الأنام وجلال الظلام، للحبيب بن احمد الحداد المتوفى ١٢١٦هـ، ومعه: فتاوى الشيخ محمد بن سليمان الكردي: (ص١١٢). ومفاهيم يجب ان تصحح للسيد محمد علوي المالكي:(ص١٥٧)، والتاج الجامع للاصول للشيخ منصور علي

وزانینی بەڵگە شەرعییەکان لـە سـەر دروسـتی (توسـل) و (استشـفاع) بـە پێغەمبەران و پیاوچاکان خوێنەری بەڕێز دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ هـەردوو کتێبـی (دانـەر): (أحكـام الإسـتعانة ومـدلولاتها في الشـريعة الإسـلامية)[1]، (الكفيلة في إثبات أوجه التوسل والوسيلة»[2].

٢ـ بیدعەتی داهێنانی مەزهەبێك بـە نـاوی مەزهـەبی سـەلەفییەت یـان وەهابییەت، کە نە ناو نە شۆرەت و نە دەعواو نە باوەڕ و نە بۆچوونی بەو شـێوەیە کـە لـە سـەردەمی پێغەمبـەر(ﷺ) و صـەحابەو پێشـینەکاندا هەبووە!

ئەوەی هەبووە سەلەفی صالح بووە، نەك سـەلەفییەت و وەهابییـەت، ئاشکراشە کـە سـەلەفی صـالح لـە سـەر بـیرو بـاوەڕی ئـەهلی سـوننەت و جەماعەت بوون لە ئوصولدا، لە فرووعیشدا پابەند بوون بە یەکێك لە چوار مەزهەبـە فیقهییەکـەی ئیسـلامەوە، بـەڵام وەهابیـەکان، مەزهـەبی ئـەهلی سـوننەت وجەماعـەتیان گۆڕیـوە بـە مەزهـەبی وەهابییـەت و چـوار مەزهەبەکەشیان گۆڕیوە بە لامەزهەبییەت وبانگەشە بۆ بەد مەزهەبی، کـە پێچەوانەی تەواوی چوار قەرنەکەی سەلەف و دە قەرنەکەی خەلەفیش!

لەم بوارەدا زانای خواناس شەهیدی راستەقینەی میحـراب و حەلقـەی تەفسـیری قورئـانی پـیرۆز: (پرۆفیسـۆر د. محمـد سـعید رمضـان

---

ناصف: (٣١٨/١)، وشـواهد الحـق في الاسـتغاثة بسـيد الخلـق، للقاضـي يوسـف بـن اسماعيـل النبهـاني: (ص ١٥١–١٦٩، والتوسـل بـالنبي وبالصـالحين للشـيخ أبـي حامـد بـن مـرزوق: (ص٢٠٠–٢٥٦).

١. أحكام الاستعانة ومدلولاتها في الشريعة الإسلامية، د. حسن خالد مصطفى المفـتي: (ص ٢٨٥ فما بعدها).

٢. بنواره: الكفيلة في إثبات أوجه التوسل والوسيلة: د. حسن خالد مصطفى المفـتي: ورقـة: ٨٨ فما بعدها.

البوطي)(رحمه الله) دوو كتێبی زۆر به پیت و ناوازەو بەڵگەداری نوسیوه بـه ناونیشـانی: (السـلفيّة مرحلـة زمنيّـة مباركـةٌ، لا مـذهبٌ إسـلامي)، (اللاّمذهبيّـة أخطـرُ بدعـةٍ تُهـدِّدُ الشـريعة الإسـلامية)، کـه پێویسـته هـەموو رۆشـنبیرێکی ئیسـلام پـەروەر بگەڕێتـەوه سـەریان بـۆ ئاشـنا بـوون لـەو حەقیقەتانه.

جێگەی سەرسوڕمانی هۆشدارانه که وەهابیەکان له کاتێکدا بانگەشـه بۆ بێ مەزهەبی و تەقلیدنەکردنی پێشەوایانی سەلەف دەکـەن لـه نمونـەی ئیمامی شـافیعی، لـه هـەمان کاتـدا وەك ئاشـکرایه بانگەشـه بـۆ تەقلیـدی مەرجیعـەکانی خۆیـان دەکـەن لـه وەهابیـەکان، کـه نـه زانـای سـەلەف و پێشــەنەن، نــه متمانــەی موســڵمانایان لــه ســەره، نــه شایســتەی تەقلیدکردنیشن، چونکه دارای فیقهی ئیسلامی نـین، بۆیـه پێیـان دەڵێن: ئەگـەر راسـت دەکـەن تەقلیـدی چـوار مەزهـەبی بـاوەڕ پێکـراوی ئیسـلام دروست نییه، ئـەی بـه چ بەڵگـەو چـۆن دروسـته تەقلیـدی مەرجەعـەکانی تاقمی وەهابیەکان؟! به شێوازێکی تر: ئەگەر دروست بێت تەقلیـدی (ابـن باز)و نمونەکانی، ئـەی چـۆن دروسـت نییـه تەقلیـدی زانایـانی پایەبـەرزی چوار مەزهەبی ئیسلام، ئایا کامیان شایستەتره به پـەیڕەوکردن، زانایـانی چــوار مەزهــەبی ئیســلام کــه چــواره ســەدەیه متمانــەی هــەموو زانــا وموسڵمانانیان پێ دراوه، یان تاقمی وەهابیەکان لەم ئاخیر زەمانەدا!؟

٣ـ بیدعەتی داهێنانی وەهابیـەکان بـۆ بۆچـونێکی نـامۆ و بـەدرەر لـه هەردوو مەزهەبی باوەڕ پێکراوی زانایانی سەلەف و خەلەف واتـه: (مـذهب التفويض)و(مـذهب التأويـل)، لـه ئایـەت و فـەرمودەکانی صـیفاتدا، واتـه: مەزهەبیان نه تەفویضه و نه تەئویلیشه!

چونکه ئاشکرایه مەزهەبی تفویض: که زۆرینەی سەلەفی له سەر بوو جگه لـه مەدرەسـەی (ابـن عبـاس) رضـي الله عنهمـا، بـه هـیچ شـێوەیەك لێکۆڵینەوەو باسی مانای ئەو ئایـەت و فەرمودانـەیان نـەکردووه، هـەرکات گەشتبنه ئەو دەقانه دەمەودەست فەرمویانه: (الله أعلم بمراده).

هەروەها مەزهەبی (تأویل)یش که مەزهەبی زۆرینەی زانایانی خەلەفە، له کاتی پێویستدا به پێی چەند مەرج و دارِشتەیەك تـەئویلی صـەحیحیان بۆ کردوون بەو شێوازەی کـه بگونجێـت لـه تـەك تـەنزیهی خـودادا، یاسـاو ئوسلوبەکانی زمانی عەرەبیش له حەقیقەت و مـەجاز و..هتـد بیگرێتـەوە، چونکه قورئان بەو زمانه هاتووەته خوارەوە، تەواوی ئوسلوبەکانی زبـانی عـەرەبی تیایدایـە، هـەردوو کۆمەڵەکـەیش لـه ئـەهلی (تفـویض) و ئـەهلی (تأویل) مەبەستیان تەنزیهی باری تەعالابوو، وەك پێشەوا (أبو نصر عبد الوهـاب تـاج الـدین ابـن السـبکي(ت٧٧١هـ) لـه (جمـع الجوامـع)یـدا ـ کـه کۆکراوەی سەد سەرچاوەیه له زانستی ئوصـوڵی فیقهـدا ـ دەفـەرموێت: « وننزِّهُ عند سماع المُشكلِ ثمّ اختلف أئمتُنا: أنؤوّل، أم نفوّضُ، مُنَزِّهين، مع اعتقادهم على أنَّ جهلنـا بتفصـيله لا يقـدحُ» [1]. هـەروەها بـۆ زانینـی ئـەو راسـتیانەش پێویسـتە خوێنـەری رۆشـنبیر بگەرِێتـەوە سـەر پـەرتووکی بەهێز و بەسوودی لـه چـاپدراوی زانـای هاوچـەرخی کـورد پرۆفیسـۆر (د. محسـن عبـد الحميـد) بـه ناونیشـانی: (تفسـير آيـات الصـفات بـين المثبتـة والمؤولة) [2].

---

١. جمـع الجوامـع لابـن السـبكي مـع شـرح المحلـي وحاشـية البنـاني وتقريـرات الشـربيني: (٢/٤٠٧-٤٠٨). مطبعة دار إحياء الكتب العربية لعيسى البابي الحلبي وشركاه، بمصر.

٢. کتێبێکی مامناوەندییەو چەند جارێك له چاپ دراوە.

بـــەڵام وەك گوتمـــان بیدعـــەتی وەهابیـــەكان لێـــرەدا ئەوەیـــە كـــە بۆچونێكیان هەیە لە دەرەوەی مەزهەبی ئەهلی سوننە، واتە نـە مەزهـەبی سەلەفە و نە مەزهەبی خەلەفە..

مەزهەبی سـەلەف نییـە" چـونكە بـە هـەواو ئـارەزووی خۆیـان قسـەو تەئویل وتـەفسیر وشەرحی ئـەو ئایـەت و فەرمودانـە دەكـەن، كـە بـە هـیچ شێوەیەك زانایانی سەلەف باسیان نـەكردووەو بۆیـە ئیفتیرایـە پێیـان، بـە شێوازێك كە لاشە و جیسم ومـەكان وزەمـان وجیهـەت وحـدود وشـەو ورۆژ وهاتن ورۆشتن بۆ خودا بڕیار دەدەن (والعیاذ باللە)، هـەروەها پێیـان وایـە خودا لە سەر عەرشە بە حەقیقەت كـە ئەمـە بڕیـاردانی مەكانـە بـۆ خـودا، هەروەها مەزهەبی (حلول)یشە، چونكە جیاوازی نییە لە نێوان ئـەوەی كـە بڵێت مەخلوقێك حەل بووە لە خودادا یان خودا حەل بووە و چـووەتە نێـو مەخلوقێكی خۆیەوە كە عەرشە. (والعیاذ باللە).

هەروەها مەزهـەبی خەلـەفیش نییـە" چـونكە ئـەو جـۆرە تەئویلانـەی وەهابیەكان دەیكەن ناگونجێت لە گەڵ تەقدیس و تەنزیهی خودا و لە گەڵ ئایەتەكانی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ [1] ﴿فَلا تَضْرِبُوا لِلَّهِ الْأَمْثَالَ إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ﴾ [2] وێڕای سـورەتی ئـیخلاص: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ * اللَّهُ الصَّمَدُ * لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ * وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ﴾ [3].

٤ـ بیدعەیەكی تری وەهابیەكان لە رووی مەنهـەجی عەقیدەوەیـە، كـە ئاشكرایە بەردەوام باسـی تەوحیـد دەكـەن و كەچـی زۆر بـە هەڵـەش لێـی حـاڵی بـوون، وە لـەو رووەوە بیدعـەتێكی ترسـناكیان بڵاوكردووەتـەوە و

---

١. (سورة الشورى: ١١).

٢. (سورة النحل: ٧٤).

٣. (سورة الإخلاص: ١ — ٤).

خەڵکێکی نەزان بە زاراوەکانی زانستی عەقیدەی ئیسلامی زۆر بەداخەوە لێیانەوە فێربوون و بەو هۆیەشەوە موسڵمانان بە کافر دەزانن وکافرەکانی سەردەمی پێغەمبەریش(ﷺ) بە بڕوادار! ؟

بەڵێ وەهابیەکان وایان بڵاوکردووەتەوە کە هەر کارێك دەقێکی راستەوخۆی لە سەر نەبوو دروست نییە پیادە بکرێت، ئێمەش دەپرسین: ئایا ئەو تەقسیمەیان بۆ تەوحیدی پەروەردگار بە دوو بەشەوە واتە: (توحيد الألوهية وتوحيد الربوبية)، لە کوێوە و بە چ دەقێك هێناویانە، ئایا پێش (ابن تيمية) هیچ کەسێك ئەو جۆرە تەقسیمەی کردووە و ئەو جۆرە بۆچۆنەی هەبووە کە شایستەی پەیڕەوکردن بێت وەك زانایانی پێشینەی ئیسلام لە نمونەی چوار پێشەواکە یاخود هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)؟ واتە حەوت سەد ساڵ پێش (ابن تيمية) هەموو موسڵمانان تەوحیدیان ناسیوە کەبۆ خودا (جل جلاله): (واحدٌ في ذاته، واحدٌ في صفاته، واحدٌ في أفعاله)، هیچ کەس نەیگوتووە لە زانایانی پێشینە: تەوحید دەکرێت بەو دوو بەشەوە کە ئەوان کردوویانە، واتە: خەڵکێك هەبێت (توحيد الربوبية)تی تەواو بێت بەڵام (توحيد الألوهية)تی نا تەواو؟!

بەڵکو هەموو زانایانی ئیسلام فەرمویانە: هەرکەس بە راستی تەوحیدی (الألوهية)ی هەبێت، (واتە تەنها خودا بە شایشتەی پەرستن بزانێت) ئەوا پێویستە (توحيد الربوبية)تیش هەبێت،(واتە تەنها خودا بە پەروەردگار و خولقێنەری بزانێت) بە پێچەوانەشەوە..

بێگومان مەبەستی تەقسیمی تەوحید بۆ ئەو دوو بەشە لای وەهابیەکان و پێش ئەوانیش لای تەیمییەکان و ئەوانەش بە پێخاوسی شوێنیان کەوتوون وەك هەندێك لە نوسەرەکانی هاوچەرخ ئەوەیە کە بە خەیاڵی خۆیان بیسەلمێنن کە دەگونجێت کەسێك (توحيد الربوبية)ی

هـەبێت، بـەڵام (توحيـد الالوهيـة)ی نـەبێت، نمونـەش بـە موشـریکەکانی مەککـە دەهێننـەوەو بـە تـەنها گومـانی خۆیـان دەڵـێن: ئـەوان تەوحیـدی (الربوبيـة)یـان هـەبووە، بـەڵام (توحيـد الألوهيّـة)یـان نـەبووە، لـە سـەر بۆچوونەکەیان بەڵگەی زاهـیری ئایـەتی پـیرۆزی: (وَلَـئِنْ سَـأَلْتَهُمْ مَـنْ خَلَـقَ السَّـمَاوَاتِ وَالْـأَرْضَ وَسَـخَّرَ الشَّـمْسَ وَالْقَمَـرَ لَيَقُـولُنَّ الله) و هاووێنـەکانی، دەهێننـەوە کـە دەفـەرموێت: « ئەگـەر بپرسـیت لـە کافرەکـان کـێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کـردووە، کـێ رۆژ و مـانگی خولقانـدووە، لـە وەڵامدا، بە سەر زارەکی دەڵێن خودا».

**لە وەڵامدا دەڵێن:**

ئەم بۆچوونە بەو شێوازە هەڵەیە، چونکە ئـەو ئایەتـە و هاووێنـەکانی هیچیان بەڵگە نین لە سەر بڕواهێنانی راستەقینەی موشریك و کافرەکان بە خودا و حەقیقەتی (توحيد الربوبية) لە دەرونیانـدا، واتـە: لـە وەڵامـدا کـە دەیـانگووت: (خودا)یـە. بـەڵام تـەنها بـە سـەرزارەکی و دەیـانگووت و بـە زوبـان ئیقراریـان پـێ دەکـرت، نـەك بـە دڵ و دەروون و کـردەوە، چـونکە ئەگـەر ئیقرارەکـەیان بـە راسـتی بوایـە ئـەوا شـوێنی دەکـەوتن و رێبـازی تەوحیدیان هەڵدەبژارد بە سەر شیرك و بت پەرستیدا کردەوەیـان دەکـرد بەو دەستەواژەیە.

بەڵام لە بەر ئەوەی کە دەیانزانی تەنها (الله) یە کە (صـانع) و(خـالق) و دروستکاری بوونەوەرە نەیاندەتوانی لەو حەقیقەتە هەڵبێن و لە وەڵامـدا نەڵێن (الله)یە..بەڵام ئیقرارەکەیان تەنها بە زوبان بوو نەك هەڵقوڵاوی دڵ و دەروون و بیرو بـاوەڕێکی راسـتەقینە، بۆیـە ئیمانەکـەیان نادروسـت بـوو، هەروەها سودی پێ نەگەیاندن. هەرچەندە لە قیامەتـدا دەبێتـە بەڵگـە لـە

سەریان. بۆیە پێشەوا (أبو محمد البغوي) لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: «إقرارُهم لزومُ الحجة عليهمْ، {بَلْ أكْثَرُهُمْ لا يَعْقِلُونَ} يُنكرون التوحيد، مع إقرارهم بأنه الخالق لهذه الأشياء»[1].

کەواتە ئەو جۆرە ئیعتیراف و ئیقرارە تەنها کیفایەت نییە بۆ تەوحیدی (الربوبية)، وە ناکرێت بگوترێت ئەوان دارای ئەو جۆرە تەوحیدە بوون، (حاشا وکلاّ) چونکە لە پاش لەحزەی ئیعتیرافەکەیاندا ئەوان دەبوونەوە بە موشریك و بێ باوەڕ و گاڵتەکار، وەك پێشەوا (أبو الحسن الواحدي) لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: «إذْ أشركوا به بعد إقرارهم بأنه خالقها»[2].

هەروەها پێشەوا (أبو الليث السمرقندي) نەفی تەوحیدکردنیان دەکات بە ئایەتێکی تر و دەفەرموێت لە تەك ئەوەشدا کە ئیعتیرافیان دەکرد بەوەی کە خودا دروستکارە، بەڵام ئەوان هەرگیز تەوحیدی خودایان نەدەکرد وەك دەفەرموێت: « قل الحمد لله بل أكثرهم لا يعقلون توحيد ربهم، وهم مقرُّون بالله عز وجل خالق هذه الأشياء» [3].

چونکە ئەگەر بە ڕاستی ئیقراریان بکردایە دەبوو بەردەوام بونایە لە سەر ئەو ئیقرارەیان و کردەوەیان پێ بکردایە، ئەوەش کە لە سەر ئەو ئیقرارەیان جێگیر دەبوو (ما يترتّب عليه) پێویست بوو جێ بەجێیان بکردایە کە بریتییە لە یەکتاپەرستی و بڕوا بە پێغەمبەر(ﷺ) و ڕۆژی ئاخیرەت و..هتد، بەڵام ئەوان بەردەوام موشریك و خودا نەناس بوون وگاڵتەیان بە پێغەمبەر(ﷺ) و ڕۆژی دوایی دەکرد، کەواتە ڕاستیشیان

---

١. تفسير معالم التنزيل للبغوي: (٦ / ٢٥٥).

٢. الوجيز في تفسير الكتاب العزيز للواحدي (ص ٨٥٠).

٣. بحر العلوم لأبي الليث السمرقندي: (٢ / ٦٤٠).

نەكردووە لەو ئیقرارەیاندا.. ئەمە چ ئیقرارێكە كە پابەند نەبن بەو شتەی كە لێیەوە لازم و پێویست دەگەرێت كە حەقیقەتی تەوحیدە؟ وەك پێشەوا(شمس الدين الشربيني) لە تەفسیرەكەیدا دەفەرموێت: «{قل} يا أفضل الخلق متعجباً منهم في جمودهم: كيف يُقِرُّوْنَ بما يلزمهم التوحيدَ، ثم لا يوحِّدونَ؟!»[1].

بەو پێیەش دەركەوت كە تەنها ئیقرار بەڵگەی تەوحید نییە، ئیقرار بە وەحدانییەتیش مانای بڕوا بوون نییە پێی، چونكە مەرج نییە ئەو ئیقرارە بە خواهیشت و هەڵقوڵاوی دڵ و دەروون بێت، چونكە ئاشكرایە كە هەموو بوونەوەر بە كافرەكانیشەوە ئیقراریان كردووە لە عالەمی ئەرواحدا بە خوایەتی (الله). وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُمْ مِنْ كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُصَدِّقٌ لِمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنْصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي قَالُوا أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُمْ مِنَ الشَّاهِدِينَ﴾[2] بەڵام ئەو ئیقرارەیان نەیكردن بە یەكتاپەرست و چونكە پاشگەز بوونەوە و بەكافریش مردن.

هەروەها دەشكرێت ئیقراری موشریكەكان بە شێوەیەكی ناچاری و(اضطرار)ی بوو بێت، لەو رووەوە كە هەموو بوونەوەر بەڵگەیە لە سەر خوایەتی (الله) (جل جلاله)، بۆیە نەیان دەتوانی روو بەروو ئەو ئیعتیرافە نەكەن، وەك پێشەوا (القاضي البيضاوي) لە تەفسیرەكەیدا دەفەرموێت: «ولئن سألتهم من خلق السماوات والأرض ليقولن الله) لوضوح الدليل المانع من إسناد الخلق إلى غيره، بحيث اضطروا إلى إذاعته (قل الحمد لله) على

١. تفسير السراج المنير للشربيني: (٣ / ١٣٩).

٢. (سورة آل عمران: ٨١).

إلزامهم وإلجائهم إلى الاعتراف بما يوجب بطلان معتقدهم) بل أكثرهم لا يعلمون (أن ذلك يلزمهم» [1].هەروەها پێشەوا (أبو العباس ابن عجيبة) دەفەرموێت: « ليقولن الله، لوضوح الدليل المانع من إسناد الخلق إلى غيره، فيضطرون إلى الإقرار بذلك»[2].

بۆيە ئەو جۆرە بڕوا و ئیمانەی کافرەکان پێی دەگوترێت ئیمانی بە ئیکراهو و ئیحراج بوون: (الإيمان الكرهي) کە سودی نییە، نەك بە دڵ ودەروون: (الإيمان الطوعي)، کە سودی هەیە و لە شەرعدا ئیعتیباری پێ دەکرێت، لەو رووەوە پێشەوا (ابن كثير) دەفەرموێت: « {لَهُ أَسْلَمَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ} أي استسلم له مَنْ فيهما طوعاً وكرهاً، كما قال تعالى: {وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعاً وَكَرْهاً} الآية، وقال تعالى: {أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى مَا خَلَقَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ يَتَفَيَّأُ ظِلالُهُ عَنِ الْيَمِينِ وَالشَّمَائِلِ سُجَّداً لِلَّهِ وَهُمْ دَاخِرُونَ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مِنْ دَابَّةٍ وَالْمَلائِكَةُ وَهُمْ لا يَسْتَكْبِرُونَ يَخَافُونَ رَبَّهُمْ مِنْ فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ} فالمؤمن مستسلم بقلبه وقالبه لله، والكافر مستسلم لله كرهاً، فإنه تحت التسخير والقهر والسلطان العظيم الذي لا يخالف ولا يمانع» [3].

هەروەها پێشەوا (ابن عطية الأندلسي) دەفەرموێت: «واختلفوا في معنى قوله " طوعا وكرها " فقال مجاهد: هذه الآية كقوله تعالى ﴿ولئن

١. تفسير البيضاوي أنوار التنزيل: (٤ / ٣٥٠).

٢. البحر المديد لأبي العباس ابن عجيبة الأندلسي: (٥ / ٥٦٨).

٣. تفسير القرآن العظيم لابن كثير: (١ / ٤٦٥).

سألتهم من خلق السماوات والأرض ليقولن الله﴾ [١] فالمعنى: أن إقرار كل كافر بالصانع هو إسلامٌ كرها » [٢].

بۆیە ئەو ئیقرارەی موشریکەکانی مەککە ئیقرارە لە سەر زانیاریان لە سەر بوون و وجودی خودا، نەك لە سەر ئەوەی کە بە راستی تەوحیدی خودایان هەبوبێت، بۆیە پێشەوای تابیعی (عطاء) لە تەفسیری ئایەتەکانی: ﴿وَكَأَيِّنْ مِنْ آيَةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ * وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللَّهِ إِلَّا وَهُمْ مُشْرِكُونَ﴾ [٣] دەفەرموێت: « كانوا يعلمون أن الله ربهم، وهو خالقهم، وهو رازقهم، وكانوا مع ذلك يُشركون» [٤].

بێگومان تەنها زانین کیفایەت نییە بۆ بەرجەستە بوونی تەوحید، چونکە ریوایەتەکە دەڵێت (كانوا يعلمون) ناڵێت (كانوا يوحّدون). چونکە تەنها زانین و عیلم رێگر نابێت لە شیرك بۆ خودا بڕیاردان، بۆیە پێشەوا (الزمخشري)یش لەو رووەوە لە تەفسیری ئایەتی: ﴿وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَاءَ الْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ وَخَرَقُواْ لَهُ بَنِينَ وَبَنَاتٍ بِغَيْرِ عِلْمٍ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يَصِفُونَ﴾[٥] دەفەرموێت: «ومعناه: وعلموا أن الله خالقهم دون الجن، ولم يمنعهم علمُهم أن يتَّخذوا من لا يخلق شريكاً للخالق»[٦]. واتە: «کافرەکان دەیانزانی کە خودا دروستکاریانە نەك جنۆکە، کەچی ئەو زانینەیان

---

١. (سورة الزمر ٣٨).

٢. المحرر الوجيز لابن عطية الأندلسي: (٤٨٤/١).

٣. (سورة يوسف: ١٠٥، ١٠٦).

٤. قال الحافظ السيوطي في (الد المنثور في التفسير بالمأثور)(٥٩٣/٤): « أخرجه سعيد بن منصور وابن جرير وابن المنذر وأبو الشيخ عن عطاء (رضي الله عنه) ».

٥. (سورة الأنعام: ١٠٠).

٦. تفسير الكشاف للزمخشري: (٥٠/٢).

بەربەست نەبوو لەوەی کە شەریکێك بۆ خودای دروستکاریان بڕیارنەدەن و نەیپەرستن کە ئەو شەریکەش جنۆکەیە».

کەواتە ئیعتیرافی کافرەکان بریتیی بووە لەوەی کە زانیویانە خودا بوونی هەیەو مەوجوودە، نەك تەوحیدی خودایان کردبێت بە واتا زاراوەکەی، واتە دەیانزانی خودا تاك و تەنهایە بەڵام موکابەرەو موعانەدەی ئەو حەقیقەتەیان دەکرد، ئیتر ئەمە کەی پێی دەگوترێت تەوحید؟ بۆیە پێشەوا (فخر الدين الرازي) دەفەرموێت: « القوم كانوا مُعترفين بوجود الله تعالى كما قال: وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ »[1] بێگومان (معترفين) مانای (موحّدين) ناگرێتەوە ونابەخشێت.

کەواتە شیرکەکەیان لە هەردوو رووەوە بووە، (الشرك في الربوبية و الشرك في الألوهية) چونکە (توحيد الألوهية) وەستاوە لە سەر (توحيد الربوبية)، ناکرێت لە یەکتر جودا بکرێنەوە، وەك ئیمام(فخر الدين الرازي) دەفەرموێت: « الإلهيةُ موقوفةٌ على الخالقية، وحصل القطعُ بأنَّ من لم يخلق لم يكن إلهاً»[2].

چونکە ئەو دوو تەوحیدە وەك (لازم و ملزوم)ن بە یەکەوە، بێ یەکتر مەحاڵە بەرجەستە بوونی حەقیقەتی تەوحید لە هیچ کەسێکدا، کەواتە موشریکەکانی مەککە نە تەحیدی (الربوبية)یان هەبووە بە راستی نە تەوحیدی (الألوهية)شیان هەبووە بە راستی، بۆیە پێیان گوتراوە کافر و

---

١. تفسير الرازي: مفاتيح الغيب: (١٣ / ١٠١).

٢. تفسير الفخر الرازي: (١٦/٣٢).

موشريك، خۆ ئەگەر تەوحیدی (الربوبیە)یان هەبایە بە راستی ئەوا دەبوو تەحیدی (الألوهیة)شیان بۆ پەیدا ببوایەو یەکتاپەرستبوونایە..

هەرچەندە ئەمەی کە رابوورد کیفایەتە بۆ کەسی تێگەشتوو بەڵام بۆ زیاتر سەلماندنی ئەو حەقیقەتە ئەم بەڵگانەی تریش دەخەینە روو:

١ـ تەواوی ئەو ئایەتانەی کە لەو بوارانەدا هاتوون، راستەوخۆ کۆتایی ئایەتەکەو ئایەتەکانی پاشتریان بەڵگەن لە سەر ئەوەی کە بڕوای موشریکەکان تەنها بە زوبانەو هیچی تر، بۆیە قورئان پێیان دەفەرموێت: ئەگەر خودا بە هەق دەناسن و بڕواتان بە تەوحیدی خوایەتی خودا هەیە و راست دەکەن کە خودا ئەرز ئاسمان و بەشەری دروست کردووە ئەی بۆ واز لە شیرك و کوفر و عینادی خۆتان ناهێنن؟! کە ئەمەش ئایەتەکانە: ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّى يُؤْفَكُونَ *اللَّهُ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ * وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ نَزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ مِنْ بَعْدِ مَوْتِهَا لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾ [١]، ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّى يُؤْفَكُونَ * وَقِيلِهِ يَا رَبِّ إِنَّ هَؤُلَاءِ قَوْمٌ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ [٢] ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلْ أَفَرَأَيْتُمْ مَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ أَرَادَنِيَ اللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَاشِفَاتُ ضُرِّهِ أَوْ أَرَادَنِي بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَاتُ رَحْمَتِهِ قُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ

---

١. (سورة العنكبوت: ٦١ — ٦٣).

٢. (سورة الزخرف: ٨٧، ٨٨).

﴿الْمُتَوَكِّلُونَ﴾ [1] ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ [2]

کەواتە لە هەموو ئەو شوێنانەدا کە خودا دەفەرموێت: لێیان بپرسە ئایا کێ دروستکاری بوونەوەرە، ئەوانیش دەڵێن: خودا، ئەوا تەنها بە سەرزارەکی و زوبانە و چونکە کردەوەکانیان نیشانی دەدات کە درۆدەکەن، چونکە لە دڵەوە بڕوایان وانییە، بە بەڵگەی بەردەوامییان لە سەر کوفر و شیرك و گوناهەکانیان، بۆیە خودا بە درۆیان دەخاتەوە دەفەرموێت (فَأَنَّى يُؤْفَكُونَ) أي إن كانوا صادقين. (وَقِيلِهِ يَا رَبِّ إِنَّ هَؤُلَاءِ قَوْمٌ لَا يُؤْمِنُونَ) أي الإيمان الحقيقي القلبي. (قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ) (أي عقلا يحجرهم عن ارتكاب الكفر والمعاصي). (قُلْ أَفَرَأَيْتُمْ مَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ) (أي إن كنتم صادقين فيما تقولون، فلماذا تعبدون الأصنام وتشركون بالله؟).(قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ)(أي: أنهم لا يعلمون أن الله بسبب كفرهم ونفاقهم وعدم إيمانهم قد هيأ لهم من عذابه الأليم ما سيرونه عاجلا أم آجلاً، وحينئذ يعلمون أن الله تعالى كان يعلم بخواطر قلوبهم وما يسترون به من نفاقٍ حقيقةَ الكفر).

٢ـ ئەگەر راست بێت کافرەکانی قورەیش تەوحیدی روبوبییەتیان هەبوبێت، ئەوا پێویست بوو تەوحیدی ئولوهییەتیشیان هەبێت، چونکە ئەو یەکەمەیان لە نێوەندی دووەمیاندایە، واتە کەسێك بە دڵ راست بکات (رب) خودایە، ئەبێ بەدڵیش راست بکات (إله)یش تەنها خودایە، واتە کە کە مرۆڤ دەڵێت: (الله ربي وخالقي) ئیتر ئەبێ راستیش بکات و بڵێت: (الله

١. (سورة الزمر: ٣٨).

٢. (سورة لقمان: ٢٥).

معبودي المستحق للعبادة)، ئەگەر راستیش نەكات ئەوا لە هیچیاندا راست ناكات.

٣ـ چەندین ئایەت هەیە نەفی ئیمان و تەوحیدی (الربوبیة)ی كردووە لە موشریكەكانی مەككە، ئەگەر وەهابیەكان راست دەكەن ئەوان (توحید الربوبیة)یان هەبووە، ئەبێ (والعیاذ باللە) ئایەتەكانی قورئان وانەبێت، ئاشكرایشە خەبەری قورئان هەققە، كەواتە بۆچوون و رای وەهابیەكان بەتاڵە، لەو ئایەتە پیرۆزانەی كە خوای گەورە بە صەراحەت باسی كوفری موشریكەكانی كردووە لە (ربوبیة)تی خودادا لە دوو شوێندا لە سورەتی (فصلت) لە ئایەتی پیرۆزی: ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَنْدَادًا ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ * وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِنْ فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِلسَّائِلِينَ * ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ﴾[1] واتە: « بە راستی ئێوە ئەی موشریك و بێ باوەڕەكانی مەككە بە راستی ئێوە كافر و موشریكن بەو خودایەی كە زەوی خوڵقاندووە لە دوو رۆژدا، ئێوە راست ناكەن و شەریك بۆ ئەو پەروەردگارە بڕیار دەدەن كە پەروەردگاری هەردوو عالەمە..». كەواتە دەركەوت كە (موشریكەكانی قورەیش) تەوحیدی (ربوبیة)تیان بە هیچ شێوەیەك نەبووە، وە هەركەسێك بڵێت وانییە، ئەبێ ئەو ئایەتە پیرۆزەو هاوواتاكانی بە درۆ بخاتەوە (والعیاذ باللە).. هەروەها ئایەتە پیرۆزەكانی: ﴿إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَالَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ قُلُوبُهُمْ مُنْكِرَةٌ وَهُمْ مُسْتَكْبِرُونَ * لا جَرَمَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ إِنَّهُ لا يُحِبُّ الْمُسْتَكْبِرِينَ * وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ مَاذَا

---

١. (سورة فصلت: ٩ – ١١).

أَنْزَلَ رَبُّكُمْ قَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ﴾ [1] هـەمان راسـتی بەرجەسـتە دەكـات، چونكە نەفی هەردوو تەحیدی كردووە لە بتپەرستان، لـە ئایـەتی یەكەمـدا نەفی تەوحیدی (ألوهیة)ی لـەوان كـردووە، لـە ئایـەتی دووەمیشـدا نـەفی تەحیدی (ربوبیة)تی لێ كردوون.

هەروەها هەردوو ئایەتی تری پیرۆزی سورەتی (النحل): ﴿وَقَالَ اللَّهُ لا تَتَّخِذُوا إِلَهَيْنِ اثْنَيْنِ إِنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ * وَلَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَهُ الدِّينُ وَاصِبًا أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَتَّقُونَ﴾ [2] هەمان مەبەست دەگەیێنن.

٤ـ ئەگەر هەردوو تەوحیدی (الربوبیة)و (الألوهیة) یەك ماناو مەبەست و یەك كاریگەریی و یەك حوكمیان نەبوایە، خـوای گـەورە لـە قورئانـدا بـە جودا باسی نەدەكردن، بەڵكوو هـەموو جارێك دەیفـەرموو: (إلهكـم وربكـم الله) ئەمەش بە هـیچ شـێوەیەك لـە قورئانـدا نـەهاتووە، بـەڵكو هـەرجارێك یەكێكیان هاتبێت، كیفایەتی مانـا و حـوكمی ئـەوی تریـانی كـردووە، وەك ئایـەتی﴿وَإِلَهُكُـمْ إِلَـهٌ وَاحِـدٌ لا إِلَـهَ إِلا هُـوَ الـرَّحْمَنُ الـرَّحِيمُ﴾ [3] ئـیتر باسـی (رب)ی تیادا نییـە، چـونكە یـەك مانـاو مەبەسـتیان هەیـە لـە حەقیقەتـدا، هەروەها وەك ئایەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَـالُوا رَبُّنَـا اللَّـهُ ثُـمَّ اسْـتَقَامُوا فَـلا خَـوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ [4] ئیتر باسی (إلهنا) نەهاتووە، چونكە هەركەس بە راستی گوتی (ربنا) ئەبێ بشزانێت و بە دڵ ئیقـرار بكـات و بـە كـردەوەش ئیسپاتی بكات كە تەنها (الله)یشـە(جـل جلالـە) كـە (رب)و پـەروەردگارە، كەواتە (ربنا الله) هەردوو جۆرە تەوحیدەكەی لـە خـۆ گـرد چ (ربوبیـة)و چ

١. (سورة النحل: ٢٢ — ٢٤).

٢. (سورة النحل: ٥١، ٥٢).

٣. (سورة البقرة: ١٦٣).

٤. (سورة الأحقاف: ١٣).

(ألوهية)ت. چونكه له راستيدا (رب الناس) و (ملك النـاس) و (إلـه النـاس) تەنها و تەنها (الله)يە، كە پەروەردگاری هەموو بوونەوەرە، بۆیە تەنها ئـەو شایستەی پەرستنە.

ئەگەر دەڵێت: بۆچی فەرمویەتی: (قل أعوذ برب النـاس) پاشـان (إلـه الناس)[1]، کەواتە تەوحید دوو بەشە، دەڵێین: ئەو دەسـتەواژانە هـەموویان یەك مەبەست و حوکمیان هەیە، کە ئیقرارە بە خودای تاك و تەنها کە هەم پەروەردگارە هەم مـەلیك و پادشـای حـەقیقی یـە و خـاوەنی بوونـەوەرە، هەم خودا و شایستەی پەرستنە، ئەگەر ئەوەی تۆ دەیڵێیت وابێ ئـەی چـی دەکـەیت لــە ئایــەتی نێوانیــان واتــە: (ملــك النــاس) خــۆ ئــەمیش دەستەواژەیەکی جودایە لە دوو ئایەتەکـەی تـر، کەسـیش باسـی (توحیـد الملوكية)ی نەکردووە چونکە وەك گوتمان: یەکێك بە حەق خـودا ناسـبێت وموسڵمان بێت دەزانێت تەنها ئەوە پەروەردگاری بوونـەوەر، تـەنها ئـەوە مـالیکی دونیـا و ئاخیرەتـە و تـەنها ئەویشـە (الله) و شایسـتەی پەرسـتن، هــەروەها بــاقی نــاوەجوان و صــیفەتە بــەرز و ئەفعالــە پــڕ حیکمــەت وپەندیاریەکانی تەنها شایستەی ئەو زاتەیە (جل جلاله وعمّ نواله).

٥ـ ئەگـەر راسـتبێت موشـریکەکانی مەککـە تەوحیـدی (ربوبیـة)تیـان هەبوبێت، ئەوا بێ گومان لە ئەهلی بە هەشت دەبوون، چونکە قورئـان لـە چەندین شوێندا باسی ئـەهلی بەهەشـتی بـۆ کـردووین، وەصـفیان دەکـات ودەفەرموێت ئەوانەی کە پێیان وابوو خودا رەبب و پەروەردگاریانـە، بـەڵام بە راستی نەك وەك کافرەکانی مەککـە، وەك دەفـەرموێت: ﴿قُـلْ أَؤُنَبِّـئُكُمْ بِخَيْرٍ مِنْ ذَلِكُمْ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِنْدَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَـا الْأَنْهَـارُ خَالِـدِينَ

١. (سوره الناس:١ـ٣).

فِيهَا وَأَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ﴾[1]. ﴿الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾[2] ئیتر باسی (إلهنا)ی تیادا نییه، چونکه هەرکەسێك بەراستی گوتی (ربنا) ئەوا وەك ئەوە وایە گوتبێتی (إلهنا)، بە بێ جیاوازی. هەمان حەقیقەت دووبارە بووەتەوە لە هەردوو ئایەتی پیرۆزی سورەتی (آل عمران) وەك دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلا أَنْ قَالُوا رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِي أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ *فَآتَاهُمُ اللَّهُ ثَوَابَ الدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ الْآخِرَةِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾[3]، هەروەها لە کۆتاییەکانی هەمان سورەتدا وەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ * الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ * رَبَّنَا إِنَّكَ مَنْ تُدْخِلِ النَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ * رَبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَانِ أَنْ آمِنُوا بِرَبِّكُمْ فَآمَنَّا رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ الْأَبْرَارِ * رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدْتَنَا عَلَى رُسُلِكَ وَلا تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّكَ لا تُخْلِفُ الْمِيعَادَ * فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ فَالَّذِينَ هَاجَرُوا وَأُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَأُوذُوا فِي سَبِيلِي وَقَاتَلُوا وَقُتِلُوا لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ثَوَابًا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ وَاللَّهُ عِنْدَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ * لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ الَّذِينَ

---

١. (سورة آل عمران: ١٥).

٢. (سورة آل عمران: ١٦).

٣. (سورة آل عمران: ١٤٧، ١٤٨).

كَفَـرُوا فـي الْبِلَـادِ﴾[1]. هـەروەها ئایەتـەکانی سـورەتی (المائـدة) هـەمان مەبەست دەگەیێنیّ، کە ئەوانەی بە راستی دەڵێن (ربنا) خـودا پاداشـتی لێ خۆشـبوون و بەهەشـتیان دەداتـەوە، بـەڵام ئەوانـەی کـافرن بـە (رب) وپـەروەردگاریان، خـودا تولّـەو سـزایان بـە جەهەننـەم دەداتـەوە، وەك دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا سَمِعُوا مَا أُنْـزِلَ إِلَـى الرَّسُـولِ تَـرَى أَعْيُـنَهُمْ تَفِـيضُ مِـنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا مِنَ الْحَقِّ يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ * وَمَـا لَنَـا لا نُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَمَا جَاءَنَا مِنَ الْحَقِّ وَنَطْمَعُ أَنْ يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ الْقَوْمِ الصَّالِحِينَ * فَأَثَابَهُمُ اللَّهُ بِمَا قَالُوا جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَـارُ خَالِـدِينَ فِيهَـا وَذَلِـكَ جَزَاءُ الْمُحْسِنِينَ * وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴾[2]

٦ـ ئەو درۆیەی موشریکەکانی قورەیش کە بە زوبان دەیانگووت خودا پەروەردگارمانە و بـە دڵ بڕوایـان پێـی نـەبوو، خـودا باسـی فـەرمووە لـە سورەتی (الأنعام) کە لە قیامەتدا بۆیان دەردەکەوێت کە تەنها درۆیان لـە تـەك نەفسـی خۆیـان کـردووە و راسـتیان نـەکردووە لـە دونیـادا کـە دەیانگووت، (ربنا)، بەڵکو تەنها بـە زوبـان ئـەو دەسـتەواژەیان دەگـووت، وەك دەفـەرموێت: ﴿وَيَـوْمَ نَحْشُـرُهُمْ جَمِيعًـا ثُـمَّ نَقُـولُ لِلَّـذِينَ أَشْـرَكُوا أَيْـنَ شُرَكَاؤُكُمُ الَّذِينَ كُنْتُمْ تَزْعُمُونَ * ثُمَّ لَمْ تَكُنْ فِتْنَتُهُمْ إِلاَّ أَنْ قَالُوا وَاللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّـا مُشْـرِكِينَ * انْظُـرْ كَيْـفَ كَـذَبُوا عَلَـى أَنْفُسِـهِمْ وَضَـلَّ عَـنْهُمْ مَـا كَـانُوا يَفْتَرُونَ﴾[3].

٧ـ بەڵگەی تر لـە سـەر ئـەوەی کـە کـافر و دووروووەکـان هـیچ جـۆرە تەوحیدێکیان نەبووە ئەوەیە کە قورئان لە چەندین ئایەتی پـیرۆزدا باسـی

١. (سورة آل عمران: ١٩٠، ١٩٦).

٢. (سورة المائدة: ٨٣ – ٨٦).

٣. (سورة الأنعام: ٢٢ – ٢٤).

ئـەوەی فـەرمووە کـە بـیرو بـاوەڕی راسـتەقینەی ئیمـان و ئیسـلامەتی نەچووەتە نێو دڵ و دەرونیانەوە، بەڵکو تەنها لەسەر زاریانـدا بـووە، وەك ئایەتـە پیرۆزەکـانی سـورەتی (الحجـرات) بـە روونـی ئـەو حەقیەتانـە بەرجەستە دەکات کە دەفەرموێت: ﴿قَالَتِ الأعْرَابُ آمَنَّا قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ وَإِنْ تُطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ لا يَلِتْكُمْ مِنْ أَعْمَالِكُمْ شَيْئًا إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ * إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ * قُلْ أَتُعَلِّمُونَ اللَّهَ بِدِينِكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾[1].

بـۆ مونافیقـەکانیش بـە هــەمان شـێوەی کافرەکـانی فـەرمووە لـە سورەتی(آل عمران)دا کە باسـی حاڵیـان دەکـات و دەفـەرموێت: ﴿وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ نَافَقُوا وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا قَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوِ ادْفَعُوا قَالُوا لَوْ نَعْلَمُ قِتَالا لَاتَّبَعْنَاكُمْ هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَانِ يَقُولُونَ بِأَفْوَاهِهِمْ مَا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ﴾[2] هـەروەها لـە جێگەیـەکی تـردا دەفەرموێت: ﴿يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِمْ مَا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ﴾[3].

٨ـ ئەگەر مەفهومەکەی وەهابیەکان راست بوایە و کافرەکـانی مەککـە تەوحیدی (الربوبية)تیان هەبوایە، کەواتە چ جیاوازییەکیان دەبوو لـە تـەك ئەصحابە موهاجیرەکاندا کە قورئان بەوە ستایشی کردوون کـە تەوحیـدی (الربوبية)یان هەیە و کافرەکان تەنها لـە سـەر ئـەوە دەریـان کـردوون کـە دەیانگوت (ربنـا الله) وەك لـە سـەرەتی (الحـج)دا بـە روونـی دەفـەرموێت:

---

١. (سورة الحجرات: ١٤ – ١٦).

٢. (سورة آل عمران: ١٦٧).

٣. (سورة الفتح: ١١).

﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ * الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ إِلا أَنْ يَقُولُوا رَبُّنَا اللَّهُ﴾ [1] پاشان لە سەر هەمان تەوحیدی (الربوبیة)ی موسڵمانان، خودا پاداشتیان دەداتەوە و دەیانخاتە بەهەشتی بەرینیەوە، وەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلا تَخَافُوا وَلا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ * نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنْفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ * نُزُلًا مِنْ غَفُورٍ رَحِيمٍ﴾ [2]، هەمان حەقیقەتی دووبارە فەرمووەتەوە لە سەرەتی (الأحقاف)دا کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ * أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ خَالِدِينَ فِيهَا جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ [3].

٩ـ ئەگەر راستابوایەو کافر و موشریك تەوحیدی (الربوبیة)تیان هەبێت ئەوا دەبوو لە پرسیارو وەڵامی قەبردا رزگاریان ببوایە، چونکە بە نیسبەت خوداوە (جل جلاله) تەنها پرسیاری دروستکار و پەروەردگاریان لێ دەکرێت بە دەستەواژەی (مَنْ ربك) [4] وەك لە صەحیح دا هاتووە،

---

١. (سورة الحج: ٣٩، ٤٠).

٢. (سورة فصلت: ٣٠ – ٣٢).

٣. (سورة الأحقاف: ١٣، ١٤).

٤. جاو ڤ صحيح مسلم (٤ / ٢٢٠١)برقم (٢٨٧١) عن البراء بن عازب (رضي الله عنه): عن النبي (ﷺ) قال {يثبت الله الذين آمنوا بالقول الثابت }(سورة إبراهيم: ٢٧) قال نزلت في عذاب القبر فيقال له من ربك ؟ فيقول ربي الله ونبيي محمد (ﷺ) فذلك قوله عز و جل { يثبت الله الذين آمنوا بالقول الثابت في الحياة الدنيا وفي الآخرة} وفي سنن أبي داود بسند صحيح عنه كذلك قال: خرجنا مع رسول الله (ﷺ) في جنازة رجل من الأنصار فانتهينا إلى القبر ولما يلحد فجلس رسول الله (ﷺ) وجلسنا حوله كأنما على رءوسنا الطير وفي يده عود ينكت به في الأرض فرفع رأسه فقال " استعيذوا بالله من عذاب القبر " مرتين أو ثلاثا زاد في حديث جرير ها هنا وقال "

ئەوانیش وەڵام نادەنەوە چونكە درۆیان كردووە كە گوتویانە بە زوبان (خودا پەروەردگارە)، بەڵام چونكە موسڵمان بە راستی تەوحیدی (الربوبیة)ی هەیە، لە واڵامی فریشتەكاندا دەڵێت: (الله ربی).

بەم بەڵگانە سەلماندمان كە وەهابیەكان لە حەقیقەتی تەوحید حاڵی نەبوون و بەیانپێگكاوە كە گوتویانە موشریكەكانی مەككە تەوحیدی (الربوبیة)یان هەبووە، چونكە روونبوویەوە كە موشریك و كافرەكان هیچ جۆرە تەوحیدێكیان نەبووە، بەو پێیەش دەركەوت كە تەقسیمی تەیمییەكان و پاشان موقەللیدە وەهابیەكانیان بۆ تەوحید هیچ بنەمایەكی زانستی نییە لە قورئان وفەرموودەو گوتەی سەلەفی صالحدا، بەڵكو یەكێكی ترە لە داهێنراوە خراپ و بیدعەتە خراپەكانیان و بەو هۆیەشەوە

---

وإنه ليسمع خفق نعالهم إذا ولوا مدبرين، حين يقال له: يا هذا من ربك؟ وما دينك؟ ومن نبيك ؟ " قال هناد قال " ويأتيه ملكان فيجلسانه فيقولان له من ربك ؟ فيقول: ربي الله فيقولان له ما دينك ؟ فيقول ديني الإسلام فيقولان له ما هذا الرجل الذي بعث فيكم ؟ " قال " فيقول هو رسول الله (ﷺ) فيقولان وما يدريك ؟ فيقول قرأت كتاب الله فآمنت به وصدقت " زاد في حديث جرير " فذلك قول الله تعالى {يثبت الله الذين آمنوا } الآية. ثم اتفقا قال " فينادي مناد من السماء إن قد صدق عبدي فافرشوه من الجنة وألبسوه من الجنة وافتحوا له بابا إلى الجنة " قال " فيأتيه من روحها وطيبها " قال " ويفتح له فيها مد بصره " قال " وإن الكافر " فذكر موته قال " وتعاد روحه في جسده ويأتيه ملكان فيجلسانه فيقولان له من ربك ؟ فيقول هاه هاه لا أدري فيقولان له ما دينك ؟ فيقول هاه هاه لا أدري فيقولان ما هذا الرجل الذي بعث فيكم ؟ فيقول هاه هاه لا أدري فينادي مناد من السماء أن كذب فافرشوه من النار وألبسوه من النار وافتحوا له بابا إلى النار " قال " فيأتيه من حرها وسمومها " قال " ويضيق عليه قبره حتى تختلف فيه أضلاعه " زاد في حديث جرير قال " ثم يقيض له أعمى أبكم معه مرزبة من حديد لو ضرب بها جبل لصار ترابا " قال " فيضربه بها ضربة يسمعها ما بين المشرق والمغرب إلا الثقلين فيصير ترابا " قال " ثم تعاد فيه الروح ". سنن أبي داود (٦٥٢/٢)برقم(٤٧٥٣) قال المحقق: صحيح».

تـەواوی موسـڵمانانی جیهـانی ئیسـلامییان تـەکفیر و تەبـدیع کـردووە کـە بێگومـان ئـەو جـۆرە تـەکفیر و تەبدیعـە خۆیـان دەگرێتـەوە بـە پێـی فەرمودەی: حەزرەتی ابن عمر (رضـي الله عنهمـا) عـن الـنبي (ﷺ) قـال: «مَـنْ كفَّـر أخـاهُ فقـد بـاءَ بهـا أحـدُهما» [1] (خـوا پـەنامان بـدات)، بۆیـە پێویستە موسڵمان زۆر وریابێت و بە هیچ شێوەیەك ئـەهلی قیبلـی تـەکفیر نەکات، ئەگـەر تـەئویل ببینێتـەوە بـۆ ووتـەکان باشـترە لـە تـەکفیرکردن، چونکە ئەگەر لە راستیدا وانەبێت ئەوا قوربەسەری بۆ کابرای تـەکفیری لـە دونیـادا ناوچـاو تـاڵ و رسـوا، لـە قیامەتیشـدا غـەزەب لـێگیراو جەهەننەمی(أعاذنا الله).

١. (مسند أحمد بن حنبل (٢ / ١٤٢)برقم(٦٢٨٠) قـال المحقـق الأرنـؤوط: إسـناده صـحيح علـى شرط الشيخين».

## سێ بەسەرهاتی کورت لە ( تناقضات )ی وەهابیەکان لە کۆتایی ئەم تەوەرەدا

شایەنی باسە لە سەفەرێکماندا بۆ عومرەی پیرۆز[1] چەند شتێکی سەیر روویدا کە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە وەهابیەکان پابەند نین بە مەنهەجی خۆیانەوەو کاری دژ بە داوای خۆیان ئەنجام دەدەن لەوانە:

( **بەسەرهاتی یەکەم** )

هەموو کەس ئاگادارە کە بۆ چەندین ساڵە لە هەردوو حەرەمی مەککەو مەدینەدا چەندین حەلقەی دەرس و ئامۆژگاری و گوتار هەیە بە چواردەوری دینگەو زاویەکاندا، کە بێگومان ئەگەر داهێنراوی چاکە نەبێت ئەبێت ژیانی وەهابیەکان لە گومڕایی دا بێت، چونکە ئەو حەلقەو دەرس خوێندنانەیان لە تێکڕای زانستە عەقلی و نەقلییەکاندا بیدعەتەو لە سەر دەمی پێغەمبەردا (ﷺ) نەبووە، کەچی ئەوان دەیکەن و دەشڵێن بیدعەتی حەسەنە نییە! بە هەر حاڵ.. ئەمە لەلایەك ئەوەی مەبەستە لێرەدا ئەوەیە کە من بە چاوی خۆم بینیومەو زۆری تریش وەك من ئەو دەرسانەی کە دەگوترێنەوە لە نێو حەرەمی مەککەدا بۆ (طلاب العلم) و سازدەکرێن سەر لە بەیانیان تا نێوەڕۆ دەخایەنێت، هەندێکی دەکەوێتە بیدعەتی خراپەوە، چونکە بە بەرچاوی ئێمەوە بانگی نیوەڕۆ درا و نوێژی سوننەتی راتیبەی نیوەڕۆش کرا هێشتا ئەوان هەر بەردەوام بوون ودەستیان لە دەرسەکانیان هەڵنەگرت! بۆیە منیش گفتوگۆم کرد لە تەك ماموستاکەیاندا و پاش پێشەکییەك پرسیم: ئایا ئەو کارەتان بیدعەت نییە چونکە تا گوتنی قامەت کردن بەردەوامە؟ چونکە بیدعەتی شەرعی ئەو

---

١. لە بەرواری (١٣ –٤ – ٢٠١٢م)دا.

داهێنراوەیە کە سوننەتێك لابەرێت (البدعة الشرعية ما ترفع بها سنة ثابتة)، ئەوەی ئێوەش دەیکەن داهینراوێکە دوو سوننەتی موئەککەدە لادەبات و رەفعی دەکات، یەکەمیان: سوننەتی وەڵامدانەوەی بانگی نیوەڕۆیە، دووەمیان سوننەتی نوێژی راتیبەی پێش نیوەڕۆیە؟ پاشان هەرایەك درووست بوو لە نێوان خۆیاندا مامۆستاکەش گوتی بەیانی وەڵامت دەدەمەوە؟! بەیانی لە هەمان جێگەدا بینیم و هەمان پرسیارم لە بەرانبەر قوتابیەکانی لێ کردەوە، ئەویش ئیحراج بوو بەڵام ئیقراری کرد کە بەو شێوازەی ئەوان بیدعەتە، منیش گوتم: دەرسگوتنەوە لە مزگەوتدا بیدعەتێکی چاکە ئەگەر پێش بانگەکان کۆتایی بە دەرسەکانتان بهێنن وپاشان وەڵامی بانگەکە بدەنەوەو نوێژی راتیبەکانتان بکەن. ووتی: راستەکەی (بارك الله فيك، من أين؟ گوتم: (من كُردستان العراق) زۆر موعجەب بوو پێم و دۆعای خێری کرد، و گوتی دەسەڵاتی ئێمە نییە، نەخشەی وانەکان لای ئیداریەکان وەها دارێژراوە، بەڵام لە سەر ئاگادارکردنەوەکەی تۆ قسە دەکەم لە تەك بەرپرساندا و بۆ چارەسەرکردنی، پاشان مامۆستاکەو هەندێك لە قوتابیەکانی بوون بە دۆست وەختێك کە زانییان من تەنها لە بەر تەقدیمی ئامۆژگاری و راستکردنەوەی هەڵە پرسیارەکانم کردووە چونکە هەڵەکردن لەوێدا زۆر لەسەرتان دەکرێت. منیش بە پێکەنینەوە پێم گوتن براینە: ئێوە ئەو هەموو باسی بیدعەت و سوننەت دەکەن کەچی نازانن لە یەکتریان جیابکەنەوە، ئەوانیش بە پێکەنینەوە دەستیان کردە ملم و خواحافیزیمان لە یەکتر کرد.

## ( بەسەرهاتی دووەم )

له كـاتی تەوافمـدا بـە دەوری كەعبـەی پـیرۆزدا، وەهابییـەك گـوتی: بیدعەتە دۆعا مەكە و رووەمەكـەرە كەعبـەو دەرگاكـەی، منـیش گـوتم: بـرا ئێوه لـە مەدینـەو لـە خزمـەت پێغەمبـەر (ﷺ) دەڵێن: بیدعەتـە و دۆعـا مەكەن، جێگەی دۆعا لای كەعبەیەو روو بكەنە كەعبە، لێرەش دەڵێن: روو مەكەنە كەعبە كە دۆعـا دەكـەن ؟! ئـەی روو بكەینـە كـوێ و چـۆن دۆعـا بكەین؟ پاشان هەندێك فەرموودەی صەحیحم بۆ باس كرد لە ئیسـتیحبابی دۆعا رووبەڕوو كەعبەی پـیرۆز، بـاش بـوو قەناعـەتی هێنـا، پاشـان باسـی پیرۆزی كەعبـەم بـۆ كـرد، گـوتم ئەوەنـدە پـیرۆزە ئێسـتا تـۆش بـە هـۆی نزیكیت و جیوارت لەم جێگـە پـیرۆزەوە ریشـت پـیرۆز بـووە ! پاشـان بـە مەبەستی تاقیكردنەوە دەستم بـرد بـۆ ریشـی و ماچێكی دەسـتی خـۆمم كرد ! ئەویش نەیگوت من پێشتر موناقەشەی نا پیرۆزی كەعبەم لـە تەكدا كردووە، ووتـی: راسـت دەكـەیت ودەسـتی كـرد بـە پێكـەنین و زۆری پـێ خۆش بوو كە مـن تەبـەرروك دەكـەم بـە ریشـیی ئـەوەوەو حـەزی دەكـرد جارێكی تریش دووبارەی بكەمەوە، منیش پێم گووت: برام: باشە مەعقولە ریشی تۆ موبارەك ببێت بە هۆی جیوار و نزیكیت لـەم جێگـە پیرۆزانـەوە، كەچی خودی كەعبەو مقامی پیرۆزی ئیبراهیم و باقی مقامەكانی تـر پـیرۆز نەبن؟ پاشان تێ فكراو سەلماندی بۆم، ئیتر ئەویش سوپاس بـۆ خـوا بـوو بە دۆسـت و رێگەیـەكی بـۆ كردمـەوەو گـوتی: بـە دڵـی خـۆت بپـاڕێرەوەو تەبەرروك بكە.. (ولله الحمد رب العالمین).

## ( بەسەرهاتی سێیەم )

لە تەك هەندێك لـە بـراو مامۆسـتایاندا لەوانـە (م. محمـد أمیـد أحمـد بەرزنجی. م. عزیز عبد الله بابان،..هتد) كە لە خزمەتیانـدابووم شـەوێكیان لە حەوشـەی مزگـەوتی پێغەمبـەر(ﷺ) لـە مەدینـەی مونـەووەرە، چـەند مـەترێك لـە نزیـك دیـواری مزگـەوتی پـیرۆزوە بەرانبـەی رەوزەی پـیرۆز كۆڕێكی یادی خودامـان بەسـت بـوو، لـە نێوەندیـدا سـەیارەیەكی پـۆلیس وەستاو بە ئوسلوبێكی نا شایستە بـە جێگـە دووان و پێـی بـڕین، و ووتـی ئەمە بیدعەتە؟! ئێمەش گوتمان برا: پێشەكی سەلام نەكردنی تۆ بیدعەت بوو، سوڕانەوەی تۆ بەو سەیارەیەو لە خزمەت پێغەمبـەری خـودادا (ﷺ) بیدعەتە، دەنگ بەرزكردنـەوەی تـۆ لـە نزیـك پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) كـە چەند مەترێكمان لـە نێواندایـە بیدعەتـە.. زۆر شـتی تـریش، پاشـان ئێمـە موعتەكیفین و یادی خودا دەكـەین، وەرن گـوێ بگـرن بـزانن چـی دەڵـێن: دەڵـێن: (یـا بـاقي أنـت البـاقي) (لا إلـه إلا الله) (صـلى الله علـى الـنبي محمـد(ﷺ) وآلـه) (لا حـول ولا قـوة إلا بـالله) كـە هـەمووی سـوووننەتی صـەحیحی لـە سـەرە، گـوتی كۆبوونەوەكـەتان بیدعەتـە، گـوتم بـرام: لـە سوونەتی صەحیحیدا هاتووە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: «ما اجتمـع قـومٌ یـذكرون الله إلاّ حفّـتهم الملائكـةُ، وتَغَشَّـتْهم الرَّحمـةُ، ونزلـت علـيهم السَّكینةُ، وذكرهم اللهُ فیمن عنده »[1] هـەروەها فـەرمویـەتی: « مـا اجتمـع قوم في مجلس فتقرقوا من غیر ذكر الله، والصلاة علی الـنبي (ﷺ) إلا كـان

---

١. رواه أحمد في مسنده بسند صحیح(٩٤/٣)برقم(١١٩١٠) عن أبي هریرة وأبي سعید الخدري(رضي الله عنهما). قال المحقق: شعیب الأرنؤوط: حدیث صحیح».

عليهم حسرة يوم القيامة»[1]. كەواتە برام: ئەم کارەی ئێمە بیدعەتەکەی لە کوێدایە؟! گوتی راستەکەن، بەڵام ئێمە بە گوێرەی قانوونی ئێرە دەڵێن: پێویستە ئێوە هەستن و بڵاوەی لێ بکەن! ئێمەش ١٢ کەس بووین هەموو شاهیدن، ووتمان مادام ئێوە بە قانوون ئێمە دەردەکەن و سەلماننتان کە لە رووی شەرعەوە بیدعەت نییە، گرنگ نییە ئێمە دەڕۆین و بڵاوەی لێ دەکەین، چونکە ئێمە سەرپێچی یاساکانتان ناکەین، با دووریش بێت لە شەرعەوە! با حیسابی ئێمەو ئێوە بکەوێتە قیامەتەوە.. شایەنی باسە (تناقض)ەیان لێرەدایە کە بەداخەوە لە هەمان کاتدا چەندین کۆڕی شیعەکان هەبوو ـ کە هەموو شتێکیان دەگووت جگە لە یادی خودا ـ کەچی هیچیان بەرانبەر بەوان نەگووت چونکە مۆڵەتی ئەوانیاندا بوو، تەنها و تەنها ئێمەیان لە یادی خودا ومەجلیسی زیکری خودا کرد کە ئەهلی سوننەتین و تا مردنیش(بعون الله تعالى وتوفيقه) تەنازول لە هیچ مەبدەئێکی ناکەین نە لە ئوصولێ و نە لە فروع و نە لە سلوك!

## چەند نمونەیەك لە بیدعەی حەسەنە لە وڵاتی حیجازدا

لە کۆتاییی ئەم فەصڵەدا جێگەی خۆیەتی نمونەی چەند بیدعەتێکی حەسەنەی وڵاتی حیجاز باس بکەین لەوانە:

١ـ نوێژنکردنەوەی و تەوسیعەی بەردەوامیان بۆ هەردوو حەرەمی مەککەو مەدینەی پیرۆز و درووستکردنی چەند قاتێك لە شەعائیرەکاندا بە

---

١. رواه ابن حبان في صحيحه (٣٥١/٢)برقم(٥٩٠) عن أبي هريرة(رضي الله عنه). قال المحقق شعيب الأرنؤوط: « حديث صحيح».

مەبەستی تەواف و سەعی و رەجم بە شێوازێکی ئاسایی و رێگە گرتن لە قەرەباڵغی.

٢ـ لە زۆربەی زۆری رێگاو بانەکانیاندا تابلۆی تایبەت هەڵواسراوە و یادی خودا وەبیر رێبوارو گەشتکاراندا دێنێتەوە وەك یادی (ألله أكبر، الحمد لله، سبحان الله..هتد) بەتایبەت ئەوەی کە بۆ خۆم هەستم پێ کردووە لە نێوان هەردوو شاری (جدة و مدينة)ی پیرۆزدا کە بێگومان شتی لەو چەشنە کاتی خۆی نەبوە بەڵام لە بیدعەتە حەسەنەکانە.

٣ـ بیدعەتی حەسەنەی حەلەقاتی دەرس و دەورو قورئان خوێندن لە هەردوو حەرەمی پیرۆزدا، بە مرجێك دەرسەکان سوننەتێکی پێغەمبەر(ﷺ) نەفەوتێنێت وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد.

٤ـ بیدعەتی حەسەنەی دابەشکردنی خواردن و خواردنەوە بە سەر حاجیەکاندا و دروستکردنی چەندین بنکەی تەندروستی بە مەبەستی رێگە گرتن لە نخۆشیەکان هەروەها ئامادەکاریەکان لە رووی ئاسایش و خزمەتگوزارییەوە بە حاجیەکانی ماڵی خودا.

کە بێگومان ئەمانەیان جێگەی دەستخۆشییە، بەڵام بیدعەتە خراپەکانیان جێگەی رەخنەی دروستکاریەو پێویستە وازی لێ بهێنن و تەرکی بکەن، چونکە ئەوان ئەمرۆ واجیهەی دونیای ئیسلامن بە هۆی دەسەڵاتیان بە سەر هەردوو حەرەمی پیرۆزدا. (والله الموفق للصواب الهادي إلى سبيل الرشاد).

## ( فەصڵی پێنجەم )

## وەهابیەکان و ڕەتکردنەوەیان بۆ زۆرێك لە سوننەتە صەحیحەکانی پێغەمبەر(ﷺ )

پێشتر روونمان کردەوە کە وەهابیـەکانی مـەوزوعی نـیین و لا دەدەن لەو مەنهەجەی کە بۆ خۆیان بە رواڵەت بانگەشـەی بـۆ دەکـەن، واتـە هـەر کات لە قازانجیان نەبوو پەیڕەوی ناکەن، لەمەش عەجایب تـر ئەوەیـە کـە سوننەت دەکەنە بیدعەت و بیدعەتیش دەکەنە سوننەت، کە لەم فەصڵەدا بە شەش باس ئەو راستایە بەرجەستە دەکەین:

### باسی یەکەم

### ( زیکری پاش نوێژەکان )

زیکری پاش نوێـژەکان وایـان گەیانـدووە لای نـەفام و هـەرزەکان کـە بیدعەتە کەچی فەرمودەی صەحیحی (ابن عباس)ی لە سەرە کە بوخـاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە بە لەفزی: «عن أبـي معبـد مـولى ابـن عبـاس أخبره أن ابن عباس(رضي الله عنهما) أخبره: أن رفع الصوت بالـذكر حـين ينصرف الناس من المكتوبة كان على عهد النبي (ﷺ) وأنه قـال قـال ابـن عباس: كنت أعلم إذا انصرفوا بذلك إذا سمعه »[1] واتـە: « بەرزکردنـەوەی دەنگ بە زیکری خودا لە سەردەمی پێغەمبەر دا (ﷺ) هـەر هـەبووە، لـە کاتێکدا کە خەڵکی لە نوێژە فەرزەکان دەبوونەوەو کۆتاییان پـێ دەهێنـا، وەختێك کە گوێم لە زیکری پاش نوێژی صەحابەکان دەبـوو دەمزانـی کـە نوێژە فەرزەکە کۆتاییی هاتووە ».

---

١. صحيح البخاري: (٢٨٨/١)برقم(٨٠٥) وصحيح مسلم: (١ / ٤١٠)برقم(٥٨٣)

## باسی دووەم
## خوێندنەوەی صەڵات و سەلام و نزای وەسیلە لە دوای بانگ و قامەت

هەروەها وایان گەیاندووە لە خەڵکێکی نەفامی نیمچە خوێندەوار کە صەڵاواتدانی پاش بانگەکان بیدعەتەو نابێت بکرێت، لە کاتێکدا فەرمودەی صەحیحی لە سەرە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی داوە بە سەر تێکڕای ئەوانەی کە گوێیان لە بانگە پێویستە پاش سەندنەوەی بانگەکە بە شێوازێك لە شێوازەکان صەڵاوات بدەن لە دیداری پێغەمبەر (ﷺ)، پاشان نزای (اللهم رب هذه الدعوة التامة..الخ) بخوێنن، وەك دەفەرموێت: «عن عبدالله بن عمرو بن العاص(رضي الله عنهما) أنه سمع النبي (ﷺ) يقول: إذا سمعتم المؤذن فقولوا مثل ما يقول، ثم صلوا علي، فإنه من صلى علي صلاة صلى الله عليه بها عشرا، ثم سلوا اللهَ لي الوسيلة، فإنها منزلة في الجنة، لا تنبغي إلا لعبد من عباد الله، وأرجو أن أكون أنا هو فمن سأل لي الوسيلة، حلّت له الشفاعة» (١).

(ثم صلوا عليَّ) واتە: پاشان صەلاَوات بدەن لە سەر من، نەیفەرمووە کێ صەڵاوات بیدات و کێ نەیدات، چۆن بیدات و چۆن نەیدات، بە دەنگی بەرز بێت یان نزم، لە نێو مزگەوتدا یان لەماڵەوە یان لە بازاڕو لە ڕێگەدا، یەك جار بێت یان زیاتر، گرنگ ئەوەیە صەڵاوات بدرێت لە نێوان پاش بانگ و پێش قامەت کردن، (کەیفییەت و کەمییەت و نەوعییەت) بۆ خودی موسڵمانان دەگەڕێتەوە، هەندێك کۆلکە خوێنەوار گوتویانە گوایە ئەو صەڵاواتە خودی بانگ وێژ ناگرێتەوە، ئەمەش جەهلە بە فیقهی ئیسلام،

---

١. صحيح مسلم (١ / ٢٨٨) برقم(٣٨٤).

ئەوەتانێ زانایانی ئیسلام تەنانەت بۆ نزاش ئەوەیان نەسەلماندووە، بۆیە بۆچوونی هەندێك لە مالیكیەكانیان هەڵوەشاندووەتەوە دەربارەی ئەوەی كە فەرمویانە ئیمام پێویست ناكات بۆ خۆی ئامین بكات دوای خوێندنی فاتیحە، چونكە خۆی نزاخوانە، نزاگۆش بۆ خۆی ئامین ناكات، بۆ چوونەكەیان رەددراوەتەوە بەوەی كە نزاخوان ئەولاترە كە ئامین بكات لە گوێگران، وەك ئیمامی نەوەوی لە (المجموع)یدا دەفەرموێت: «واحتجت المالكية بأن سنة الدعاء بآمين للسامع دون الداعي، وآخر الفاتحة دعاء فلا يؤمن الإمام، لانه داعٍ. قال القاضي أبو الطيب: هذا غلطٌ، بل إذا استحب التأمين للسامع، فالداعي أولى بالاستحباب والله اعلم » [1]

لە كاتێكدا ئەوەی كەمێك زمانەوانی عەرەبی و ئوصولی فیقهی ئیسلامیدا خوێند بێت ئەزانێت كە فەرمانی (صلّوا) بۆ هەموانە بە بانگوێژ و گوێبیست و قامەت خوێنیشەوە بە بێ جیاكاری، واتە: (ئەی موسڵمانان بەتێكڕا صەڵاوات بدەن لە سەرم)، چونكە فەرمانەكە تەحدید و تەقیید نەكراوە بە هیچ قەید و وەصفێك. بەڵام بەداخەوە موشكیلەی هەرە گەورەی ئەمڕۆ نەخوێندەواری و جەهلە، یان تەجاهول و موكابەرەی حەق.

بۆیە زانایانی ئیسلام بە عیبارەتی صەریح فەرمویانە: سوننەتە بانگ وێژ وگوێ بیستانی بانگ، هەروەها قامەتكار و گوێبیستانی قامەت، هەرچواریان صەڵاوات بدەن و سەلام بكەن و دۆعای وەسیلەو فەزیلە بخوێنن وەك لەم دەقانەدا هاتووە:

---

١. المجموع شرح المهذب للنووي: (٣ / ٣٧٤).

١ـ قـال الإمـام المحـدث خاتمـة المحققـين ابـن حجـر الهيتمـي المكـي في (تحفة المحتاج) عند شرحه لعبارة (المنهاج لشيـخ الإسـلام النـووي): « (و) يُسَنُّ (لِكُلٍّ) من المؤذن والمقيم وسامعهما (أَنْ يُصـلِّيَ) ويسـلِّم (علـى النَّبِـيِّ (ﷺ) بَعْدَ فَرَاغِه) من الأذَان، أو الإقامة للْأَمْر بالصَّلَاة عَقـبَ الْـأَذَانِ في خـبر مسلم وقِيسَ بِذَلِكَ غَيْـرُهُ (ثُـمَّ) يُسَـنُّ لـهُ أن يقُـولَ عَقِبَهُمَـا: (اللَّهُـمَّ رَبَّ هـذه الدَّعْوَة التَّامَّة..»[1].

٢ـ قال العلامـة ابـن حجـر أيضـا في كتابـه (المـنهج القـويم): « و يسـن الصلاة والسلام على النبي (ﷺ) لكل من المؤذن والمقـيم وسـامعهما بعـده وبعدها ثم يقول عقب ذلك اللهم رب هذه الدعوة..» [2].

٣ــ قـال العلامـة شـهاب الـدين أحمـد بـن أحمـد بـن سـلامة القليـوبي المتـوفى١٠٦٩هــ في حاشـيته علـى شـرح جـلال الـدين المحلـي علـى منهـاج الطالبين: « (ويستحب لكل من المؤذن وسامعه) أي: والمقيم وسـامعه، ولـو أدخله في كلامه كما مر لكـان أولى، وإن خـالف الظـاهر. قولـه: (أن يصـلي) ويسلّم كما في المنهج وغيره. (فائدة) أول حدوث (السلام) [3] المشـهور كـان

---

١. تحفة المحتاج بشرح المنهاج لشيخ الإسلام شهاب الدين أبي العباس أحمد بن محمد بـن حجـر المكي الهيتمي المتوفى ٩٧٤هـ مع تعليقات: د. محمد محمد تامر (٢٥٧/١).

٢. المنهج القويم شرح المقدمة الحضرمية للهيتمي (ص٨٥).

٣. واته: دامەزراندنی سەلام کردن لە دیداری پێغەمبەر(ﷺ) و کۆکرۆدنەوەی لە تەك صەڵاواتدانەکەدا کە دەقی لە سەرە، بەم شێوەیە: (الصلاة والسلام عليك..هتد) بە بەڵگەی قیاس لە سەر صەڵاتدان وەك پێشتر شێخی (ابن حجر) فەرمووی: « وقيس بذلك غيره».پاش ئەو مێژووە واتە لە ساڵی (٧٨١ كۆچی) یەوە تا ئەو سەردەمەی شێخ (شهاب الدين القليوبي) كە ساڵی (١٠٦٩ی كۆچی) وەفاتی كردووە، بەردەوام بووە لە مزگەوتەكاندا، واتە نزیكەی سێ سەدە ئیتیفاقی موسڵمانانی لە سەر بووەو كەس نەیگووتووە خراپەو بە كارێكی چاكیان زانییوە، پاش ئەو سەردەمەش ئەو ئیجماعە لە جیهانی ئیسلامدا هەر بەركەماڵ و بەردەوام

في مصر في عام أحد وثمانين وسبعمائة عقب عشاء ليلة الجمعة بالخصوص ثم حدث في بقية الأوقات إلا المغرب لقصر وقتها في عام أحد وتسعين وسبعمائة، أحدثه المحتسب نور الدين الطنبذي واستمر إلى الآن. ويندب أن يقول المؤذن والمقيم ومن يسمعهما بعد المغرب: اللهم هذا إقبال ليلك وإدبار نهارك وأصوات دعاتك، اللهم اغفر لي ويعكس أوله بعد الصبح، ويطلب الدعاء بين الأذان والإقامة لما ورد أنّ الدعاء بينهما لا يُرَدُّ »(١).

٤ـ قال العلامة زين الدين بن عبد العزيز المليباري الشافعي في (فتح المعين بشرح قرة العين): « (و) سُنَّ (لكل) من مؤذن ومقيم وسامعهما (أن يصلي) ويسلم (على النبي) (ﷺ) (بعد فراغهما)، أي بعد فراغ كل منهما

---

بووه تا ئەم سەردەمە دووادووايانە ئەو كەيفييەتە لە كوردستانيش هەر مابوو بە بێ نيزاع، ئێستەش لای خۆشەويستانی پێغەمبەر وسوننەتەكانی(سوپاس بۆ خودا) هەر پەيڕەو دەكرێت، كەواتە صەلات و سەلامی پاش بانگ جگە لەوەی ئەصڵەكەی سوننەتی صەحيحە ئيجماعی موسڵمانانيشی لە سەر پەيدا بووە لە كاتيی خۆيدا و چەندين سەدەش ئەو ئيجماعە بەردەوام بووە، تەنانەت ئێستا لە فەرزی مەحاڵدا ئەگەر ئيجماعێكی تر پەيدا ببێت بە نەهێشتنی ئەو كەيفييەتە، واتە صەلات و سەلامی دوای بانگ بە دەنگی بەرز ئەوا ئيجماعە كۆنەكە هەر دەمێنێتەوە، چونكە لای ئوصڵيەكان ئاشكرايە كە ئيجماع ئيجماعێكی تری پێ بەتاڵ نابێتەوە (الإجماع لا يبطل إجماعا آخر) هەروەها فەرمويانە ئەگەر ئيجماع حاصڵ بوو لە هەر چەرخێكدا پاشان ئيتر قسەی كەس ئيعتيباری نييە. (والحمد لله رب العالمين). بۆيە ئيمامی شەوكانی لە (إرشاد الفحول)دا دەفەرموێت: « لا يمكن أن يكون الناسخ للإجماع إجماعا آخر، لأن هذا الإجماع الثاني إن كان لا عن دليل فهو خطأ، وإن كان عن دليل، فذلك يستلزم أن يكون الإجماع الأول خطأ، والإجماع لا يكون خطأ، فبهذا يستحيل أن يكون الإجماع ناسخا أو منسوخا..» إرشاد الفحول إلي تحقيق الحق من علم الأصول للشوكاني بتحقيق: أحمد عزو عناية: (٢/٧٤).

١. حاشية القليوبي: على شرح المحلي على منهاج الطالبين، للعلامة شهاب الدين أحمد بن أحمد بن سلامة القليوبي المتوفى١٠٦٩هـ، تحقيق مكتب البحوث والدراسات: (١/١٥٠).

إن طال فصل بينهما، وإلا فيكفي لهما دعاء واحد. (ثم) يقول كل منهم رافعا يديه: (اللهم رب هذه الدعوة) أي الاذان والاقامة، (إلى آخره» [1].

٥ـ قال العلامة عبد الرحمن الجزري في كتابه (الفقه على المذاهب الأربعة) ما نصّه: « الصلاة على النبي (ﷺ) عقبه(أي عقب الأذان) مشروعة بلا خلافٍ، سواء كانت من المؤذّن أو من غيره، لما رواه مسلم من أن النبي (ﷺ) قال: إذا سمعتم المؤذن فقولوا مثل ما يقول ثم صلوا علي" فقوله: (ثم صلوا علي) عامٌ يشمل المؤذن وغيره من السامعين، ولم ينصّ الحديث على أن تكون الصلاةُ سرّاً، فإذا رفع المؤذّن صوته بالصلاة بتذكير الناس بهذا الحديث ليصلوا على النبي (ﷺ) كان حسنا..» [2].

٦ـ وقال العلامة الشيخ منصور علي ناصف الأزهري في كتابه النفيس (التاج الجامع للأصول) في تعليقه على ما يستحب لسامع الأذان والمؤذن قال: « الصلاة بعد الأذان سنةٌ للسَّامع والمؤذِّن، ولو برفع صوتٍ، لعموم الحديث، وعليه الشَّافعية والحنابلة» [3].

کەواتە هەندێك كە گوتویانە فەرمانی صەڵاواتەكە خودی بانگوێژ ناگرێتەوە، ئەمە قسەیەكی بێ بەڵگەیەو هیچ بنەمایەكی زانستی نییە و ئیخراجكردنی بەشێكە لە موسڵمانان لە پاداشتی فەرمانە رەهاكەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) كە دەفەرموێت: (ثم صلوا علي..)، بەم جۆرە

---

١. فتح المعين بشرح قرة العين بمهمات الدين، للشيخ زين الدين بن عبد العزيز المليباري الشافعي: (١ / ٢٨٠).

٢. الفقه على المذاهب الأربعة للعلامة عبد الرحمن الجزيري وآخرين: (١ / ٣٢٦).

٣. غاية المأمول شرح التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول: كلاهما للعلامة الشيخ منصور علي ناصف الأزهري: (١/ ١٦٧).

قسه بێ بەڵگانە دەگوترێ (ترجيح بلا مُرَجِّحْ)، كە لای زانايانی ئوصولێ بە تێكرِا وەك زانراوە بەتاڵە.

بەڵام تەرجيحەكەی زانايانی ئيسلام كە لە پێشتر نەقڵی عيبارەتی هەندێكيانمان كرد جگە لە (سياقی كەلام و عمومی ئەديللەو ئيتلاقی كەلام) جگە لەمانە بەڵگەی قياسيش دەيگرێتەوە، واتە بە قياس لە سەر فەرمودەی صەحيحی: « فقولوا آمين ». واتە هەركات ئيمام گوتی (ولا الضَّالين) ئێوەش بڵێن ئامين، كە دەفەرموێت (بڵێن) ئەم فەرمانەی پێغەمبەر(ﷺ) موتڵەقە و هەر يەك لە ئيمام و مەئمووم و مەلائيكەت دەگرێتەوە، بۆيە كەس لە زانايان نەيانگوتوە نابێت ئيمام بەشدار بێت چونكە خۆی دۆعاكانی خوێندووە، بەڵكو فەرمويانە بۆ ئيماميش (ئامين)كردن سوننەتە، ئەو فەرمودەش كە لێرەدا (مَقيسُ عليه) يە واتە: (الأصل)، لە هەردوو صەحيحی بوخاری و موسليم دا هاتووە بەم شێوەيەی لای خوارەوە:

١ـ روى البخاري في صحيحه عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله (ﷺ) قال: « إذا قال الإمامُ {غير المغضوب عليهم ولا الضالين} فقولوا آمين، فإنّه من وافق قوله قول الملائكة غفر له ما تقدم من ذنبه »[1].

٢ـ روى مسلم في صحيحه عن أبي هريرة (رضي الله عنه) بلفظ: « كان رسول الله (ﷺ) يعلِّمُنا يقول: لا تبادروا الإمام، إذا كبَّرَ فكبروا، وإذا قال: (ولا الضالين) فقولوا آمين..» [2].

---

١. صحيح البخاري (١/٢٧١)برقم(٧٤٩).

٢. صحيح مسلم (١/٣١٠)برقم(٤١٥).

فەرمودەی: (ثم صلُّوا عليّ)ی پاش بانگ (مقيس)کەیە واتە:(الفرع)، بە جاميعی ئەوەی هەردوکيان عيبادەتن، حوکمی ئەصڵەکە کە سوننەتە بە بێ نيزاع کە بريتييە لە (تأمين الإمام مع المصلين) جاری دەبێت بۆ فەرعەکە کە بريتييە لە (صلاة المؤذن مع السامعين). قياسيش لە عيباداتدا ئەگەر عيبادەتەکە سوونەت بوو وەك پێشتر رووونمان کردەوە لای زانايان دروستە. کەواتە وەك چۆن سوننەتە ئيمام بەشداربێت لە ئامين کردنی دوای خوێندنەوەی خۆی بۆ سورەتی فاتيحەی ناو نوێژ، هەرواش سوننەتە بانگوێژ و قامەتکار صلاوات بدەن لە تەك باقی موسڵمانان‌دا کە گوێ بيستی بانگ و قامەتەکە دەبن. (والله ولي التوفيق).

هەروەها جێگەی وەبيرهێنانەوەيە کە صەڵات و سەلامی داوی بانگ کە بانگوێژ دەيدات سوننەتی صەحيحەی پێغەمبەرە (ﷺ)، بەڵام لە بەر ئەوەی کە (کەيفيەت) و چۆنيەتيەکەی دياری نەکراوە، ئايا بە دەنگی بەرز بێت يان نزم، زانايان گوتويانە بە دەنگی بەرز داهێنراوێکی حەسەنەيە، واتە ئەصڵەکەی سوننەتە و چۆنيەتيەکەی داهێنراوە و لە داهێنراوە چاکەکانيشە، بێ گومان کە بە پێی مێژونوسان لەوانە (الحافظ السخاوي) و جگە لەويش کە ئەو کارە چاکە فەرمانی سوڵتان (صلاح الدين)ی ئەييوبی(رحمه الله) لە سەرە، لە سەر قەولی مەشهور، کەواتە: پاش فەرمانی (السلطان الناصر صلاح الدين الأيوبي) بە نيسبەت بانگوێژەوە بەدەنگی بەرز دەبێتە کارێکی پێويست بە پێی دەقی قورئان کە فەرمويەتی: ﴿يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ﴾ [1] ئيتر لەو سەردەمەوە ئيجماعيشی لە سەر پەيدا بووەو

١. (سورة النساء: ٥٩).

نەبوەتە کێشە، تا هاتنی وەهابیەکانی نەجد، کە راستەو خۆ دوژمنایەتی صەڵات و سەلامیان لە سەر پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد و دەیکەن لە هەموو موناسەبەیەکدا و هەرکات بۆیان بلوێت، تۆی موسڵمانیش نەکەیت بڵێت: فەرمانی (سوڵتان صلاح الدین) پێویست نییە جێبەجێ بکرێت، چونکە ئەو بۆچونە چەوتە لە بنەڕتدا پڕوپاگەندەی خاچپەرستان و دوژمنانی ئیسلام و موسڵمانانە کە نەیار بوون و نەیارن بەو سوڵتانەی کە توانی بە یارمەتی خودا (قودس) رزگار بکات لە دەستی خاچ پەرستان و زایۆنیزامی جیهانی، وەك ئاشکرایە.

رەنگە وەهابیەکانی بڵێن: کەی پێویستە گوێڕایەڵی سوڵتان صلاح الدین! ئێمەش دەڵێن: ئەو قسە یەکێك بیکات کە پێی وا نەبێت گوێڕایەڵی کاربەدەستانی ئێستای مەملەکە واجبە لە هەموو شتێکدا؟! بەڵام ئەوان ئەگەرچی بۆ بەرژەوەندی خۆشتان بێت خۆ پێیان واجبە گوێڕایەڵی دەسەڵاتدار!

مەگەر سوڵتان (صلاح الدین) بەراوورد دەکرێت لە تەك كار بەدەستانی جیهانی ئیسلامی بە کوردستانیشەوە؟ کە هەتا گەردنیان چەقیوە لە ناعەدالەتی و گەندەڵیدا (إلا ما رحم ربّي)؟! ئەگەر بۆ کاربەدەستانی ئەمڕۆ گوێڕایەڵی دروست بێت، ئەوا بۆ (السلطان الناصر صلاح الدین الأیوبي) (رحمه الله) (من باب الأولى)، شایستەتر وباشتر دروستە.. ئەگەر نا ئەمیش دەرچوونێکی ترە لە مەنهەجەکەی خۆیان کە بە رواڵەت و بەردەوام بانگەشەی دەکەن!

## صەڵات وسەلامی بانگوێژان لە دوای بانگ
## ئەصڵەکەی سوننەتەو کەیفییەتەکەی داهێنراوی حەسەنەیەو ئیجماعی زانایان و فەرمانی صلاح الدین ی ئەییوبی لەسەرە

لێرەدا بە پێویستی دەزانین هەندێت لە دەقـی زانایـانی فیقهـو مێـژوو نوسـانی ئیسـلام نـەقلّ بکـەین لـەو رووەوە کـە مەبەسـتیان لـەو داهێنانـە بەرزکردنەوەی دەنگی بانگوێژەکەیە، نەك ئەصڵی کارەکـە کـە سـوننەتە، چونکە پێشتر ئەو راستیانەمان سەلماند بە فەرمودەی صـەحیح و ووتـەی زانایانی ئیسلام.

### بۆ زیاتر دڵنیایی نەقلی هەندێك لەو عیبارەتانە دەکەین:

١ـ قال العلامة أبو عبد الله محمد بن محمـد بـن عبـد الـرحمن الحطـاب الـرعيني المـالكي المتـوفى (ت ٩٥٤هــ) في كتابـه (مواهـب الجليـل في شـرح مختصر الشيخ خليل) ما نصُّه: « قال السخاوي في (القـول البـديع): أحـدث المؤذنـون الصـلاة والسـلام علـى رسـول الله (ﷺ) عقـب الأذان للفـرائض الخمس، إلا الصبح والجمعة، فإنهم يقدمون ذلك قبل الأذان، وإلا المغرب فـلا يفعلونه لضـيق وقتهـا، وكـان ابتـداء حدوثـه في أيـام الناصـر صـلاح الـدين يوسف بن أيوب وبأمره، وذكر بعضهم أن أمر الصلاح بن أيـوب بـذلك كـان في أذان العشاء ليلة الجمعة، ثـم إن بعـض الفقـراء زعـم أنـه رأى رسـول الله (ﷺ) وأمره أن يقول للمحتسب أن يأمر المؤذنين أن يصلّوا عليه عقب كل أذان، فَسُرَّ الْمُحْتَسِبُ بهذه الرؤيـا، فـأمر بـذلك واسـتمر إلى يومنـا هـذا وقـد اختلف في ذلك، هل يستحب أو مكـروه أو بدعـة أو مشـروعٌ؟ واسـتدلَ الأولُ

بقوله(تعالى): (وَافْعَلُوا الْخَيْرَ)[1]، ومعلوم أن الصلاة والسلام من أجل القرب، وقد تواترت الأخبار على الحثّ على ذلك مع ما جاء في فضل الدعاء عقبهُ، والثلث الأخير وقرب الفجر، والصواب أنه بدعة حسنة وفاعله بحسب نيته انتهى »[2].

٢ـ قال العلامة الشيخ محمد عرفه الدسوقي المالكي (شيخ الصاوي) في (حاشيته على الشرح الكبير): « وأما الصلاة والسلام على النبي (ﷺ) بعد الأذان فبدعة حسنة، أول حدوثها زمن الناصر صلاح الدين يوسف بن أيوب سنة إحدى وثمانين وسبعمائة في ربيع الأول، وكانت أولاً تُزاد بعد العشاء ليلة الاثنين وليلة الجمعة فقط، ثم بعد عشر سنين زيدت عقب كل أذان إلا المغرب، كما أن ما يفعل ليلاً من الاستغفارات والتسابيح والتوسلات فهو بدعة حسنة، كذا ذكر بعضهم، والذي ذكره العلامة أحمد البِشْبِيشِيُّ في رسالته المسماة (بالتحفة السَّنيَّة في أجوبة الأسئلة المرضية) أن أول ما زيدت الصلاة والسلام على النبي(ﷺ) بعد كل أذان على المنارة زمن السلطان المنصور (حاجيُّ بن الأشرف شعبان بن حسين بن الناصر محمد بن المنصور قلاوون، وذلك في شعبان سنة إحدى وتسعين وسبعمائة، وكان قد حدث قبل ذلك في أيام السلطان يوسف صلاح الدين بن أيوب أن يقال قبل أذان الفجر في كل ليلة بمصر والشام: السلام على رسول الله، واستمر ذلك إلى سنة سبع وسبعين وسبعمائة فزيد فيه بأمر المحتسب صلاح الدين

---

١. تەواوی ئایەتە پیرۆزەکە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُواوَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ (سورة الحج: ٧٧).

٢. مواهب الجليل في شرح مختصر الشيخ خليل لأبي عبد الله الحطاب المالكي: (٣/٣١١).

البُرُلُّسِيُّ أن يقال: الصلاة والسلام عليك يا رسول الله، ثم جعل ذلك عقب كل أذان سنة إحدى وتسعين وسبعمائة» [1].

٣ـ قال العلامة الطحطاوي أحمد بن محمد بن إسماعيل الحنفي المتوفى ١٢٣١هـ) في (حاشيته على مراق الفلاح شرح نور الإيضاح) مانصه: « وفي الدرة المنيفة أول من أحدث أذان إثنين معاً بنو أمية، وأول ما زيدت الصلاة على النبي (ﷺ) بعد الأذان على المنارة في زمن حاجي بن الأشرف شعبان بن حسين بن محمد بن قلاوون بأمر المحتسب نجم الدين الطنيدي وذلك في شعبان سنة إحدى وتسعين وسبعمائة كذا في الأوائل للسيوطي والصواب من الأقوال أنها بدعة حسنة وكذا تسبيح المؤذنين في الثلث الأخير من الليل»[2].

٤ـ قال العلامة الشيخ أحمد بن محمد الصاوي المالكي المتوفى ١٢٤١هـ في (حاشيته على الشرح الصغير للعلامة الدردير) ما نصه: « وأما الصلاة على النبي(ﷺ) بعد الأذان فبدعة حسنة، أول حدوثها زمن الناصر يوسف بن أيوب سنة إحدى وثمانين وسبعمائة في ربيع الأول، وكانت أولا تزاد بعد أذان العشاء ليلة الاثنين وليلة الجمعة فقط، ثم بعد عشر سنين زيدت عقب كل أذان إلا المغرب، كما إن ما يُفْعَلُ ليلاً من الاستغفارات والتسابيح والتوسلات هو بدعة حسنة» [3].

٥ـ قال خاتمة المتأخرين العلامة محمد الأمين ابن عابدين الحنفي في حاشيته على الدر المختار للعلامة الحصكفي ما نصه: «فائدة: التسليم بعد

١. حاشية الدسوقي على الشرح الكبير للعلامة محمد عرفه الدسوقي تحقيق محمد عليش: (٢/٢٢٠ـ ٢٢١).

٢. حاشية على مراقي الفلاح شرح نور الإيضاح، للعلامة أحمد بن محمد بن إسماعيل الطحطاوي الحنفي المتوفى ١٢٣١هـ: (١ / ١٢٩).

٣. حاشية الصاوي على الشرح الصغير: (١/ ٤٢٣).

الاذان حدث في ربيع الآخر سنة سبعمائة وإحدى وثمانين في عشاء ليلة الاثنين، ثم يوم الجمعة، ثم بعد عشر سنين حدث في الكل إلا المغرب (ثم فيها مرتين، وهو بدعة حسنة»[1].

## باسی سێیەم
## بەستنی کۆڕی زیکرو یادی خودا ( جل جلاله )

هەروەها وایان گەیاندووە لە خەڵکێکی نەفام کە کۆبوونەوەی خواناسان بۆ مەجلیسی زیکری خودا بیدعەتە، کەچی چەندین فەرمودەی پێغەمبەری (ﷺ) لە سەر هاتووە بە دەق کە حەلقەی زیکر باخچەی بەهەشتە فەرمانی داوە بە موسڵمان لێیەوە بەهرەمەند بن لەوانە:

١ـ عن سهيل بن حنظلة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): «ما جلس قوم مجلساً يذكرون الله عز وجل فيه فيقومون حتى يقال لهم: قوموا، قد غفر الله لكم ذنوبكم، وبدلت سيئاتكم حسنات»[2].

٢ـ عن جابر بن عبد الله (رضي الله عنه) قال: خرج علينا رسول الله (ﷺ)فقال: «يا أيها الناس إن لله سراياً من الملائكة تجل الله وتقف على مجالس الذكر في الأرض فارتعوا في رياض الجنة". قالوا: وأين رياض الجنة يا رسول الله؟ قال: « مجالس الذكر، فاغدوا وروحوا في ذكر الله، واذكروه

---

١. حاشية رد المحتار لابن عابدين على الدر المختار: (١/ ٤٢٠).

٢. قال الحافظ الهيثمي: « رواه الطبراني وفيه المتوكل بن عبد الرحمن والد محمد بن أبي السري، ولم أعرفه، وبقية رجاله ثقات ». مجمع الزوائد ومنبع الفوائد. للهيثمي: (١٠/١٧ـ ١٨) برقم(١٦٧٦٧).

بأنفسكم، من كان يحب أن يعلم منزلته عند الله فلينظر كيف منزلة الله عنده، فإن الله ينزل العبد منه حيث أنزله من نفسه»[1].

٣ـ عن أنس (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال: « إن لله سيارة من الملائكة يطلبون حلق الذكر، فإذا أتوا عليهم وحفوا بهم، ثم بعثوا رائدهم إلى السماء إلى رب العزة تبارك وتعالى فيقولون: ربنا أتينا على عباد من عبادك يعظمون آلاءك، ويتلون كتابك، ويصلون على نبيك محمد (ﷺ)، ويسألونك لآخرتهم ودنياهم، فيقول تبارك وتعالى: غشوهم رحمتي، فيقولون: يا رب إن فيهم فلاناً الخطاء إنما اعتنقهم اعتناقاً! فيقول تبارك وتعالى: غشوهم رحمتي فهم الجلساء لا يشقى بهم جليسهم»[2].

٤ـ عن أبي الدرداء(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): «ليبعثن الله أقواماً يوم القيامة في وجوههم النور على منابر اللؤلؤ، يغبطهم الناس، ليسوا بأنبياء ولا شهداء». قال: فجثا أعرابي على ركبتيه فقال: يا رسول الله حلهم لنا نعرفهم. قال: هم المتحابون في الله، من قبائل شتى وبلاد شتى، يجتمعون على ذكر الله يذكرونه» [3].

---

١. قال الحافظ الهيثمي: « رواه أبو يعلى والبزار والطبراني في الأوسط، وفيه عمر بن عبد الله مولى عفرة، وقد وثقه غير واحد وضعفه جماعة، وبقية رجالهم رجال الصحيح». مجمع الزوائد ومنبع الفوائد للحافظ الهيثمي: (١٠/١٨) برقم(١٦٧٦٨). ورواه الحاكم في المستدرك (١/٦٧١)برقم(١٨٢٠) وقال: « هذا حديث صحيح الإسناد و لم يخرجاه».

٢. قال الحافظ الهيثمي: « رواه البزار من طريق زائدة بن أبي الرقاد، عن زياد النميري، وكلاهما وثق على ضعفه، فعاد هذا إسناده حسن ». مجمع الزوائد ومنبع الفوائد (١٠/١٨) برقم (١٦٧٦٩).

٣. قال الحافظ الهيثمي: « رواه الطبراني وإسناده حسن ». مجمع الزوائد ومنبع الفوائد (١٠/١٨) برقم (١٦٧٧٠).

٥ـ عن أنس بن مالك (رضي الله عنه): أن رسول الله (ﷺ) قال: « إذا مررتم برياض الجنة فارتعوا، قال: وما رياض الجنة ؟ قال: حلق الذكر »[١].

٦ـ عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنه (ﷺ) قال: « ما اجتمع قوم في مجلس فتفرقوا من غير ذكر الله والصلاة على النبي (ﷺ) إلا كان عليهم حسرة يوم القيامة»[٢].

## باسی چوارەم
## قورئان خوێندن بۆ مردوو

هەروەها بە غەڵەت وایان گەیاندووە کە قورئانخوێندن ناگاتە مردووی موسڵمانان، بە بەڵگەی « إذا مات الإنسان انقطع عنه عمله إلا من ثلاثة: إلا من صدقة جارية، أو علم ينتفع به، أو ولد صالح يدعو له »[٣]، واتە: «مرۆڤ کە مرد کردەوەکانی خۆی لێ دەپچڕێنت مەگەر لە سێ شت دا، خێرێکی نەبڕاوە، زانستێکی بە سوود، نزای منداڵێکی صاڵحی خۆی ». هەروەها بەڵگەی: «إذا مات أحدكم انقطع عمله»[٤] واتە: « هەرکەس لە ئێوە مرد کردەوەکانی خۆی لێ دەپچڕێت ». ئیتر ئەوەندە نەخوێندەوارن نازانن کە ئەو دوو فەرمودە باس لە داپچڕانی کردەوەی خودی مردووەکە دەکات لە مردووەکە، نەك کردەوەی غەیری مردووەکە بۆ مردووەکە، واتە

١. رواه الترمذي وقال هذا حديث حسن غريب من هذا الوجه من حديث ثابت عن أنس (رضي الله عنه)، قال الألباني: حسن. ينظر: سنن الترمذي (٥/٥٣٢)برقم(٣٥١٠).

٢. رواه ابن حبان في صحيحه (٢ / ٣٥١)برقم(٥٩٠) قال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح».

٣. صحيح مسلم:(٣/١٢٥٥)برقم(١٦٣١) عن أبي هريرة(رضي الله عنه).

٤. صحيح مسلم (٤/٢٠٦٥)برقم(٢٦٨٢) عن أبي هريرة(رضي الله عنه).

فەرمودەکە بەم شێوەیە: « انقطع عملُه» [1] نەك (انقطـع عمـلُ غـیره لـه)، واتە: کردەوەکـانی خـۆدی مردووەکـە دەپچـڕێت، نـەك کـردەوەی غـەیری مردووەکە کـە بـۆ مردووەکـە دەکرێـت یـان ئیهـدا دەکرێـت. کـە بێگومـان خوێندنی فاتیحەو قورئان بە گشتی بۆ مردوو لە عەمەلی مردووەکە نییە تا بپچـڕێت لێـی، بـەڵکو لـە کـردەوەی غـەیری مردووەکەیـە لـە موسـڵمانانی زیندوو، بۆیە ناپچڕێت لێی. ئەمەش بە پێی قاعیدەی مەفهومی موخالەفـە لای ئوصولیەکان.

یاخود نەیفەرمووە: (انقطع انتفاعه) وەك ابن القیم دەفەرموێت، بەڵکو فەرمویەتی (انقطع عمله) [2] ئێمەش باسی عەمەل ناکەین، باسی ئینتیفـاع و سودوەرگرتن و سەواب گەشتن دەکەین کە دەگاتـە مـردووە، وە پێشـتر لە (ابن تیمیه)و (ابن القیم)ەوە بە جـوانی ئـەم مەسـئەلەمان روونکـردەوە وگوتمان تەنانەت ئەوانیش پێیان وایە هەموو جۆرە خێرو چـاکەیەکی مـالی یان بەدەنی دەگاتە مردوو[3].

جگـە لـە زانایـانی هەرچـوار مەزهـەب بـە تایبـەتی شـافیعیەکان، بـە تایبــەتی تــر خــودی ئیمــامی شــافیعی کــە بــە هەڵــە وا مەشــهورە کــە فەرمووبێتی خوێندنی قورئان ناگاتە مردوو، یان سـوننەت نییـە خوێنـدنی

---

١. (أخرجه مسلم في صحيحه عن أبي هريرة (رضي الله عنه): أن رسول الله (ﷺ) قال: « إذا مات الإنسان انقطع عنه عمله إلا من ثلاثة إلا من صدقة جارية أو علم ينتفع به أو ولد صالح يدعو له ». صحيح مسلم (١٢٥٥/٣)برقم(١٦٣١).

٢. الروح لابن القيم: ص ١٢٩).

٣. الفتاوى الكبرى لابن تيمية بتحقيق: حسنين محمد مخلوف الفتاوى الكبرى: (٦٣،٣٨/٣). والروح المسألة السادسة عشرة لابن القيم: (ص ١١، ١١٧، ١٤٢ـ ١٤٣).

قورئان له سەر قەبران! كه سەلماندمان بـه پێچـەوانەوەیه عیبارەتـەكانی (ڕەحمەتی خوای له سەر بێت)[1].

## باسی پێنجەم
## تەڵقینی مردوو

یەكێكی تر لەو شته چاكانەی ـ كـه خـەڵكێكی نـەزان بـه سـوونەت ـ وەها نیشانی دەدەن كه بیدعەته، بەڵام له حەقیقەتـدا سـونەتە، بریتییـه له خوێندنی دۆعای تەڵقین كردنی موسڵمان پاش مردنی به تایبەت له سەر شێوازی ئەهلی شام، به نییـەتی ئاگاداركردنـەوەی موسـڵمانه مردووەكـەو ئامۆژگاریكردنی خەڵكەكەی سەر قەبران، ئەم كاره بیدعەت نییه و كارێكی سـونەته لـه ئەصـڵدا، ئەگـەر چـی شـێوازی تەڵقینـەكان یـان جـۆری ئامۆژگاریەكان له ڕواڵەتدا جودا بن به بـەراوورد لـه تـەك كـاتی سـەردەمی پێغەمبـەردا(ﷺ)، چـونكه هـەمووی دەچـێته چوارچـێوەی سـونەت وفـەرمودەی صـەحیحی لـه سـەره، ئەگـەر ئەصڵی صـورەتی تـەڵقینیش سـەنەدەكەی لاواز بێـت ئـەوا پشـتگیری هەیـه بـه چـەند فەرمودەیـەكی صەحیح و جگه له كاری موسڵمانان لـه وڵـاتی شـام و عێـراق و وڵاتـانی تری ئیسلامدا به ئیتتیفاق، فـەرمودەی لاوازیـش كـاری پێـدەكرێت بـه كـۆ دەنگی زانایان له بابی فـەزائیل وتـەرغیب وتەرهیبـدا وەك (شـیخ الإسـلام محیـي الـدین النـووي) لـه (المجمـوع)یـدا لـه بـارەی تـەڵقینی مـردووه

---

١. بڕوانه: الأم مع مختصر المزني (١/٣٢٢). والمجموع شرح المهذب للنووي: (٥/٢٩٤، ٣١١). ورياض الصالحين للإمام النووي ص ١٢١٧)برقم(٩٤٧).

فهرمويهتي: « قال جماعاتٌ من أصحابنا: يستحب تلقين الميت عقب دفنه، فيجلس عند رأسه إنسانٌ ويقول: يا فلان ابن فلان ويا عبد الله ابن أمة الله اذكر العهد الذى خرجت عليه من الدنيا: شهادة أن لا اله وحده لا شريك له وأن محمدا عبده ورسوله، وأن الجنة حق، وأن النار حقٌ، وأن البعث حقٌ، وأن الساعة آتية لاريب فيها، وأن الله يبعث من في القبور، وأنك رضيت بالله ربا، وبالاسلام دينا، وبمحمد (ﷺ) نبياً، وبالقرآن إماما، وبالكعبة قبلة، وبالمؤمنين إخوانا. زاد الشيخ نصر: ربي الله لا إله الا هو عليه توكلت، وهو رب العرش العظيم» فهذا التلقين عندهم مستحبٌ ممّن نصَّ على استحبابه: القاضي حسين والمتولي والشيخ نصر المقدسي والرافعي وغيرهم ونقله القاضي حسين عن أصحابنا مطلقا، وسئل الشيخ أبو عمرو بن الصلاح (رحمه الله) فقال: التلقين هو الذى نختاره ونعمل به، قال: وروينا فيه حديثا من حديث أبى امامة ليس إسناده بالقائم، لكن اعتضد بشواهد، وبعمل أهل الشام قديماً هذا كلام أبى عمرو. قلت: حديث ابى أمامة رواه أبو القاسم الطبراني في معجمه بإسناد ضعيف ولفظه: عن سعيد بن عبد الله الازدي قال: « شهدت أبا امامة (رضى الله عنه) وهو في النزع فقال: إذا مت فاصنعوا بى كما أمرنا رسول الله (ﷺ) فقال: «إذا مات أحد من اخوانكم فسويتم التراب على قبره، فليقم أحدكم علي رأس قبره، ثم ليقل: يا فلان ابن فلانه فانه يسمعه، ولا يجيب، ثم يقول: يا فلان ابن فلانة فانه يستوى قاعدا، ثم يقول: يا فلان ابن فلانة فانه يقول أرشدنا رحمك الله، ولكن لا تشعرون، فليقل: اذكر ما خرجت عليه من الدنيا شهادة أن لا اله الا الله وأن محمدا عبده ورسوله، وانك رضيت بالله ربا وبالاسلام دينا وبمحمد نبيا وبالقرآن اماما، فان منكرا ونكيرا يأخذ كل واحد منهما بيد صاحبه ويقول: انطلق بنا ما نقعد عند من لقن حجته، فقال رجل: يا رسول الله (ﷺ) فان

لم نعرف أمه؟ قال: فينسبه إلى امه حواء (يا فلان ابن حواء) قلت: فهذا الحديث وان كان ضعيفا فيستأنس به، وقد اتفق علماء المحدثين وغيرهم على المسامحة في أحاديث الفضائل والترغيب والترهيب وقد أعتضد بشواهد من الاحاديث كحديث: « واسألوا له الثبيت»[1] ووصية عمرو بن العاص[2] وهما صحيحان سبق بيانهما قريباً، ولم يزل أهل الشام على العمل بهذا في

---

١. رواه أبو داود بسند صحيح (٢٠٩/٣)برقم(٣٢٢٣)، وكذلك البيهقي في السنن الكبرى (٥٦/٤)برقم(٦٨٥٦). والحاكم في المستدرك وصححه (٥٢٦/١)برقم(١٣٧٢). عن عثمان (رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) قال: « إِذَا فَرَغَ مِنْ دَفْنِ الْمَيِّتِ وَقَفَ عَلَيْهِ فقال: « اسْتَغْفِرُوا لأَخِيكُمْ، وَسَلُوا لَهُ التَّثْبِيتَ، فَإِنَّهُ الآنَ يُسْأَلُ ».

٢. وەسیەتەکەی حەزرەتی عەمری کوڕی عاص (رضي الله عنه) ئیمامی موسلم لە صەحیحەکەیدا لە (ابن شَمَاسَةَ الْمَهْرِيِّ) ەوە ریوایەتی کردووە کە فەرمویەتی: « حَضَرْنَا عَمْرَو بْنَ الْعَاصِ وَهُوَ فِى سِيَاقَةِ الْمَوْتِ. فَبَكَى طَوِيلاً وَحَوَّلَ وَجْهَهُ إِلَى الْجِدَارِ فَجَعَلَ ابْنُهُ يَقُولُ يَا أَبَتَاهُ أَمَا بَشَّرَكَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِكَذَا أَمَا بَشَّرَكَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِكَذَا قَالَ فَأَقْبَلَ بِوَجْهِهِ. فَقَالَ إِنَّ أَفْضَلَ مَا نُعِدُّ شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، إِنِّى قَدْ كُنْتُ عَلَى أَطْبَاقٍ ثَلاَثٍ لَقَدْ رَأَيْتُنِى وَمَا أَحَدٌ أَشَدَّ بُغْضًا لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مِنِّي، وَلاَ أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أَكُونَ قَدِ اسْتَمْكَنْتُ مِنْهُ فَقَتَلْتُهُ فَلَوْ مُتُّ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ لَكُنْتُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَلَمَّا جَعَلَ اللَّهُ الإِسْلاَمَ فِى قَلْبِى أَتَيْتُ النَّبِىَّ (ﷺ) فَقُلْتُ ابْسُطْ يَمِينَكَ فَلأُبَايِعْكَ. فَبَسَطَ يَمِينَهُ - قَالَ - فَقَبَضْتُ يَدِي. قَالَ: « مَا لَكَ يَا عَمْرُو ». قَالَ قُلْتُ أَرَدْتُ أَنْ أَشْتَرِطَ. قَالَ « تَشْتَرِطُ بِمَاذَا ». قُلْتُ أَنْ يُغْفَرَ لِي. قَالَ « أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الإِسْلاَمَ يَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ، وَأَنَّ الْهِجْرَةَ تَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهَا، وَأَنَّ الْحَجَّ يَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ ». وَمَا كَانَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَلاَ أَجَلَّ فِي عَيْنِي مِنْهُ، وَمَا كُنْتُ أُطِيقُ أَنْ أَمْلأَ عَيْنَيَّ مِنْهُ إِجْلاَلاً لَهُ، وَلَوْ سُئِلْتُ أَنْ أَصِفَهُ مَا أَطَقْتُ لأَنِّي لَمْ أَكُنْ أَمْلأُ عَيْنَيَّ مِنْهُ، وَلَوْ مُتُّ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ لَرَجَوْتُ أَنْ أَكُونَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، ثُمَّ وَلِينَا أَشْيَاءَ مَا أَدْرِى مَا حَالِي فِيهَا، فَإِذَا أَنَا مُتُّ فَلاَ تَصْحَبْنِي نَائِحَةٌ، وَلاَ نَارٌ، فَإِذَا دَفَنْتُمُونِي فَشُنُّوا عَلَيَّ التُّرَابَ شَنًّا، ثُمَّ أَقِيمُوا حَوْلَ قَبْرِي، قَدْرَ مَا تُنْحَرُ جَزُورٌ وَيُقْسَمُ لَحْمُهَا حَتَّى أَسْتَأْنِسَ بِكُمْ وَأَنْظُرَ مَاذَا أُرَاجِعُ بِهِ رُسُلَ رَبِّي ». صحيح مسلم (١١٢/١)برقم(١٢١).

زمن من يقتدى به والي الآن، وهذا التلقين إنما هو في حق المكلف الميت، أما الصبي فلا يلقَّنُ، والله اعلم »[1].

هەروەها (ابن القيم) بە جوانی مەسئەلەی تەلقینی باس کردووە لە کاتی بەڵگە هێنانەوەی لە سەر بیستنی مردو لە قەبردا وەك دەفەرموێت: « فصلٌ: ويدل على هذا أيضا ما جرى عليه عمل الناس قديما وإلى الآن من تلقين الميت في قبره، ولولا أنه يسمع ذلك وينتفع به لم يكن فيه فائدة وكان عبثا. وقد سئل عنه الإمام أحمد (رحمه الله) فاستحسنه. واحتج عليه بالعمل. ويروى فيه حديث ضعيف ذكره الطبراني في معجمه من حديث أبي أمامة قال: قال رسول الله: إذا مات أحدكم فسويتم عليه التراب فليقم أحدكم على رأس قبره ثم يقول يا فلان ابن فلانة فإنه يسمع ولايجيب ثم ليقل يا فلان ابن فلانة الثانية فإنه يستوي قاعدا ثم ليقل يا فلان ابن فلانة يقول أرشدنا رحمك الله ولكنكم لاتسمعون فيقول أذكر ما خرجت عليه من الدنيا شهادة أن لا إله إلا الله وان محمد رسول الله وأنك رضيت بالله ربا وبالإسلام دينا وبمحمد نبيا وبالقرآن إماما فان منكرا ونكيرا يتأخر كل واحد منهما ويقول انطلق بنا ما يقعدنا عند هذا وقد لقن حجته ويكون الله ورسوله حجيجه دونهما فقال رجل يا رسول الله فإن لم يعرف أمه قال ينسبه إلى امه حواء. فهذا الحديث وإن لم يثبت فإتصال العمل به في سائر الأمصار والأعصار من غير انكار كاف في العمل به، وما أجرى الله سبحانه العادة قط بأن أمه طبقت مشارق الأرض ومغاربها وهي أكمل الأمم عقولا وأوفرها معارف تطيق على مخاطبة من لا يسمع ولا يعقل، وتستحسن ذلك، لاينكره منها منكر، بل سنَّه الأولُ للآخر، ويقتدي فيه الآخر بالأول، فلولا ان

١. المجموع شرح المهذب للنووي: (٥ / ٣٠٣-٣٠٤).

المخاطب يسمع لكان ذلك بمنزلة الخطاب للتراب والخشب والحجر والمعدوم وهذا وان استحسنه واحدٌ فالعلماء قاطبة على استقباحه واستهجانه، وقد روى أبو داود في سننه بإسناد لا بأس به أن النبي (ﷺ) حضر جنازة رجل فلما دفن قال سلوا لأخيكم التثبيت، فإنه الآن يسأل فأخبر أنه يسأل حينئذ وإذا كان يسأل فإنه يسمع التلقين. وقد صح عن النبي (ﷺ) أن الميت يسمع قرع نعالهم إذا ولوا منصرفين وذكر عبد الحق عن بعض الصالحين قال مات أخ لي فرأيته في النوم فقلت يا أخي ما كان حالك حين وضعت في قبرك قال: أتاني آت بشهاب من نار فلولا أن داعيا دعا لي لهلكت. وقال شبيب بن شيبة أوصتني أمي عند موتها فقالت يا بني إذا دفنتني فقم عند قبري وقل يا أم شبيب قولي لا إله إلا الله، فلما دفنتها قمت عند قبرها، فقلت: يا أم شبيب قولي لا إله إلا الله، ثم انصرفت، فلما كان من الليل رأيتها في النوم فقالت يا بني كدت أهلك لولا أن تداركني لا إله إلا الله فقد حفظت وصيتي يا بني[1]. وذكر ابن أبي الدنيا عن تماضر بنت سهل امرأة أيوب بن عيينة قالت رأيت سفيان بن عيينة في النوم فقال جزى الله أخي أيوب عني خيرا فإنه يزورني كثيرا وقد كان عندي اليوم فقال أيوب نعم حضرت الجبان اليوم فذهبت إلى قبره. وصح عن حماد بن سلمة عن ثابت عن شهر بن حوشب أن الصعب بن جثامة وعوف ابن مالك كانا متآخيين قال صعب لعوف أي أخي أينا مات قبل صاحبه فليتراءا له، قال أو يكون ذلك؟ قال نعم، فمات صعب فرآه عوف فيما يرى النائم كأنه قد أتاه، قال: قلت أي أخي قال نعم قلت ما فعل بكم قال غفر لنا بعد المصائب قال ورأيت لمعة سوداء في عنقه قلت أي أخي ما هذا قال عشرة دنانير استسلفتها من

---

١. الروح لابن قيم الجوزية: (ص ١٣).

فلان اليهودي فهن في قرني فأعطوه إياها وأعلم أن أى أخي انه لم يحدث في أهلي حدث بعد موتى إلا قد لحق بى خبره حتى هـرة لنـا ماتـت منـذ أيـام، واعلم أن بنتي تموت إلى ستة أيام فأستوصوا بها معروفا فلما أصبحت قلت إن في هذا لمعلما فأتيت أهلـه فقـالوا مرحبـا بعـوف أهكـذا تصـنعون بتركـة إخوانكم لم تقربنا منذ مات صعب قال فأتيت فأعتللت بما يعتـل بـه النـاس فنظرت إلى القرن فأنزلته فأنتثلت ما فيه فوجدت الصرة التي فيهـا الـدنانير فبعثت بها إلى اليهودي فقلت هل كان لك على صعب شـيء؟ قـال: رحـم الله صعباً كان من خيار أصحاب رسول الله (ﷺ) هي له قلت لتخبرني قال نعـم اسلفته عشرة دنانير فنبذتها إليه قال هي والله بأعيانها قال قلت هذه واحدة قال فقلت هل حدث فيكم حدث بعد موت صعب، قالوا نعم، حدث فينـا كـذا حدث، قال قلت: اذكروا قالوا نعم هرة ماتت منذ ايام فقلت هاتـان اثنتـان. قلت أين أبنة أخي، قالوا تلعب فأتيت بها، فمسسـتها، فـإذا هـي محمومـة، فقلت: استوصـوا بهـا معروفـا، فماتـت في سـتة أيـام. وهـذا مـن فقـه عـوف (رحمه الله). وكان من الصحابة، حيث نفـذ وصـية الصـعب بـن جثامـة بعـد موته وعلم صحة قوله بالقرائن التي أخبره بها من أن الدنانير عشرة وهي في القرن ثم سأل اليهودي فطابق قوله لما في الرؤيا فجـزم عـوف بصـحة الأمـر فأعطى اليهودي الدنانير وهـذا فقـه إنمـا يليـق بأفقـه النـاس وأعلمهـم وهـم أصحاب رسول الله صلى الله عليه وآله وسلم»[1].

---

١. الروح لابن القيم: (ص ١٤).

## باسی شەشەم
## زیادکردن لە ژمارەی ویردەکانی سوننەتدا

زۆر جـاریش دەبیسـتین هەنـدێ کـەس رایدەگـەێنن کـە بیدعەتـە زیادکردن لە ئەو ویردانەدا کە پێغەمبەر (ﷺ) داینـاوە، لـە کاتێکدا نـەك هەر کارێکی بیدعەت نییە، بەڵکو خودی سوننەتە، لە دائیرەی سوننەتدایە بە رووە گشتیەکەی، چونکە لە زۆر جێگـەدا کـە پێغەمبـەر(ﷺ) بـاس لـە پاداشتی هەندێك لەو ویرد و زیکرانە دەکات پاشان دەفەرموێت: کەس لەو کەسە پاداش زیاتر وەرناگرێت مەگەر ئەو کەسەی کە زیاتر لەو ئەندازەیـە بخوێنێت، وەك لە بوخاری و موسلیم دا هاتووە بۆ پاداشتی خوێندنی سەد جارەی نزای: (لا اله الا الله وحده لا شريك له، له الملـك، ولـه الحمـد، وهـو علي كل شئ قدير): کە ئەمە دەقەکەیەتی: « عن أبي صالح عن أبي هريرة (رضي الله عنه): أن رسول الله (ﷺ) قال: مـن قـال لا إلـه إلا الله وحـده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كـل شـيء قـدير، في يـوم مائـة مـرة، كانت له عدل عشر رقاب، وكتبت له مائة حسنة، ومحيت عنـه مائـة سيئة، وكانت له حرزا من الشيطان يومه ذلك، حتى يمسي، ولم يـأت أحـد أفضـل مما جاء به إلا أحدٌ عمل أكثر من ذلـك، ومـن قـال: سـبحان الله وبحمـده في يوم مائة مرة حُطّت خطاياه ولو كانت مثل زبد البحـر»[1]. کەواتـە کەسـێك ئەگـەر رێژەکـەی کـرد بـە سـەدو بیسـت جـار ئەمـە دیسـان سـوننەتی بـەجێهێناوەو کـارێکی خراپـی نـەکردووە بـەڵکو پاداشـتی زیاتریشـی بـۆ دەنوسرێت، ئەمەو نمونەی ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لە سەر چاکی و زیادە

١. صحيح البخاري(٣/١١٩٨)برقم(٣١١٩)(٦٠٤٠)(٦٠٤٢) وصحيح مسلم(٤/٢٠٧١)برقم(٢٦٩١).

پاداشتی ئەوانەی عیبادەتی سوننەت یان نەفلی موتلّق زیاد دەکەن بە پێی توانای خۆیان، چونکە هەر هەمووی لە دائیرەی سوننەت و عومومی بەڵگەکاندایە...

ئەم مەسئەلانەو زۆر مەسئەلەی تریش کە لێرەدا مەجالی باسکردنیان نییە، وەهابیەکان پێیان نادروست و بیدعەتە، کەچی لە حەقیقەتدا نێوجەرگەی شەریعەت و سوننەتن.

لە کاتێکدا بۆمان روون بویەوە بە دەیان نمونەی زیندوی حاشا هەڵنەگر کە تەنانەت هەر کارێکیش کە لە زەمانی پێغەمبەر(ﷺ) و خولەفای راشیدنیشدا نەکارا بێت ئەگەر چاك بوو ئەوە داهێنراوێکی چاکەو عومومی بەڵگەکان دەیانگرێتەوە، وەك ئەو نموونانەی کە باسمان کردن.

## ( فەصڵی شەشەم )

## حوکمی ئەو شتانەی کە پێغەمبەر( ﷺ ) تەرکی کردوون ئایا ئەصڵ تیایاندا حەرام بوونە یان حەڵاڵ بوون؟ توێژینەوەیەکی بابەتیانەی بەڵگەدار

بێگومان لە پێشتردا باسمان کرد کە مەرج نییە هەر شتێك پێغەمبەر (ﷺ) نەیکردبێت یان وازی لێهێنابێت یان بەجێی هێشتبێت ئیتر ئەو شتە بۆ ئوممەتەکەی دروست نەبێت بیکات، زیاتر لە شەست نمونەمان هێنایەوە لە جۆرەکانی عیبادەت کە داهێنراون و هەموو موسڵمانانیش پێی رازی بوون، کەواتە: ئەصڵ لەو شتانەدا کە پێغەمبەر(ﷺ) تەرکی کردووە ئیباحەت و دروستییە نەك حەرام بوون و قەدەغەکردن، بەم بەڵگانەی لای خوارەوە:

### ( بەڵگەی یەکەم )

قورئان دەفەرموێت: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ [1] واتە: « ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) پێی دان و فەرمانی پێی کردن ئەوا پێویستە پەیرەوی بکەن، ئەوەش کە قەدەغەی لێ کردن ئەوا پێویستە دوورکەونەوە لێیەوە» کەواتە: فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) پێویستە جێ بەجێ بکرێت ئەگەر سیاقەکە بۆ وجوب بوو، نەهی پێغەمبەریش(ﷺ) لە هەر شتێك پێویستە نەکرێت و حەرامە

١. (سورة الحشر: ٧).

سەرپێچی کردن لە فەرمان و نەهی پێغەمبەر(ﷺ)، کەواتە باسی (تەرك و وازهێنانی) تیادا نییە، واتە: ئایەتەکە و هیچ دەقێکی تریش نافەرموێت ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) نەیکردووە یان بۆ خۆی تەرکی کردووە ئەوا ئێوەش تەرکی بکەن یاخود حەرامە بیکەن!

بۆیە کارە داهێنراوە چاکەکان لەوانەش بە نمونە: ئاهەنگی مەولوودنامەی پێغەمبەر (ﷺ) هیچ دەقێك نییە لە سەر مەنع و قەدەغەکردنی نە ئایەت نە حەدیس، با حەدیسەکەش زۆر لاواز بێت، واتە دەقێکمان نییە بڵێت: (لا تفعلوا المولد!) (نهيتُكم عن عمل المولد!) (أكره إحياء ولادتي) (لا أحب أن تشتغلوا بولادتي) (لا تنفقوا يوم ولادتي أو ليلتها) (لا تصلوا علي فيها) (لا تفرحوا بميلادي) (لا تخصّصوا يوم ميلادي أو ليلته بمزيد العبادات!) (سيأتي زمان على الناس يحتفلون فيه بمولدي..الخ). یاخود صەحابەکان هیچ ریوایەتێکیان نەکردووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بفەرموون: (نهى رسول الله عن عمل المولد!) یان پێغەمبەر(ﷺ) فەرموبێتی: (كان ينهانا أن نخصّص يوم ميلاده بمزيد الطاعات) لە نمونەی ئەم دەستەواژانە هیچی وارید نەبوە بە قەتعی، خۆ ئەگەر هەبا بە زەوابیت و دارشتەکانی خۆی عەمەلی پێدەکرا[1]، بەڵام پەنا دەگرم بە خودا ئەگەر عیبارەتێك لە نزیك ئەم دەستەواژانەش هەبێت لە قورئان و سوننەت و فەرمودەی صەحابەو تابیعین و پێشەوایانی ئیسلام.

---

١. بۆ زانینی مەرج و دارشتەکانی کارکردن بە وتەی صەحابەو مەزهەبی فیقهی و تەقلیدکردنی: بنوارە کتێبی: (حكم الإفتاء بمذهب الصحابي وتقليده في الوقائع والمستجدات، دراسة أصولية فقهية، لە نوسینی دانەر: د. حسن خالد مصطفى محمود المفتي: (ص ٩ بەدواوە). کە پێشتریش بڵاوکراوەتەوە لە (مجلة البحوث والدراسات الإسلامية) المجلة العلمية المحكمة التابعة لديوان الوقف السني، بغداد العدد (٣٠) السنة ٢٠١٢م: (ص:٦٥ ـ١٦٨).

چونکە لە شتە قەدەغەلێکراوەکاندا (المنهیات) نەهێکی (صریح) یان (ضمني) هاتووە بۆیە قەدەغەکراون، بەڵکو بە پێچەوانەوە سەدان بەڵگە هەیە کە ئاماژەیە یان دەقە لە سەر دروستی مەولوودنامە، کەواتە دروستە بکرێت.

لێرەدا جێگەی خۆیەتی کە دەقێکی شێخی (ابن القیم) بهێنینەوە بۆ ئەوانەی کە شارەزای زاراوەکانی ئوصوڵی فیقهی ئیسلامی نین، بۆ ئەوەی ووشەو زاراوەکانی(واجب و سوننەت و دروستی و حەرامبوون، کەراهەت) بزانن، واتە (ألفاظ الوجوب والندب والإباحة والتحريم، والكراهة)، پاشان بەراورد بکەن و بزانن هیچ کام لە زاراوەکانی حەرام یان کەراهەت بوون هاتووە لە قورئان و سوننەتدا سەبارەت بە کاری مەولوودنامەی حەزرەت (ﷺ)؟! پاشان گرنگە ئەگەر شەرع رەو بن تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خودا و چیتر خۆشیان و موسڵمانانی سادەش گومڕا نەکەن، بۆیە گوتم (سادە) چونکە موسڵمانی تێگەشتو وپێگەشتو و شارەزاو دانیشمەند بە قسەی بیرو باقی دوژمنانی ناو و شوهرەت و شان و تاریفاتی حەزرەت (ﷺ) هەڵنەخەڵەتاون و هەرگیزیش هەڵناخەڵەتێن.
(ابن القیم) لە کتێبی (بدائع الفوائد)یدا ئەو بابەتەی روونکردووەتەوە، بۆیە دەستەواژەی ئەویش نەقڵ دەکەین چونکە دوژمنانی ویلادەتی فەخری عالەم (ﷺ) لە بەر دەمارگیریان جگە لە دەقی هەندێك لە زانایانی (متأخرين) لە (الحنابلة) هیچ دەقێکی تر وەرناگرن تەنانەت ئەگەر قورئان و سوننەتیش بێت؟!

بۆیە (شمس الدين ابن القيم) دەڵێت: « ويستفاد كون النهي للتحريم من: ١ـ ذمة لمن ارتكبه.٢ـ وتسميته عاصياً.٣ـ وترتيبه العقاب على فعله. ويستفاد الوجوب بـ: ١ـ الأمر تارة. ٢ـ وبالتصريح بالإيجاب. ٣ـ والفرض

والكتب. ٤ـ ولفظة على ٥ـ ولفظة حق على العباد وعلى المؤمنين. ٦ـ وترتيب الذم والعقاب على الترك. ٧ـ وإحباط العمل بالترك وغير ذلك. ويستفاد التحريم من: ١ـ النهي. ٢ـ والتصريح بالتحريم. ٣ـ والحظر. ٤ـ والوعيد على الفعل. ٥ـ وذم الفاعل. ٦ـ وإيجاب الكفارة بالفعل. ٧ـ وقوله: (لا ينبغي) فإنها في لغة القرآن والرسول للمنع عقلا أوشرعاً. ٨ـ ولفظة: (ما كان لهم كذا) و(لم يكن لهم). ٩ـ وترتيب الحد على الفعل. ١٠ـ ولفظة: (لا يحل) و(لا يصلح). ١١ـ ووصف الفعل بأنه فسادٌ. ١٢ـ وأنه من تزيين الشيطان وعمله ١٣ـ وإن الله لا يحبه. ١٤ـ وأنه لا يرضاه لعباده. ١٥ـ ولا يزكي فاعله. ١٦ـ ولا يكلمه. ١٧ـ ولا ينظر إليه. ونحو ذلك[1]. وتستفاد الإباحة من: ١ـ الإذن. ٢ـ والتخيير. ٣ـ والأمر بعد الحظر. ٤ـ ونفي الجناح. ٥ـ و(نفي) الحرج. ٦ـ و(نفي)الإثم. ٧ـ و(نفي)المؤاخذة. ٨ـ والإخبار بأنه معفو عنه. ٩ـ وبالإقرار على فعله في زمن الوحي. ١٠ـ وبالإنكار على من حرَّم الشيء. ١١ـ والإخبار بأنَّه خلق لنا كذا. ١٢ـ وجعله لنا. ١٣ـ وامتنانه علينا به. ١٤ـ وإخباره عن فعل من قبلنا له غير ذام لهم عليه. فإن اقترن بإخباره مدح فاعله لأجله دل على رجحانه استحباباً أو وجوباً. (فصل): الوجوب والندب: وكل فعل: ١ـ عظمه الله ورسوله(ﷺ). ٢ـ ومدحه. ٣ـ أو مدح فاعله لأجله. ٤ـ أو فرحه به. ٥ـ أو أحبَّه. ٦ـ أو أحب فاعله. ٧ـ أو رضي به. ٨ـ أو رضى عن فاعله. ٩ـ أو وصفه بالطيب. ١٠ـ أو (وصفه) البركة. ١١ـ أو (وصفه بـ) الحسن. ١٢ـ أو نصبه سببا لمحبته. ١٣ـ أو (نصبه) لثواب عاجل أو آجل. ١٤ـ أو نصبه سببا لذكره لعبده. ١٥ـ أو(نصبه سبباً) لشكره له. ١٦ـ أو (سبباً) لهدايته إياه. ١٧ـ أو (سبباً) لإرضاء فاعله. ١٨ـ أو (سببا)لمغفرة

١. (بدائع الفوائد لابن القيم بتحقيق: هشام عبد العزيز عطا وآخرين (٤/ ٨١٠ـ ٨١١).

ذنبه. ١٩ـ (أو سببا لـ)تكفير سيئاته. ٢٠ـ أو(سببا) لقبوله. ٢١ـ أو(سببا) لنصرة فاعله. ٢٢ـ أو بشارة فاعله بالطيب. ٢٣ـ أو وصف الفعل بكونه معروفاً. ٢٤ـ أو نفي الحزن والخوف عن فاعله. ٢٥ـ أو وعده بالأمن. ٢٦ـ أو نصبه سبباً لولايته. ٢٧ـ أو أخبر عن دُعاء الرُّسل بحصوله. ٢٨ـ أو وصفه بكونه قربة. ٢٩ـ أو أقسم به. ٣٠ـ أو(أقسم) بفاعله كالقسم بخيل المجاهدين وإغارتها. ٣١ـ أو ضحك الرب (جل جلاله) من فاعله. ٣٢ـ أو عجبه به فهو دليل على مشروعيته المشتركة بين الوجوب والندب. فصل: استنباط التحريم من القرآن الكريم: وكل فعل: ١ـ طلب الشارع تركه. ٢ـ أو ذم فاعله. ٣ـ أو عتب عليه. ٤ـ أو لعنه. ٥ـ أو مقته. ٦ـ أو مقت فاعله. ٧ـ أو نفي محبته إياه. ٨ـ أو محبة فاعله. ٩ـ أو نفي الرضى به. ١٠ـ أو (نفي) الرضاء عن فاعله. ١١ـ أو شبه فاعله بالبهائم. ١٢ـ أو (شبه فاعله) بالشياطين. ١٣ـ أو جعله مانعاً من الهدى. ١٤ـ أو (مانعاً) من القبول. ١٥ـ أو وصفه بسوء كراهة. ١٦ـ أو استعاذ الأنبياء منه. ١٧ـ أو أبغضوه. ١٨ـ أو جعل سببا لنفي الصلاح لعذاب عاجل أو آجل. ١٩ـ أو(جعل سبباً) لذم. ٢٠ـ أو (جعل سبباً لـ) لوم. ٢١ـ أو (جعل سبباً) لضلالةٍ. ٢٢ـ أو (جعل سبباً لـ) معصيةٍ. ٢٣ـ أو وصف بخبث[1]. ٢٤ـ أو (وصف بـ)رجس. ٢٥ـ أو (وصف بـ) نجسٍ. ٢٦ـ أو بكونه فسقاً. ٢٧ـ أو (بكونه)إثما. ٢٨ـ أو (بكونه) سبباً لإثم. ٢٩ـ أو (سبباً لـ) رجسٍ. ٣٠ـ أو (سبباً لـ) لعن. ٣١ـ أو (سبباً لـ) غضب. ٣٢ـ أو (سبباً لـ) زوال نعمة. ٣٣ـ أو (سبباً لـ)حلول نقمةٍ. ٣٤ـ أو (سببا لـ)حدّ من الحدود. ٣٥ـ أو (سبباً لـ) قسوةٍ. ٣٦ـ أو (سبباً لـ) خزيٍ. ٣٧ـ أو (سبباً لـ) ارتهان نفسٍ. ٣٨ـ أو (سبباً) لعداوة الله. ٣٩ـ أو (سبباً)

١. (بدائع الفوائد لابن القيم (٤ / ٨١١).

لمحاربته. ٤٠ـ أو (سببا) للاستهزاء به وسخريته. ٤١ـ أو جعلـه الـرَّب سـبباً لنسيانه لفاعله. ٤٢ـ أو وصف نفسه بالصبر عليه. ٤٣ـ أو (وصـف نفسـه) بالحلم والصفح عنه. ٤٤ـ أو دعا إلى التوبة منه. ٤٥ـ أو وصف فاعله بخبث. ٤٦ـ أو (وصف فاعله بـ) احتقار. ٤٧ـ أو نسبة إلى عمل الشـيطان وتزيينـه. ٤٨ـ أو تولّى الشَّيطان لفاعله. ٤٩ـ أو وصفه بصفة ذم. مثل كونـه ظلمـا أو بغيا أو عدوانا أو إثماً. ٥٠ـ أو تبَّرأ الأنبياءُ منه. ٥١ـ أو فاعلـه أو شـكوا إلى الله من فاعله. ٥٢ـ أو جـاهروا فاعلـه بالعـداوة. ٥٣ـ أو نصـب سـبباً لخيبـة فاعله عاجلاً او آجلاً. ٥٤ـ أو ترتَّب عليه حرمان الجنة. ٥٥ـ أو وصف فاعلـه بأنه عدو لله وان الله عدوه. ٥٦ـ أو أعلم فاعله بحرب من الله ورسوله(ﷺ). ٥٧ـ أو حمل فاعله إثم غيره. ٥٨ـ أو قيل فيه: (لا ينبغي هذا) و(لا يصلح). ٥٩ـ أو أمر بالتقوى عند السؤال عنه. ٦٠ـ أو أمر بفعل يضاده. ٦١ـ أو هجر فاعله. ٦٢ـ أو تلاعن فـاعلوه في الآخـرة وتـبرأ بعضـهم مـن بعـض. ٦٣ـ أو وصـــف فاعلـــه بالضـــلالة. ٦٤ـــ أو أنـــه لـــيس مـــن الله في شـــيء مـــن الرسولوأصحابه(ﷺ). ٦٥ـ أو قرن بمحرم ظـاهر التحـريم في الحكـم والخـبر عنهما بخبر واحد. ٦٦ـ أو جعل اجتنابه سـببا للفـلاح. ٦٧ـ أو فعلـه سـببا لإيقاع العـداوة والبغضـاء بـين المسـلمين. ٦٨ـ أو قيـل لفاعلـه: (هـل أنـت منته؟). ٦٩ـ أو نهى الأنبياء عن الدعاء لفاعلـه. ٧٠ـ أو رتَّـب عليـه إبعـاداً وطرداً. ٧١ـ أو لفظة قتل من فعله. ٧٢ـ أو قاتل الله من فعله. ٧٣ـ أو أخـبر أن فاعله لا يكلمه الله يوم القيامة ولا ينظر إليه ولا يزكيه. ٧٤ـ (أو أخبر)أن الله لا يصلح عمله. ٧٥ـ أو (أن الله) لا يهدي كيده. ٧٦ـ وإن فاعله لا يفلـح. ٧٧ـ ولا يكون يوم القيامة من الشهداء ولا من الشفعاء. ٧٨ـ أو أن الله يغـار من فعله. ٧٩ـ أو (يغار) منه على وجه المفسدة فيـه. ٨٠ـ أو أخـبر أنـه لا يقبل من فاعله صرفاً ولا عدلاً. ٨١ـ أو أخبر أنّ من فعله قيّض لـه شـيطان

فهو له قرين. ٨٢ـ أو جعل الفعل سببا لإزاغة الله قلب فاعله. ٨٣ـ أو (سبباً لـ)صرفه عن آياته وفهم كلامه. ٨٤ـ أو سؤال الله تعالى عن علة الفعل: (لم فعل) نحو: (لم تصدون عن سبيل الله) (لم تلبسون الحق بالباطل) (ما منعك أن تسجد) (لم تقولون ما لا تفعلون) ما لم يقترن به جواب من المسؤول، فإن اقترن به جواب كان بحسب جوابه. فهذا ونحوه يدل على المنع من الفعل، ودلالته على التحريم أطرد من دلالته على مجرد الكراهة[1]. وأما لفظة: (يكرهه الله تعالى ورسوله(ﷺ). أو (مكروه) فأكثرُ ما تستعمل في المحرَّم، وقد يستعمل في كراهة التنزيه. وأما لفظة: (أما أنا فلا أفعل)، فالمتحقق (أنها) من الكراهة كقوله: (أما أنا فلا آكل متكئاً). وأما لفظه: (ما يكون لك) و(ما يكون لنا) فاطرد استعمالها في المحرم نحو: (ما يكون لك أن تتكبر فيها)، و(ما يكون لنا أن نعود فيها) (ما يكون لي أن أقول ما ليس لي بحق). فصل كيفية استفادة الإباحة: وتستفاد الإباحة من: ١ـ لفظ الإحلال. ٢ـ ورفع الجناح. ٣ـ والإذن. ٤ـ والعفو. ٥ـ وإن شئت فافعل. ٦ـ وإن شئت فلا تفعل. ٧ـ ومن الامتنان بما في الأعيان من المنافع. ٨ـ وما يتعلق بها من الأفعال. نحو: (من أصوافها وأوبارها واشعارها أثاثاً). ونحو: (وبالنجم هم يهتدون) ٩ـ ومن السّكوت عن التحريم. ١٠ـ ومن الإقرار على الفعل في زمن الوحي. وهو نوعان: إقرار الرب تبارك وتعالى وإقرار رسوله إذا علم الفعل فمن إقرار الرب تعالى قول جابر كنا نعزل والقرآن ينزل (رواه البخاري ومسلم وأبو داود والترمذي). ومن إقرار رسوله قول حسّان لعمر: كنت أنشد وفيه من هو خير منك»[2].

١. (بدائع الفوائد لابن القيم (٤ / ٨١٢).

٢. بدائع الفوائد لابن القيم: (٤ / ٨١٣).

## ( بەڵگەی دووەم )

هەرشتێك خوای گەورە حەرامی كردبێت لە قورئانی پیرۆزدا بە تەفصیل باسی فەرمووە، وەك دەفەرموێت لە دەقی پیرۆزی: (وَقَدْ فَصَّلَ لَكُمْ مَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ) لە ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَمَا لَكُمْ أَلاَّ تَأْكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُمْ مَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلاَّ مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ وَإِنَّ كَثِيرًا لَيُضِلُّونَ بِأَهْوَائِهِمْ بِغَيْرِ عِلْمٍ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِالْمُعْتَدِينَ﴾[1] دا بە راشكاوی خودا باسی فەرمووە، واتە: « هەر شتێك حەراممان كردبێت لە قورئاندا بە روونی باسمان كردووە، بەڵام زۆر كەس هەن بە بێ زانیاری و بەڵگە خەڵكی بە گومڕایی دا دەبەن، بەڵكو تەنها لە هەواو ئارەزووبازی خۆیانەوە بەدەم خوداو پێغەمبەرەوە (ﷺ) درۆ دەكەن و حەڵاڵ حەرام دەكەن، لە كاتێكدا حەرامكراوەكانمان بە تەفصیل بەیان كردووە، بۆیە سزای توند چاوەڕوانی ئەو دەست درێژكارانە دەكات لە سەر شەریعەتی ئیسلام».

بەڵی ئەصڵی ئایەتەكە بۆ هەموو جۆرە خواردنێكە كە خودا بە دەقێك حەرامی نەكردبێت وەك (مردارەوە بوو، یان گۆشتی بەراز) بەڵام زانایان لەم دەقەوە قاعیدەی (الأصل في الأشياء الإباحة)یان دامەزراندووە وگوتویشیانە: (العبرة بعموم اللفظ لا بخصوص السبب) وەك بە درێژی باسمان كردووە باسی دەكەین.

١. (سورة الأنعام: ١١٩).

## لێرەدا پێمان باشە ئەو حەقیقەتە
## لای زانایانی تەفسیریش بەیان بکەین:

پێشەوا (القاضي البيضـاوي) لـە تەفسـیرەکەیدا دەفـەرموێت: « وقـد فصَّل لكم ما حرم عليكم مما لم يحرم ». واتە: « خودا بە روونـی و دیـاری کـراوی باسـی ئـەو شـتانەی کـردووە کـە حـەرامی کـردوون و جیـای کردووەنەتەوە لەو شتانەی کە حەڵاڵی کردووە بۆ موسڵمانان » [1].

پێشەوا (ابن كثیر)یش دەڵێت: « {وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُمْ مَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ} أي قـد بيَّن لكم مـا حـرَّم علـيكم ووضحه» [2]. واتە: «خوای گەورە روونی کردووەتەوە و ئاشـکرای کـردووە هەموو ئەو شـتانەی کـە حـەرامی کـردووە لـە سـەرتان» واتـە ئـەوەی کـە حەرامی نەکردووە بە دەقێك ئەوا حەڵاڵەو حوکمەکەی درووستییە.

تەنانەت (ابن تيمية)یش لـە(مجمـوع الفتـاوى): یـدا لـە تەفسـیری ئـەو ئایەتە پیرۆزدە ئەو حەقیقەتەی دووپات کردووە تەوە لە دوو جێگەدا وەك دەڵێت: «التفصيل التبيين، فبيّن أنه (تعالى) بـيّن المحرمـات، فمـا لم يبـيّن تحريمُه فليس بمحـرَّم، ومـا لـيس بمحـرَّم فهـو حـلالٌ، إذ لـيس إلا حـلال أو حرام». واتە: « تەفصیل بریتییە لە روونکردنـەوە، خـوای گـەورە تێکـڕای حـەرامکراوەکانی روونکردووەتـەوە، کەواتـە ئـەو شـتانەی کـە بـە روونـی حەرام نەکراون، بە هیچ جۆرێك حـەرام نـین، ئـەو شـتانەش حـەرام نـەبن کەواتە حـەڵاڵن، چـونکە شـتەکان تـەنها دوو جـۆرن: یـان حـەڵاڵ، یـاخود

---

١. تفسير البيضاوي (أنوار التنزيل):(٢ / ٤٤٧).

٢. تفسير ابن كثير:(٢ / ٢٠٦).

حەرام»[1]. پاشان لە راڤەی فەرمودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێت: « قوله: (وما سكت عنهُ فهو ممَّا عفا عنه) نصٌ في أنَّ ما سكت عنـه فـلا إثـم عليـه، وتسـميته هـذا عفـواً كأنَّـه ـ والله أعلـم ـ لأن التحليـل هـو الإذن في التَّنـاول بخطابٍ خاصٍ، والتحريم المنعُ من التنـاول كـذلك، والسـكوت عنـه لم يـؤذن بخطاب يخُصُّه، ولم يمنع منه، فيرجع إلى الأصل، وهـو أن لا عقـاب إلا بعـد الإرسال، وإذا لم يكن فيـه عقـابٌ لم يكـن محرمـاً ». واتـە: « فـەرموودەی: (ئەو شتانەی خودا بێ دەنگ بـووە لـە بەرانبـەریان، ئـەوا حـوكم دەدرێـن بەوەی عەفوویان لـێ دراوە) ئـەم فەرموودەیـە دەقێكـی تـەواوە لـە سـەر ئەوەی كە هەرشتێك دەقێكی راستەوخۆی لە سەر نەبێت ئەنجامـدانی ئـەو شتە گوناهی تیادا نییە،وەختێك لە زاراوەی سوننەتدا بە عـەفوو لێبـوردن ناوبراوە (والله أعلم) لە بـەر ئەوەیـە كـە لـە ئەصـڵی خۆیـدا حـەڵاڵ كـردن بریتییە لە ئیزن و مۆڵەتی درووسـتی ئەنجامـدانی بـە خیتـاب و لێـدوانێكی راسـتەخۆی تایبـەت، هـەروەها تـەحریم و حـەرامكردنیش بریتییـە لـە قەدەغەردنی ئەنجامدانی شـتە حەرامـە بـە خیتـاب ودەقێكـی راسـتەخۆی تایبەت، حەرامكردنیش بریتییە لە مەنع وقەدەغەكردن بە دەق وخیتابێكی راستەوخۆ، بێدەنگ بوونیش لێیـەوە بـە خیتـابێكی راسـتەوخۆ نـە ئیزنـی پێدراوە نە قەدەغەو مەنعیش كراوە، كەواتە حوكمەكـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ ئەصلێ، كە حەڵاڵ بوونە، چونكە ئەصڵیش لە شتەكاندا ئەوەیە كە عیقـاب و سـزادان نییـە مەگـەر پـاش رەوانـەكردنی پێغەمبـەران(علـیهم الصـلاة والسلام)، ئاشكرایە پاش رەوانەكردنیشـیان لـەو شـتانەدا باسـی عیقـاب و

---

١. (مجموع الفتاوى لابن تيمية بتحقيق أنور الباز وعامر الجرار: ٢١/٥٣٦).

تۆڵە نەکراوە، کەواتە ئو شتانە نابنە حەرام و لە سەر ئەصڵی حەڵاڵ بوون دەمێننەوە »[1].

هەروەها (ابن القیم) وەك پێشتر نەقڵمان کرد هەمان بۆچوونی هەیە کە بێدەنگی نیشانەی رەزامەندیە، چونکە (السکوت عن التحریم)ی واتە: (بێدەنگ بوون لە بە حرامکردن بە دەقێکی تایبەت) بە یەکێك لە جۆر و لەفزەکانی ئیباحەو درووستی هەژمارکردووە، وەك دەڵێت: « وتستفاد الإباحة من: لفظ الإحلال. ورفع الجناح. والإذن. والعفو. وإن شئت فافعل. وإن شئت فلا تفعل. من الامتنان بما في الأعيان من المنافع. وما يتعلق بها من الأفعال. نحو: (من أصوافها وأوبارها واشعارها أثاثاً). ونحو: (وبالنجم هم يهتدون). ومن السَّكوت عن التحريم. ومن الإقرار على الفعل في زمن الوحي..» [2].

شێخ (زکریا بن غلام قادر الباکستاني) لە کتێبی (أصول الفقه على منهج أهل الحديث للباكستاني): پاش نەقڵی عیبارەتەکانی پێشووی (ابن تيمية) و تەئید کردنیان، پشت راستی ئەو مەسئەلەیەی کردووەتەوەو دەڵێت: « قلتُ: وعلى هذا جرى فهم الصحابة، فقد ذهب عمر بن الخطاب(رضي الله عنه) إلى جواز أكل الضب، واستدل على ذلك بأن النبي

١. (مجموع الفتاوى): (٢١/٥٣٦).
٢. بدائع الفوائد لابن القيم: (٤ / ٨١٣).

(ﷺ) لم يحرمه كما عند مسلم[1]، والألفاظ التي وردت في الشرع تدل على إباحة تلك الأشياء ذكرها ابن القيم في (بدائع الفوائد)..» [2].

پێویستیشه بزانین كه تەنانەت ئەو شتانەش كە قورئان حەرامی كردوون لە هەندێ كاتدا بە (استثناء) دروستە بۆ ئینسان و بۆی حەڵاڵ دەبێت ئەنجامیان بدات، كە ناسراوە بە زەرورەتی شەرعی: (الضرورة الشرعية)، بۆیە قورئان لە تەك حەرام كردنی حەرامكراوەكاندا باسی حاڵەتە زەروریەكانیش دەكات بە (استثناء) لە عمومی حەرامكراوەكان، كەواتە لە جێیەك حەرامكراوەكانیش لە هەندێ حاڵەتی تایبەتدا دروست بێت ئەنجام بدرێن وەك خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو لە كاتی برسییەتییەكی زۆردا، ئەی ئەبێ چۆن ئەو شتانەی كە شەریعەت لە حوكمەكەی بێ دەنگ بووە چۆن درووست نەبێت و بە چ بەڵگەیەك حەرام بكرێن؟!

بۆ دەرخستنی ئەو راستیانەو باسكردنی حاڵەتەكان كە تیایدا (استثناء) هاتوونەتە كردن بە باشی دەزانین نەقڵی دەقێكی گونجاوی شێخی (الشنقيطي) بكەین لە تەفیسرەكەیدا كە دەفەرموێت: « وقد استثنى الله (جل جلاله)، حالة الاضطرار في خمس آيات من كتابه، ذكر فيها المحرمات الأربع التي هي من أغلظ المحرمات، تحريما وهي الميتة والدم ولحم الخنزير وما أهل لغير الله به، فإن الله تعالى كلما ذكر تحريمها استثنى

---

١. روى مسلم في صحيحه عن عبدالله بن دينار أنه سمع ابن عمر(رضي الله عنهما) يقول: سئل النبي (ﷺ) عن الضب ؟ فقال « لست بآكله ولا محرمه » صحيح مسلم: (١٥٤١/٣)برقم(١٩٤٣).

٢. أصول الفقه على منهج أهل الحديث للباكستاني: (ص١١٧). وأصول الفقه على منهج أهل الحديث (ص١١٦).

منها حالة الضرورة، فأخرجها من حكم التحريم. قال تعالى في سورة الأنعام: {قُلْ لا أَجِدُ فِي مَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّماً عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلَّا أَنْ يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَماً مَسْفُوحاً أَوْ لَحْمَ خِنْزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقاً أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَحِيمٌ}[1]. وقال في الأنعام أيضا: {وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُمْ مَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ}[2] وقال تعالى في النحل: {إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلا عَادٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ}[3] وقال تعالى في البقرة: {إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلا عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ}[4] وقال تعالى في المائدة: {حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ} إلى قوله: {فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِإِثْمٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ}[5].

---

١. (سورة الأنعام:١٤٥)
٢. (سورة الأنعام:١١٩).
٣. (سورة النحل:١١٥).
٤. (سورة البقرة:١٧٣).
٥. (سورة المائدة:٣). أضواء البيان للشنقيطي: (٧ / ٣٥٦).

## ( بەڵگەی سێ یەم )

لە قورئانی پیرۆزدا هەموو شتێکی پاك و خاوێن و چاك کە زەرەری نەبێت، خودا بۆ ئادەمیزاد حەڵاڵی کردووە، هەموو شتێکی پیسیشی حەرام کردووە، چونکە مرۆڤ لێیەوە زەرەرمەند دەبێت، ئەمەش لە ئایەتە پیرۆزەکانی: ﴿يَسْأَلُونَكَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَمَا عَلَّمْتُمْ مِنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللَّهُ فَكُلُوا مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ * الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ﴾[1].

پێشەوا (ابن كثير) لە راڤەی ئایەتەکەدا فەرمویەتی: « لما ذكر تعالى ما حرمه في الآية المتقدمة من الخبائث الضارة لمتناولها، إما في بدنه أو في دينه أو فيهما، واستثنى ما استثناه في حالة الضرورة، كما قال تعالى: {وَقَدْ فَصَّلَ لَكُمْ مَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ} قال بعدها: {يَسْأَلُونَكَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ} كما في سورة الأعراف في صفة (النبي)محمد (ﷺ) أنه يحل لهم الطيبات، ويحرم عليهم الخبائث، قال ابن أبي حاتم: حدثنا أبو زرعة، حدثنا يحيى بن عبد الله بن أبي بكير، حدثني عبد الله بن لهيعة، حدثني عطاء بن دينار عن سعيد بن جبير، عن عدي بن حاتم وزيد بن مهلهل الطائيين، سألا رسول الله (ﷺ) فقالا: يا رسول الله قد حرم الله الميتة، فماذا يحل لنا منها ؟ فنزلت {يَسْأَلُونَكَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ} قال سعيد: يعني الذبائح الحلال الطيبة

---

١. (سورة المائدة: ٤، ٥).

لهم. وقال مقاتل: الطيبات ما أحل لهم من كل شيء أن يصيبوه وهو الحلال من الرزق »[1].

**نا نخواردن و شیرینی دابەشکردن لە بۆنە ئیسلامیەکاندا بە تایبەت ئاهەنگی مەولوود لە کارە هەرە پیرۆز و حەڵاڵەکانە لە ئیسلامدا.. توێژینەوەیەکی زانستی شەرعی لەو رووەوە**

کەواتە بەنمونە: ئەگەر خوانەخواست ئاهەنگی مەولوودنامەو میعراج نامەو هیجرەت و شەوی قەدرو..هتد خواردن و خواردنەوەی حەڵاڵ و بەخشینی شیرینی تیایاندا حەرام بوایە بە دەقێکی راستەوخۆ خودا یان پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئاماژەی بۆ دەکردن، چونکە قورئان بە پێی ئەو دەقانەی کە رابووردن هەموو شتە حەرامەکانی بە تەفصیلی باس فەرمووە، کەواتە ئەوەی کە ماوەتەوە هەمووی حەڵاڵ و دروستە خواردن و خواردنەوەی.

ئایا ئەوانەی کە لە خودا ناترسن و بە ئارەزووی نەفس و شەیتان حەڵاڵ حەرام دەکەن ئەبێ چۆن وەڵامی خودا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بدەنەوە لە رۆژی قیامەتدا، کە دەڵێن: شیرینی بەخشینەوە لە ئاهەنگی خۆشی دەربڕین لە بەرانبەر نیعمەتی ویلادەتی فەخری کائینات(ﷺ) حەرامە ؟! بێگومان نمونەی ئەو جۆرە کەسانە قورئان بە موفتەری و درۆزن وەصفی کردوون، قورئان ئەفەرموێت: ﴿قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ * قُلْ أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ لَكُمْ مِنْ رِزْقٍ فَجَعَلْتُمْ مِنْهُ حَرَامًا وَحَلَالًا قُلْ آللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى اللَّهِ تَفْتَرُونَ * وَمَا ظَنُّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ

١. تفسير القرآن العظيم لابن كثير: (٢ / ٢١).

وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ * وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُو مِنْهُ مِنْ قُرْآنٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ وَمَا يَعْزُبُ عَنْ رَبِّكَ مِنْ مِثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَلَا أَصْغَرَ مِنْ ذَلِكَ وَلَا أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾ (1)

ئەگەر بە وردی بنوارینە ئەم چوار ئایەتەی سەرەوە بە تەواوەتی شایستەیی و رەزامەندی خودامان بۆ روونده‌بێتەوە لە کاری مەولوودنامە بە هەموو برگەکانیەوە، و غەزەبی خوداشمان بۆ ئاشکرا دەبێت لە قەدەغەکارانی ئەو کارە چاکە، چونکە قورئان تیایدا فەرمانی داوە بە موسڵمانان کە کەیف خۆش بن و خۆشحاڵی خۆیان دەربڕن لە بەرانبەر رەحمەتی خودا، کە بێگومان پێغەمبەرەکەی(ﷺ) لە گەورەترینی رەحمەتەکانی خودایە، بۆیە ئاهەنگ گێڕان و خۆشحاڵی دەربڕین، و شت بەخشینەوە و ئیحسان کردن تێکڕای شوکرانە بژێری کردنی خودایە لە بەرانبەر ئەو رەحمەت گەورەیەی خودا، کە تائێرە ئایەتی یەکەم: (قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ) ئاهەنگگێڕان دەیانگرێتەوە، لە بەرانبەر ئەماندا تاقمێکی سەرگەردان لە رۆژانی لە دایك بوونی ئەو نیعمەت و فەزڵە گەورەی خودادا (ﷺ) دادەگیرێن و ناخۆشحاڵن بە رحمەتی خودا و لە دایك بوونی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) ! بۆیە هەر کە باسی تاریفات و وەصف و سەناخوانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکرێت و ئاهەنگی مەولوودنامە دەخوێنرێتەوە و شیرینی وخۆشی دەردەبڕدرێت لە تاو نارەحەتیان وەختە لە ناخەوە بتەقن، بۆیە لە پێناو

---

١. (سورة يونس: ٥٨ — ٦١).

کوژاندنـەوەی ئـەو نـوورو ڕۆشـنایەدا کـە هـەرگیز ناشـتوانن[1]. فـەتوای نادرووسـت دەدەن و کـاری مەولودنامـە کـە حەڵاڵـەو هـیچ دەقێکـی قەدەغەکردنی لە سەر نییە ئەوان حەرامی دەکەن و بەو هۆیەشەوە ئیفتیرا بە دەم خوداوە دەکـەن، کـە ئایـەتی دووەم و سـەرەتای ئایـەتی سێیەم: (قُلْ أَرَأَيْتُم مَا أَنْزَلَ اللَّهُ لَكُمْ مِنْ رِزْقٍ فَجَعَلْتُمْ مِنْهُ حَرَامًا وَحَلَالًا قُلْ آللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى اللَّهِ تَفْتَرُونَ * وَمَا ظَنُّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) ئـەو تاقمـە دەگرێتـەوە، پاشـان کۆتـایی ئایـەتی سـێیەم دەیانگرێتەوە کە دەفەرموێت: (إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ) چونکە فەزڵی خودا زۆرە بە سەریانەوە لەو فەزڵانەش لـەدایك بوون و نـاردنی پێغەمبـەری ئـەخێر زەمانـە(ﷺ)، بـەڵام ئـەوان شـوکرانە بژێری ئەو ڕەحمەتە نین و بە نیعمەتی هەژمار ناکـەن، بـەڵکو ڕێگـری لـە موسڵمانانیش دەکـەن کـە شـوکرانە بـژێر بـن، ئایـەتی چـوارەمیش: (وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُو مِنْهُ مِنْ قُرْآنٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ

---

١. چونکە پێغەمبەر(ﷺ) نووری خودایە بە ئایەتی پیرۆزی: ﴿قَدْ جَاءَكُمْ مِنَ اللَّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُبِينٌ﴾(سورة المائدة: ١٥) نـوری خـوداش بـە کـەس ناکوژێتـەوە وەك قورئـان دەفـەرموێت: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُوَ يُدْعَى إِلَى الْإِسْلَامِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ*يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ*هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾(سورة الصف:٧ – ٩). ئەمـەش ئـەوە ناگـەێنێت کـە ئێمـە حـوکمی تـەکفیری هـیچ کـەس بـدەین بـە ئەنجامنـەدانی مەولوودنامە، (حاشا وکلا)، بەڵام مەبەستمان ترسناکی عاقیبەتی هەموو هەوڵێکە کـە بـدرێت لە پێناو لەکەدارکرد یان کەم بایەخدان بە پێغەمبەر یان هەوڵی کەمکردنەوە لـە کەسـایەتی و مەزنی ئەو سەروەرە(ﷺ)، کە ئاشکرایە بە بیدعەت زانینی ئاهـەنگی مـەولود وپێکهاتـەکانی لەو چوارچێوەدایە، بزانن پێی یان نا، کە پێویستە بە ئاگـا بێنـەوەو چـیتر بـە نـاوی دینـەوە فەتوای چەوتی بێ بنەما و ژەهراوی نەدەن!

شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ وَمَا يَعْزُبُ عَنْ رَبِّكَ مِنْ مِثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَلَا أَصْغَرَ مِنْ ذَلِكَ وَلَا أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ) مژدەو بیشارەتە بۆ موسڵمانان کە ئاهەنگی مەولوودنامە دەگێڕن و تیایدا قورئان دەخوێنن و کاری تری چاکە بە ئەنجام دەگەیێنن هەر چاکەیەك بێت، کە خوای گەورە هەموو ئەو کردەوە چاکانەیان بۆ تۆمار دەکات با میسقاڵە زەڕڕەیەکیش بێت، خودا پاداشتیان بە زایەدا نادات. بە پێچەوانەی ئەوانەوە کە بە ئیفتیرا و درۆکردن بە دەم خوداوە کارە چاکەکانیان حەرامکردووە کە بڕگەکانی مەولوودنامە (بە ئیقراری خۆشیان) بەشێکە لەو کارە چاکانە، ئەوانە خۆیان بە دەست و زمانی خۆیان لەو هەموو خێرو ئیحسان وچاکانە مەحرووم کردووە، کەواتە پێویستە خۆیان ئامادەکەن بۆ سزای (المفترين على الله الكذب يوم القيامة) مەگەر پەشیمان ببنەوە و خودا هیدایەتیان بدات، وەك هیدایەتی زۆری تریشی داوە لەمەو پێش کە ئەو جۆرە بیرو باوەڕە چەوتەیان هەبووە ئێستا سوپاس بۆ خوا پاشگەزبوونەوەوە و بەهرەمەندن لەو نیعمەت و فەزڵە گەورەی پەروەردگار (جل جلاله).

## (بەڵگەی چوارەم)

هەروەها ئایەتی پیرۆزی: ﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ، فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ

الَّـذِي أُنْـزِلَ مَعَـهُ أُولَئِـكَ هُـمُ الْمُفْلِحُـونَ﴾[1] هـەمان حەقیقـەتی پێشـووی دەسەلمێنێت، کە تیایدا خـودا (جـل جلالـه) لـە ستایشـی شـوێنکەوتوانی پێغەمبـەری ئـەخیر زەمـان دا حـەزرەتی (محمـد المصـطفی)(ﷺ) فەرموویـەتی: « لـە صـیفەت و تایبەتمەندیـەکانی ئـەو پێغەمبەرەیـە(ﷺ)وەك لـە تـەورات و ئینجیلیشـدا یاداشـتکراوە کـە ئـەو پێغەمبـەرە (ﷺ) فـەرمان دەکـات بـە سـەر ئوممەتەکەیـدا بـە چـاکەو خراپەشیان لێ قەدەغە دەکات، شتە پاکەکانیان بۆ حەڵاڵ دەکات و شـتە پیسەکانیشـیان لـە سـەر حـەرام دەکـات، ئاسـانکاری دەکـات بـۆ ئوممەتەکەیی و شـتە قـورس و دژوارەکانیـان لـە سـەر هەڵدەگرێت، بۆیـە ئەوانـەی کـە بـڕوای پـێ دەهێـنن و تـەعزیم و ڕێـزی لێ دەگـرن و سـەری دەخـەن و شـوێن ڕۆشـنایی قورئانـە ڕەوانەکراوەکـەی دەکـەون ئەوانـە ڕزگاربووانن بە بێ گومان ».

بە پێی دەقی ئەم ئایەتەش هەموو شتێکی پاك و چاك حەڵاڵەو هەموو شـتێکی پـیس و خـراپیش حەرامـە، باشـە لێرەدا دەپرسن: ئایـا کـاری مەولوودنامە کە ئەو هەموو فەزائیل وکـارە چـاك و پاکانـەی تیادایـە، ئایا کەی ڕەوای هەققە و چ مەعقولە لە بەشی (الخبائث) بێـت، هـەتا بگوترێـت حەرامە ! ؟

ئایا باسکردنی پێغەمبـەر و تاریفـات و سـتایش و ڕێزلێنـانی(ﷺ) لـە پاکەکان و(طیبات) نییە ؟! ئایا قورئـان خوێنـدن و مانـەوە لـە مزگـەوت و باسی سیرەت وموعجیزاتی پێغەمبەر (ﷺ)لە (طیبات) نییە ؟!

---

١. (سورة الأعراف: ١٥٧).

ئایا زیکری خوداو صەڵاواتدان لە سەر پێغەمبەرەکەی (ﷺ)و بانگەواز بۆ لای دینی خودا و ئامۆژگاری موسڵمانان کە تیایدا جێ بەجێ دەکرێن لە (طیبات) نییە؟! ئایا خێر و ئیحسان و چاکەو بەخشینەوەی ماڵ لە پێناو رەزامەندی خودا وشوکرانەبژێری نیعمەتی خۆشەویستەکەی خودا (ﷺ)لە (طیبات) نییە؟!

بێگومان ئەو کارە جوان و پڕ لە چاکانە کە لەو ئاهەنگەدا دێنە کردن لە بەرزترین لووتکەی پاکی و چاکی دان، بۆیە کاری مەولوودنامە لە پاك ترینی کارەکانی موسڵمانانە و بەو پێیەش باشترینی پاداشتی هەیە (إن شاء الله) بە گوێرەی دەقەکانی قورئان، چونکە قورئان فەرمانی داوە بە تێکڕای پێغەمبەران ولە رێگەی ئەوانیشەوە بە ئوممەتەکانیان کە لە شتە پاکەکان (الطیبات) بخۆن وخۆیان بەهرەمەند بکەن، وەك دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ [1]. خۆ سفرەو خوانی مەولوودنامەش هەم پاك و حەڵاڵە و هەم بە نییەتی ئیحسانەو هەم بانگەواز و بانگەشەشی بۆ کراوە لە لایەن خاوەنەکەیەوە، بێ گومان وەڵام دانەوەی دەعوەتیش لایەنی کەم کارێکی چاکەو رەتکردنەوەی بە بێ هۆی شەرعی ناپەسەندە لە شەریعەتدا، وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا، فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانْتَشِرُوا﴾ [2].

ئاشکرایە لای زانایان وەڵامدانەوەی دەعوەتی شایی موسڵمانان و ئامادەبوونی سفرەو خوانی ئەو موناسەبەتە لای زۆربەی زانایانی فیقهی ئیسلامی واجبە، بەڵام بۆ موناسەبە خۆشیەکانی تر لای زۆرێك لە زانایان

---

١. (سورة المؤمنون: ٥١).

٢. (سورة الأحزاب:٥٣).

واجیب نییه، واته موستەحەببه وکارێکی شایستەیه، وەك ئیمامی مالیك و ئیمام (سفیان الثوري)ن گوتویانه، هەروەها ئیمامی شافیعی پێی وایه ئامادەبوون بۆ خواردنی هەموو جۆره دعوەتێکی چاکەو خۆشی کارێکی موستەحەبب و باشه، له نمونەی دەعوەت کردن بۆ موناسەبەی بە موڵك بوون و خانوودروستکردن و منداڵ بوون، و خەتەنەکردن وهەر رووداوێکی تری خۆشی بەخش، وەك دەفەرموێت: روخصەت نادەم بە ئامادە نەبوونی ئەم بانگێشتانه، بەڵام ناشڵێم کەسسێك نەچوو گوناهباردەبێت، بەڵام، پێشەوا (القاضي عبيد الله العنبري) پێی وایه واجبە رۆشتن بۆ هەموو دەعوەتێك کە خاوەنەکەی نان و خوانی دروست کردبێت» وەك (الحافظ ابن عبد البر النميري القرطبي) دەفەرموێت: « واختلف الفقهاء فيما يجب إتيانه من الدعوات إلى الطعام فقال مالك والثوري: يجب إجابة وليمة العرس ولا يجب غيرها. وقال الشافعي: إجابة وليمة العرس واجبة ولا أرخص في ترك غيرها من الدعوات التي يقع عليها اسم الوليمة كالإملاك والنفاس والختان وحادث سرور ومن تركها لم يتبين لي أنه عاص كما تبين في وليمة العرس. وقال عبيدالله بن الحسن العنبري القاضي البصري: إجابة كل دعوة اتخذها صاحبها للمدعو فيها طعاما واجبة» [1].دەقی عیبارەتەکەی ئیمامی شافیعی له (الأم) له سەرباسی (الوليمة)دا بەم شێوەیه: « أخبرنا الربيع بن سليمان قال حدثنا الشافعي إملاءً قال: إتيان دعوة الوليمة حقٌ، والوليمة التى تعرف وليمة العرس، وكل دعوة كانت على إملاكٍ أو نفاسٍ أو ختانٍ أو حادث سرورٍ دُعي إليها رجلٌ فاسم الوليمة يقع

١. التمهيد لابن عبد البر القرطبي: بتحقيق: مصطفى بن أحمد العلوي (١٠ / ١٧٨).

عليها، ولا أرخص لاحدٍ في تركها، ولو تركها لم يبن لي أنـه عـاصٍ في تركهـا كما يبين في وليمة العرس»[1]..

ئاشكرايه حوكمی وه‌ڵامدانه‌وه‌ی بانگێشت و ده‌عـوه‌تی نـان خـواردنی ویلاده‌تی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) له‌ هه‌موو ئه‌و شتانه‌ی كـه‌ زانایـانی ئیسـلام بـه‌ نمونه‌ هێناویانه‌تـه‌وه‌ بـه‌ وه‌لیمـه‌ی عورسیشـه‌وه‌ كـه‌ واجبـه‌ شایسـته‌تر و به‌رێتر و گونجاوتر و گرنگتره‌ لای موسـڵمانان، ﴿إِنَّ فِـي ذَلِـكَ لَـذِكْرَى لِمَـنْ كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾[2].

به‌ڵێ، ئیمامی شافیعی كـه‌ لـه‌ زانـا مه‌زنـه‌كانی سـه‌له‌فی صـاڵحه‌ وه‌ك پێشتر نه‌قڵمان كرد فه‌رمویه‌تی: «.. أو حادث سرورٍ دُعي إليها رجلٌ فاسـم الوليمة يقع عليها» واتـه‌: «هـه‌ر روداوێكـی خۆشـی و سـرور و مژده‌به‌خش مرۆڤی بۆ بانگێشت كرا حومه‌كـه‌ی هـه‌ر وه‌كـو حـوكمی وه‌لیمه‌یـه‌ و نـاوی وه‌لیمه‌ی به‌سه‌ردا جێگیر ده‌بێت»[3].

هه‌روه‌ها ئیمامی (البیهقی) له‌ ئیمامی شـافیعییه‌وه‌ ریوایـه‌تی كـردووه‌ كه‌ فه‌رمویه‌تی: « وكل دعوة دعي إليها رجل فاسم الوليمة يقـع عليهـا، فـلا أرخص لأحد في تركها »[4] واته‌: « روخسه‌ت نـاده‌م بـه‌ هـیچ كه‌سـێك كـه‌ نه‌چێت به‌ پیری هه‌رده‌عوه‌تێكی نانخواردن كه‌ مرۆڤی بۆ بانگێشت بكرێـت چونكه‌ نـاوی (وه‌لیمـه‌) كـه‌ لـه‌ فه‌رمودانـه‌دا هـاتووه‌ ده‌یگرێتـه‌وه‌ » واتـه‌ جیاوازی نه‌خستووه‌ نێوان وه‌لیمه‌یه‌ك ووه‌لیمه‌یه‌ك لـه‌و حوكمـه‌دا، چـونكه‌

---

١. الأم للإمام الشافعي: (٦ / ١٩٥).

٢. (سورة ق: ٣٧).

٣. الأم للإمام الشافعي: (٦ / ١٩٥).

٤. معرفة السنن والآثار للبيهقي (١٢ / ٥٦)برقم(٤٥٧٣).

وەلیمـە لـە زمانەوانیـدا بـە مانـای دەعـوەتی نـانخواردن هـاتووە ئەگـەر کۆمەڵێکی بۆ بانگێشت کرا[1].

ئەم فـەرمودەی ئیمـامی شـافیعی وەك قاعیـدەو بنچـینەو بنەمایـەکی گشـتییەو بـەو پێیـەش کـاری پێـدەکرێت، ئاشـکرایە خۆشـترینی و مژدەبەخشترینی بۆنەو موناسەبەی موسڵمانانیش وەك گوتمان بریتییە لـە موناسەبەی ویلادەتی حەزرەتی فەخری عالەم (ﷺ)، بۆیـە وەڵامدانـەوی حەققەو پێویستە بـە پێـی ئـەو دەقـەی ئیمـامی شـافیعی و زانایـانی تـری ئیسـلام کـە لـە باسـی وەلیمـەدا لـە تێکـڕای کتێبـە فیقهییەکانـدا باسـیان کردووە[2].

کەواتە پێویسـتە لەسـەر ئەوانـەی کـە دەقـی ئیمامـە پێشـینیەکانیان داوادەکرد لـە مـەڕ وەڵامدانـەوەی دەعـوەتی بۆنـەی ویلادەتـی پێغەمبـەر (ﷺ) چیتر ئینکاری نەکـەن ئەگـەر راسـت دەکـەن و گوێڕایـەڵی زانایـانی پێشینەن!

---

١. ئیمامی (الشوكاني) له (نيـل الأوطـار)یدا دەفـەرموێت: « وقـال ابـن الأعرابـي: أصـلها تمـام واجتماعه، وتقع على كل طعام يتخذ لسرور، وتستعمل في وليمة الأعراس بلا تقييـد، وفي غيرهـا مع التقييد، فيقال مثلا وليمة مأدبة هكـذا. قـال بعـض الفقهـاء وحكـاه في الفـتح عـن الشـافعي وأصحابه، وحكى ابن عبد البر عن أهل اللغة وهو المنقول عن الخليل وثعلب وبه جزم الجـوهري وابن الأثير أن الوليمة هي الطعام في العرس خاصة، قال ابن رسلان: وقول أهل اللغة أقوى لأنهم اللسان وهم أعرف بموضوعات اللغة وأعلم بلسان العرب انتهى. ويمكن أن يقال: الوليمة في اللغة وليمة العرس فقط، وفي الشرع للولائم المشروعة. وقال في القاموس: (الوليمة هي) طعـام العـرس أو كل طعام صنع لدعوة وغيرها، وأولم صنعها. وقـال صـاحب المحكـم الوليمـة: طعـام العـرس والأملاك، وسيأتي تفسير الولائم ». نيل الأوطار للشوكاني:(٦/٢٢٨).

٢. بنواڕە: المجموع للنووي: (١٦ / ٣٩٧).

لێرەدا جێگەی خۆیەتی بۆ زیاتر دڵنیایی لەو مەسئەلەدا نەقڵی چەند ریوایەتێکی صەحیح بکەن لە سەر پێویستی وەڵامدانەوەی دەعوەت بۆ کۆبوونەوەی ژنهێنان یان کۆبوونەوە بۆ هەر خۆشییەکی تر بەبێ جیاکاری لەوانە:

أ- حديث الشيخين عن ابن عمر (رضي الله عنهما) أن النبي (ﷺ)قال: «أجيبوا هذه الدعوة إذا دعيتم لها، وكان ابن عمر يأتي الدعوة في العرس وغير العرس، ويأتيها وهو صائم »[1].

ب - روى الشيخان كذلك عن ابن عمر(رضي الله عنهما): عن النبي (ﷺ): « إذا دُعي أحدكم إلى وليمةٍ فليأتها »[2].

ج - روى أبو داود بسند صحيح عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): « إذا دعي أحدكم فليجب، فإن كان مفطرا فليطعم وإن كان صائما فليصل » قال هشام: والصلاة الدعاء»[3]، وأخرج عن ابن عمر (رضي الله عنهما) بسند صحيح أيضا وزاد: « فإن كان مفطرا فليطعم، وإن كان صائما فليدع »[4].

د - أخرج الحافظ البيهقي بسنده عن نافع قال قال عبد الله بن عمر (رضي الله عنهما) قال رسول الله (ﷺ): « من دعي فلم يجب فقد عصى الله ورسوله (ﷺ)، ومن دخل على غير دعوة دخل سارقا وخرج مغيرا» ثم قال: « وهذا ورد في الرجل يدخل على آخر وهو يعلم أنه يأكل ليأكل معه

---

١. متفق عليه: ينظر: صحيح البخاري: (١٩٨٥/٥)برقم(٤٨٨٤). وصحيح مسلم (١٠٥٢/٢) برقم(١٤٢٩).

٢. صحيح البخارى:(١٩٨٤/٥) برقم(٤٨٧٨)، وصحيح مسلم (١٠٥٢/٢)برقم(١٤٢٩).

٣. سنن أبي داود (١ / ٧٤٧)برقم(٢٤٦٠).

٤. سنن أبي داود (٢ / ٣٦٧)برقم(٣٧٣٧).

وقد روي حديث بنفي التخصيص الذي توهمه أبو العباس في طعام النبي (ﷺ)في قصة أبي الدرداء»[1].

هـ - أخرج الطبراني بسنده عن مجاهد قال: « كنا جلوسا في حلقة فيها عبد الله بن عمر وعبيد بن عمير، فجاءنا رجل فقام علينا فقال: أجيبوا فلاناً، أجيبوا فلاناً، فكرهها القوم كراهية شديدة، ونكس بن عمر رأسه، فرفع عبيد بن عمير رأسه فقال: يا بن أخينا أعفنا أعفنا، فرفع بن عمر رأسه وقال: قوموا بنا ليس فيها عافية، سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: من دعي فلم يجب فقد عصى الله ورسوله (ﷺ)»[2].

و- أخرج البيهقي: عن أحمد عن عن مالك، عن نافع، عن ابن عمر قال: قال رسول الله (ﷺ): « إذا دعي أحدكم إلى الوليمة فليأتها»، وكان عبيد الله بن عمر ينزلها على العرس، قال الشافعي: وكل دعوة دعي إليها رجل فاسم الوليمة يقع عليها، فلا أرخص لأحد في تركها »[3].

ز- أخرج مسلم وأحمد وأبو داود بأسانيد صحيحة عن نافع أن ابن عمر عن النبي (ﷺ): « إذا دعا أحدكم أخاه فلْيجبْ عرسا كان أو نحوه».[4]

ح - وأخرج مسلم في صحيحه عن ابن عمر قال قال رسول الله (ﷺ): « من دعي إلى عرس أو نحوه فليجب (من دعي إلى عرس أو نحوه فليجب »[5].

---

١. السنن الكبرى للبيهقي (٦٨/٧)برقم(١٣١٩٠). وأخرجه أبو داود في سننه كذلك: (٣٦٧/٢)برقم(٣٧٤١).

٢. المعجم الأوسط للطبراني: (٦ / ٢٨٩)برقم(٦٤٣٨).

٣. معرفة السنن والآثار للبيهقي (١٢ / ٥٦)برقم(٤٥٧٣).

٤. صحيح مسلم (١٠٥٢/٢)برقم(١٤٢٩). مسند أحمد بن حنبل: (١٤٦/٢)برقم(٦٣٣٧). سنن أبي داود (٣٦٧/٢)برقم(٣٧٣٨).

٥. صحيح مسلم: (٢ / ١٠٥٢)برقم(١٤٢٩).

لە بەر ئەو هەموو ریوایەتە صەحیحەیە موسڵمانان دەچن بە پیری دەعوەتی مەولوودنامەی پێغەمبەرەوە (ﷺ). چونکە بە پێی دەقی فەرموودەی قورئان حەزرەتی پێغەمەر (ﷺ) نزیکترو ئەولاترە لە هەموو رویەکەوە لە خودی بڕواداران لە خۆیان وەك دەفەرموێت: ﴿النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ﴾ [1].

هەر لە بەر ئەوەشە کە زانایانی ئیسلام وەلیمەیان تایبەتمەند نەکردووە بە تەنها وەلیمەی عورس و ژنهێنانەوە، بەڵکو فەرمویانە: وەلیمە دەکرێت بە دە بەشەوە، وەلیمەی عورس، وەلیمەی خور سیان خورص بۆ لەدایك بوون، وەلیمەی ئیعزار بۆ خەتەنەکردنە منداڵ، وەلیمەی وەکیرە بۆ خانوو درووستکرن یان هەر بیناو پرۆژەیەکی تر، وەلیمەی نەقیعە بۆ هاتنوەو قدووم خێری گەشتیار لە سەفەرەکەیەوە، وەلیمەی عەقیقە بۆ حەوتەمی منداڵ کە لە دایك دەبێت، وەلیمەی وەزیمە بۆ کاتی موصیبەت و مردن، کە ئەگەر بۆی بکرێت سوننەتە بەڵام خۆی بیکات نا شەرعییەو باش نییە، وەلیمەی مەئدوبە یان موئدوبە کە میوانداری خەڵکە بە بێ هیچ هۆیەك، وەلیمەی حیزاق کە ساز دەکرێت بە بۆنەی سەرکەوتنی منداڵی زیرەك لە هەر بوارو صنعەتێکدا بە تایبەت لە تەواوکرن و خەتمی قورئان یان هەر بەشێکی، وەلیمەی عەتیرە کە مەڕێکە لە سەرەتای مانگی رەجەبدا سەردەبڕدرێت و خەڵکی بۆی بانگێشت دەکرێت، هەرچەندە ئەم ئەخیرەیان لە ناوبردنەکەیدا بە وەلیمە خیلاف هەیە.

---

١. (سورة الأحزاب: ٦).

لەم بارەوە (شيخ الإسلام محيي الدين النووي) لە (شرح صحيح مسلم)دا دەفەرموێت: « قال أصحابنا وغيرهم: الضيافات ثمانية أنواع: الوليمة للعرس والخرس بضم الخاء المعجمة، ويقال الخرص أيضا بالصاد المهملة للولادة والاعذار بكسر الهمزة وبالعين المهملة والذال المعجمة للختان والوكيرة للبناء والنقيعة لقدوم المسافر مأخوذه من النقع، وهو الغبار ثم قيل إن المسافر يصنع الطعام وقيل يصنعه غيره له والعقيقة يوم سابع الولادة والوضيمة بفتح الواو وكسر الضاد المعجمة الطعام عند المصيبة والمأدبه بضم الدال وفتحها الطعام المتخذ ضيافة بلا سبب والله أعلم »[1].

پاشان (الحافظ العسقلاني) بەشەكانی تری باس كردووە وەك دەفەرموێت: «وقد فاتهم ذكر الحذاق بكسر المهملة وتخفيف الدال المعجمة وآخره قاف: الطعام الذي يتخذ عند حذق الصبي ذكره ابن الصباغ في (الشامل). وقال ابن الرفعة هو الذي يصنع عند الختم أي ختم القرآن كذا قيده، ويحتمل ختم قدر مقصود منه، ويحتمل أن يطرد ذلك في حذقه لكل صناعة. وذكر المحاملي في (الرونق) في الولائم: العتيرة بفتح المهملة ثم مثناة مكسورة وهي شاة تذبح في أول رجب، وتعقب بأنها في معنى الأضحية، فلا معنى لذكرها مع الولائم، وسيأتي حكمها في أواخر كتاب العقيقة، وإلا فلتذكر في الأضحية ». پاشان شێخی عەسقەلانی دەفەرموێت: «وەلیمەی مەئدوبیش دەكرێت بە دوو بەشەوە: مەئدوبەی نەقرا كە تایبەتمەندە بە كۆمەڵێك لە دوست و ئەحباب، وەلیمەی جەفلا كە گشتگیرە بۆ موسڵمانان بە تێكڕا و بێ جیاوازی»، وەك دەفەرموێت: « وأما المأدبة ففيها تفصيلٌ،

١. شرح النووي على مسلم: (٩ / ٢١٧).

لأنها إن كانت لقوم مخصوصين فهي النقري بفتح النون والقاف مقصور، وإن كانت عامة فهي الجفلي بجيم وفاء بوزن الأول، قال الشاعر:

نحن في المشتاة ندعو الجفلى *** لا ترى الآدب منا ينتقر

وصف قومه بالجود وأنهم إذا صنعوا مأدبة دعوا إليها عموما لا خصوصا، وخُصَّ الشتاء لأنها مظنة قلة الشيء وكثرة احتياج من يدعي، والآدب بوزن اسم الفاعل من المأدبة، وينتقر مشتق من النقري» [1].ئەم جۆرانة پێشەوا (المحدث أبو العلا المباركفوري) له (تحفة الأحوذي)دا نەقڵی كردووه له زانایانەوه [2].

بێگومان حوكمی وەڵامدانەوەو رۆشتن بەدەم دەعوەتی ودلیمەشەوە (موتڵەقی وەلیمە) دائیرە له نێوان (وجوب و مندوب)دا واته یان واجبه یان سوننەته وەك پێشەوا (الشوكانی) دەفەرموێت: « وظاهر الأمر الوجوب، وقد روى القول به القرطبي عن مذهب مالك، وقال مشهور المذهب أنها مندوبة، وروى ابن التين الوجوب أيضا عن مذهب مالك، وقال مشهور المذهب أنها مندوبة، وروى ابن التين الوجوب أيضا عن مذهب أحمد، لكن الذي في المغني: أنها سنة، وكذلك حكي الوجوب في البحر عن أحد قولي الشافعي، وحكاه ابن الحزم عن أهل الظاهر، وقال سليم الرازي: أنه ظاهر نص الأم، ونقله أبو إسحاق الشيرازي عن النص، وحكاه في الفتح أيضا عن بعض الشافعية، وبهذا يظهر ثبوت الخلاف في الوجوب لا كما قال ابن بطال: ولا أعلم أحدا أوجبها. وكذا قال صاحب المغني ومن جملة ما استدل به من أوجبها ما أخرجه الطبراني من حديث وحشي بن حرب رفعه « الوليمة حق

---

١. فتح الباري للعسقلاني: (٩ / ٢٤١ـ ٢٤٢).

٢. تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي للمحدث أبو العلا محمد عبد الرحمن بن عبد الرحيم المباركفوري: (٤/١٨٢ـ١٨٣).

». وفي مسلم: « شر الطعام طعام الوليمة ثم قال: وهو حق ». وفي رواية لأبي الشيخ والطبراني في الأوسط من حديث أبي هريرة رفعه: « الوليمة حق وسنة فمن دعى إليها فلم يجب فقد عصى». وأخرج أحمد من حديث بريدة قال لما خطب عليٌ فاطمة قال رسول الله (ﷺ): أنه لا بد للعروس من وليمة قال الحافظ وسنده لا بأس به قال ابن بطال: قوله (حق): أي ليست بباطل بل يندب إليها، وهي سنة فضيلة، وليس لمراد بالحق الوجوب، وأيضا هو طعام لسرور حادث فأشبه سائر الأطعمة، والأمر محمول على الاستحباب»[1].

ئاشكرايه نان خواردنی دەعوەتی مەولودی پێغەمبەریش(ﷺ) چەند جورێك لەو جۆرانەی وەلیمە دەیانگرێتەوە، لەوانە: وەلیمەی لەدایك بوون و وەلیمەی عەقیقەو وەلیمەی مەئدووبە بەهەر دوو بەشەکەیەوە، تایبەتمەند و گشتی وەك باسمان کردن. هەروەها بە حوکمی (القیاس الجلي، القیاس الأولی) یان (مفهوم الموافقة) وەك ئاشکرایە. ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَذِكْرَى لِمَنْ كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾[2].

## (بەڵگەی پێنجەم)

ئایەتە پیرۆزەکانی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِنْ تَسْأَلُوا عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ الْقُرْآنُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا اللَّهُ عَنْهَا وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ * قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ مِنْ قَبْلِكُمْ ثُمَّ أَصْبَحُوا بِهَا كَافِرِينَ * مَا جَعَلَ

١. نيل الأوطار من أحاديث سيد الأخيار شرح منتقى الأخبار، للقاضي محمد بن علي بن محمد الشوكاني، مع تعليقات محمد منير الدمشقي:(٦/٢٢٨).

٢. (سورة ق: ٣٧).

اللَّهُ مِنْ بَحِيرَةٍ وَلا سَائِبَةٍ وَلا وَصِيلَةٍ وَلا حَامٍ وَلَكِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾[1].

بەڵگەی راستەوخۆن لە سەر ئەوەی کە ئەصلْ لە هەموو شتێکدا حەڵاڵ بوون و دروستییە، وە پەروەردگار ئەو شتانەی کە باسی نەکردوون قەڵەمی عەفوی لێداون تا بێت پرسیاریان لێ بکرێت، وەك ئوممەتانی پێشتر، کە پاشان پێشی کافر بوون، لە ئایەتی دووەمدا خودا باس لەوە دەفەرموێت کە کۆمەڵێکی سەرلێشێواوی گومڕا چەند جۆرە ووشترێکیان لە ژێر چەند ناو وناتۆرێکدا حەرام کردبوو لە خۆیان یان لە ژنەکانیان لە شێوازی بەکارهێنانیاندا، کە تێکڕای ئەو کارانەیان خودا پێی رازی نەبوو چونکە هیچیان خودا حەرامی نەکردبوون و بەدەم خوداوە هەڵیان بەستبوو. بێگومان شتێك کە خودا بۆ خۆی حەرامی نەکردبێت بە قسەی پوچی ئەوان و نمونەکانیان لە هەر زەمان و مەکانێکدا حەرام نابێت.

بۆیە با چاك بزانین حەرامکردنی شتی حەڵاڵ چەندە لای خودا تاوانە، کە بە هۆیەوە خاوەنەکەی لە ئیسلام دەردەچێت، بۆیە ئەوانەی نان و خوانی موسڵمانان حەرام دەکەن کە دەیبەخشنەوە لە موناسەبەی ویلادەتدا لە شوکرانە بژێری نیعمەتی گەورەی حەزرەتی (رسول الله) دا (ﷺ) ئەبێ چ پاشەرۆژێکی ترسناك لە قیامەتدا چاوەڕوانیان بکات وچۆن بە چ پاساوێك وەڵامی ئەو ئیفتیرایانەیان بدەنەوە؟!

---

١. (سورة المائدة: ١٠١ – ١٠٣).

## ( بەڵگەی شەشەم )

« أخرج أحمد والبيهقي والطبراني وأبوداود والدرارمي وابن أبي شيبة عن الحارث بن عمرو يحدث عن أصحاب معاذ من أهل حمص قال: وقال مرة عن معاذ(رضي الله عنه): أن رسول الله (ﷺ) لما بعث معاذاً إلى اليمن، قال له:: كيف تقضي إذا عرض لك قضاء؟ قال: أقضي بكتاب الله، قال: فإن لم تجده في كتاب الله؟ قال: أقضي بسنة رسول الله (ﷺ)، قال: فإن لم تجده في سنة رسول الله؟ قال: أجتهد برأيي لا آلو، قال: فضرب بيده في صدري، وقال: الحمد لله الذي وفّق رسول رسول الله (ﷺ) لما يرضى رسول الله (ﷺ)» [1].

واتە: « وەختێك حەزرەتی پێغەمبەر (ﷺ) حەزرەتی (معاذ بن جبل)ی نارد بۆ وولاتی یەمەن پێی فەرموو ئەی موعاز: ئەگەر مەسئەلەیەك هاتە بەردەمت بە چ حوكم دەكەیت؟ ئەویش فەرمووی: بە قورئان، فەرمووی: ئەگەر لە قورئاندا حوكمەكەیت نەدۆزییەوە، فەرمووی: بە سوننەت حوكم دەكەم، فەرمووی: ئەگەر لە سوننەتیشدا نەتدۆزییەوە؟ فەرمووی ئیجتیهاد دەكەم و كەم ترخەمی ناكەم، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) بە دەستی پیرۆزی دای بە سەر سینەی موعازداو فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە تەوفیقی نێردراوی نێردراوی خودای دا بۆ ئەو شتەی كە نێردراوی خودا(ﷺ) پێی خۆشە». واتە دۆعای خێری بۆ كرد ونەیفەرموو:

---

١. مسند أحمد بن حنبل: (٢٣٦/٥)برقم(٢٢١١٤)، السنن الكبرى للبيهقي (١١٤/١٠) برقم(٢٠١٢٦)، السنن الصغرى للبيهقي(٢٥٧/٣)برقم(٤٥٠٥). المعجم الكبير للطبراني: (١٧٠/٢٠)برقم(٣٦٢)، سنن أبي داود (٣٣٠/٣) برقم(٣٥٩٤)، سنن الدارمي بتحقيق: فواز أحمد زمرلي، خالد السبع العلمي: (٧٢/١)برقم(١٦٨) مصنف ابن أبي شيبة (٥٤٣/٤)برقم(٢٢٩٨٩).

ئەی موعاز تۆ چۆن حوکم دەکەیت بە شتێك کە دەقێکی قورئان یان سوننەی لە سەر نەبێت؟ بەڵێ هەموو کارێك، هەموو حەڵاڵ وحەرامێك بە شێوازێکی تایبەت یان گشتی لە قورئان وفەرموودەدا یان بە صەراحەت یان ئیشارەت ودیلالەت باس کراون، بەڵام ئایا هەموو کەس ئەو تەوفیقەی هەیە کە حوکمەکان بدۆزێتەوە؟ هەر لە بەر ئەوەش بوو پێغەمبەر(ﷺ) بە موعازی نەفەرموو: (فإن لم یوجد في کتاب الله) أو (فإن لم یوجد في سنة رسول الله) واتە: (ئەگەر حومەکە نەبوو لە قورئان سوننەتدا) بەڵکو فەرمووی: (فإن لم تجده في کتاب الله) (فإن لم تجده في سنة رسول الله) واتە: ئەگەر تۆ نەتدییەوە لە قورئان و سوننەتدا، کە رەنگە حوکمەکەی هەبێت، بەڵام بە (قیاس الأشباه) بدرۆزرێتەوە، بۆیە وەختێك حەزرەتی موعاز فەرمووی: ئەگەر نەمدییەوە ئەوا ئیجتیهاد دەکەم، پێغەمبەر (ﷺ) زۆری پێ خۆش بوو، چونە قیاس بەشێکی گرنگی ئیجتیهادەو زیاتر بۆی روونبوویەوە کە نوێنەرەکەی لە قیاس دەزانێت و مامەڵە لە تەك رۆحی دەقەکاندا دەکات نەك زاهیرو حەرفییەتی دەقەکان..

ئەم فەرمودە بەڵێ سەنەدەکەی مەعلولە بەڵام شەواهیدی زۆرەو هەموو زانایانی ئیسلام کاریان پێکردووە لە سەلماندنی بەڵگەی قیاسدا، هەروەها چەند ریوایەتێکی تر هەیە کە صەحیحن قیاسی صەحابەو تابیعین و زانایانی ئیسلام دەسەلمێنێت لەو بوارەدا، لەوانە: پێشەوا(الحافظ الزیلعي) پاش ریوایەتەکەی سەرەوە دەفەرموێت: « وفیە (أي في التاریخ الکبیر للبخاري) کتاب عمر إلی أبي موسی رواه الدارقطني ثم البیهقي في (سننیهما) وفیه: « الفهم فیما یختلج في صدرك مما لم یبلغك في الکتاب والسنة أعرف الأشباه والأمثال ثم قس الأمور عند ذلك فاعمل إلی أحبها إلی الله وأشبهها بالحق فیما تری..الحدیث» وسیأتي بتمامه قریبا،

قال البيهقي: والاجتهاد هو القياس، وأخرج عن جماعة من الصحابة أنهم اجتهدوا وقاسوا فأخرج عن سفيان حدثني عبد الله بن أبي يزيد قال: سمعت ابن عباس إذا سئل عن الشيء فإن كان في كتاب الله قال به، وإن لم يجد وكان في سنة رسول الله (ﷺ) قال به، فإن لم يجد وكان عن أبي بكر أو عمر قال به فإن لم يجد اجتهد رأيه انتهى. وقال: إسناده صحيحٌ. وأخرج حديث ابن مسعود قال: لما قبض رسول الله (ﷺ) قالت الأنصار: منا أمير ومنكم أمير فبلغ ذلك عمر فأتاهم فقال لهم: يا معشر الأنصار ألستم تعلمون أن رسول الله (ﷺ) قال: مروا أبا بكر أن يصلي بالناس؟ قالوا: نعم قال: فأيكم تطيب نفسه أن يتقدم أبا بكر ؟ فقالت الأنصار: نعوذ بالله أن نتقدم أبا بكر قال البيهقي: فقد قاس عمر الإمامة في سائر الأمور على إمامة الصلاةِ وقبله منه جميع الصحابة المهاجرين والأنصار وأخرج حديث ابن مسعود في قصة بروع بنت واشق أقول فيها برأيي فإن كان صوابا فمن الله وإن كان خطأ فمني وحديث أبي بكر في (الكلالة) أقول فيها برأيي فإن يك صوابا فمن الله وإن يك خطأ فمني ومن الشيطان، وعن مالك بن أنس قال: أنزل الله كتابه وترك فيه موضعا لسنة نبيه وسن نبيه (ﷺ) السنن وترك فيها موضعا للرأي والقياس انتهى»[1].

وأخرج الحافظ البيهقي في السنن الصغرى قال: « وَرُوِّينَا عن عُمَر بن الخطاب (رضي الله عنه) أنه كتب إلى (القاضي) شُريح بأن يقضي بما في كتاب الله، ثم بما في سنة رسول الله (ﷺ)، فإن جاءك ما ليس في كتاب الله،

١. نصب الراية للزيلعي: (٤ / ٨٨).

ولا فيه سنة رسول الله (ﷺ)، فانظر ما اجتمع عليه الناس فخُذ به، ثم ذكر اجتهاد الولي. وكذلك قاله عَبد الله بن مسعود، وعبد الله بن عباس »[1].

ئەمانەو جگە لەمانەش بەڵگەن لە سەر دروستی ئیجتیهادی زانایانی موجتەهید، خۆ ئەگەر بگوترێت نابێت کارێك بکەین ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) راستەو خۆ نەیکردبێت یان دەقێکی لە سەر نەبێت! ئەوا دەبێت دەرگای ئیجتیهاد بە تەواوەتی دابخرێت، هەروەها دەبێت بڵێین هەزاران ئیجتیهادات کە زانایانی ئیسلام کردوویانە لە پاش چەرخی پێغەمبەر (ﷺ) تێکڕایان نا دروستە، ئەمەش باتیڵە بە ئیجماع، کەواتە سەلما دروستی ئیجتیهاد، بەم پێیەش مەرج نییە ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) تەرکی کردبێت نا دروست بێت، بەڵکو لە بابی دروستی و ئیباحەیە. بەو پێیەش دەسەلمێت ئیجتیهادی زانایان لە مەڕ رێو رەسمی کاری مەولوودنامەی پێغەمبەر(ﷺ).

## ( بەڵگەی حەوتەم )

فەرمودەی: (أبي ثعلبة الخشني) (رضي الله عنه) لە حەزرەتی رسول الله (ﷺ): «إن الله فرض فرائض فلا تضيعوها، ونهى عن أشياء فلا تنتهكوها، وحد حدوداً فلا تعتدوها، وسكت عن أشياء رخصة لكم ليس بنسيان فلا تبحثوا عنها».[2]

---

١. السنن الصغرى للبيهقي: (٣ / ٢٥٧) برقم(٤٥٠٦).

٢. رواه البيهقي في السنن الكبرى: (١٠ / ١٢)برقم(١٩٥٠٩) والطبراني في (المعجم الكبير: (٢٢/٢٢١)برقم(٥٨٩) قال الحافظ الهيثمي في (مجمع الزوائد ومنبع الفوائد.(١/٢٠٩)برقم(٧٩٦): « رواه الطبراني في الكبير ورجاله رجال الصحيح ». ورواه الحاكم في المستدرك على الصحيحين بلفظ: « إن الله حد حدودا فلا تعتدوها، و فرض لكم فرائض فلا تضيعوها، و حرم أشياء فلا

واتـه: « خـوای گـهوره چـهند فـهرمانێكی فـهرزكردووه لـه سـهرتان مهیفـهوتێنن، چـهند شتێكیشـی لـێ قهدهغـه كـردوون سـنوری مهبـهزێنن، چوند شتێكیش ههیه لێی بێ دهنگ بووهو باسی نهفـهرمووه ئـهوه نـهبێت لـه رووی لـه بیرچـوونهوه بێـت، بـهڵكو روخسـهت و رهحمهتـه بـه ئێـوهی كردووه، ئێوه بیكهن و باسی مهكهن و داوای بهڵگهی له سهر مهكهن».

كهواته مـهرج نییـه ههرشـتێك خـوداو پێغهمبـهری خـودا(ﷺ) باسـی حوكمهكهیان نهكردبێت و تهركیان كردبێت ئیتر حهرام بێت به بهڵگهی ئهو فهرموده صهحیحه.

تهنانهت زانایانی ئیسلام كۆ دهنگن له سهر ئهوهی كـه سوننهتهكانی پێغهمبهر(ﷺ) به چهند بهشێك دابهش دهكرێت، واته مـهرج نییـه هـهموو سوننهتێكی پێغهمبهر(ﷺ) واجیب بێت، مهگهر ئهو سوننهته سهرچاوهی له قورئانهوه وهرگرتبێت، بۆیه پێغهمبهر(ﷺ) سووننهتی من دوو جـۆره، سووننهتێكی فهرز و سوننهتێكی غهیره فهرز، ئهو سـوننهتهین كـه جـۆری فهرزهكانه، ئهصڵهكهی له قورئانهوه وهرگیراوه، كاركردن پێی هیدایهتـهو وازهێنانش لێی گومڕاهییه، ئهو سوننهتهش كه ئهصـڵهكهی لـه قورئانـهوه وهرنهگیراوه، كاركردن پێی زیاده پاداشتهو وازهێنانیش لێی گوناه نییه». « عـن أبـي هريـرة قـال: قـال رسـول الله (ﷺ): « السـنة سـنتان: سـنة في فريضة وسنة في غـير فريضـة، السـنة الـتي في الفريضـة أصـلها في كتـاب الله

---

تنتهكوها، وترك أشياء من غير نسيان من ربكم و لكن رحمة منه لكم فأقبلوا و لا تبحثوا فيها» وسكت عنه الذهبي في التلخيص». ينظر: المستدرك مع التلخيص: (١٢٩/٤)برقم(٧١١٤). ورواه عنه كذلك أبو نعيم في (حلية الأولياء) (١٧/٩).

أخذها هدى وتركها ضلالة، والسنة التي ليس أصلها في كتاب الله الأخذ بها فضيلة وتركها ليس بخطيئة»[1].

کەواتە لە جێیەك هەموو سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) واجب نەبن، ئەی چۆن و بە چ بەڵگەیەك ئەو شتانەی کە پێغەمبەر(ﷺ) نەیکردوون یان وازی لێ هێناون یان راستەوخۆ باسی حوکمەکەی نەکردووە حەرام دەبن؟!

تەنانەت هەندێك فەرمان هەیە لە قورئان و سوننەتدا بە کۆی دەنگی زانایانی ئوصوڵی فیقهی ئیسلامی بۆ ئیباحەو دروستی یە، نەك بۆ واجب بوون، لەو فەرمانانە: هەردوو فەرمانی(فانتشروا)، (وابتغوا) لە ئایەتی پیرۆزی: ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانْتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ﴾[2] واتە « هەرکات نوێژی جومعەتان تەواو کرد بچنە دەرەوەو بڵاو ببنەوە، تیجارەتی خۆتان بکەن بە یارمەتی پەروەردگار».

پێشەوا (ابن عطية الأندلسي) لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: « وقوله (فانتشروا) أجمع الناس على ان مقتضى هذا الأمر الإباحة، وكذلك قوله

١. أخرجه الطبراني في (المعجم الأوسط): (٤/ ٢١٥)برقم(٤٠١١) و في المعجم الكبير: (٣٢٣/١٩)برقم(٧٨٥)، قال الحافظ نور الدين الهيتمي في (مجمع الزوائد): (٢٠٩/١ـ ٢١٠)برقم(٧٩٩): « رواه الطبراني في الأوسط، وقال: لم يروه عن أبي سلمة إلا عيسى بن واقد، تفرّد به عبد الله بن الرومي، قلتُ: ولم أر من ترجمه، (فائدة: عبد الله هو ابن محمد ويقال: ابن عمر اليمامي، يعرف بابن الرومي، وثقه أبو حاتم وغيرُه – كما في هامش الأصل ». ورواه الحافظ أبو نعيم في حلية الأولياء: (٣٥/٧) عن سفيان الثوري عن علي بن الحسن (رضي الله عنهما)، ورواه الحافظ الدارمي في سننه: (١٥٣/١)برقم(٥٨٩) عن طريق الأوزاعي عن مكحول(رحمه الله).

٢. (سورة الجمعة: ١٠).

تعالى: (وابتغوا من فضل الله) أنه الإباحة في طلب المعاش »[1]. پێشەوا (البغوي)یش دەفەرموێت: « وهذا أمر إباحة، كقوله: (وإذا حللتم فاصطادوا) قال ابن عباس (رضي الله عنهما): إن شئت فاخرج، وإن شئت فاقعد، وإن شئت فصلِّ إلى العصر»[2]. واتە: « ئەگەر پێت خۆشە دەرچۆ لە مزگەوت، ئەگەر دەشتەوێت دانیشیت مانیع نییە دانیشە، ئەگەر حەزیشت کرد ئەتوانیت تا عەصر بۆ خۆت نوێژی سوننەت بکەیت ». لە بیریشمان نەچێت (ابن عباس) لێرەدا فەتوایەکی دا بە دامەزراندنی عیبادەتێك کە نوێژکردنە لە دوای جومعە تا عەسر، کەسیش پێی نەگووت ئەی (ابن عباس) ئەمەی تۆ دەیڵێیت بیدعەتەو پێغەمبەر و خەلیفەکان نەیانکردووە! چونکە کارێکی دانەهێناوە موخالیفی دەقێکی قورئان یان فەرموودە یان ئیجماع بێت، ئیدی کاری مەولوودنامەو هەموو داهێنراوە

1. المحرر الوجيز في تفسير الكتاب العزيز لأبي محمد عبد الحق بن غالب بن عطية الأندلسي: بتحقيق: عبد السلام عبد الشافي محمد: (٥/٢٨٤).
2. تفسير البغوي(معالم التنزيل) (٨/١٢٣).، نظم الدرر للبقاعي، بتحقيق: عبدالرزاق غالب (٧/٦٠١). تفسير الرازي: مفاتيح الغيب:(٣٠ / ٩). تفسير السراج المنير للخطيب الشربيني: (٤/٢٠٨). شایەنی باسە لە (ابن مسعود)یشەوە ریوایەت کراوە کە فەرمویەتی: « هەرکات کە نوێژەکەت تەواو کرد ئەگەر ویستت برۆ، ئەگەر ویستیشت دانیشە » قال الحافظ البيهقي: « أخبرناه أبو عبد الله الحافظ أنبأ أبو بكر بن إسحاق الفقيه أنبأ عبد الله بن محمد بن عزيز ثنا غسان بن الربيع الموصلي ثنا عبد الرحمن بن ثابت بن ثوبان عن الحسن بن الحر: فذكر الحديث نحو رواية شبابة ويحيى بن يحيى وقال في آخره قال عبد الله بن مسعود إذا فرغت من هذا فقد قضيت صلاتك فإن شئت فقم وإن شئت فاقعد». السنن الكبرى بتحقيق:محمد عبد القادر عطا: (٢/١٧٥)برقم(٢٧٩٤). بەڵام ئەم ریوایەتە غەیری ریوایەتەکەی ئیمامی بەغەوی یە چونکە سیاقیان جیاوازە.

چاکەکانیش لەو بابەیە، کەواتە: (فطوبى للعُقلاء). هەرچەندە وەك قورئان دەفەرموێت: (وَما يَعْقِلُهَا إلاَّ العَالِمُوْن) [1].

هەروەها وەك فەرمانی: (فاصطادوا) کە بۆ ئیباحەیە، لە ئایەتی پیرۆزی: {وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُوا} [2] واتە: « هەرکات تەحەللولتان کرد لە ئیحرام و کاتەکانی واجب بوونی ئیحرام تەواو بوو، دروستە بۆتان راو بکەن »[3]. هەروەها وەك فەرمانی: (باشروهن) لە ئایەتی پیرۆزی: (فَالـآنَ بَاشِرُوهُنَّ)[4]. « هذا أمر وارد عقب الحظر، فالذين قالوا الأمر الوارد عقيب الحظر ليس إلا للإباحة كلامهم ظاهر، وأما الذين قالوا مطلق الأمر للوجوب قالوا: إنما تركنا الظاهر وعرفنا كون هذا الأمر للاباحة بالإجماع » [5].

هەروەها وەك فەرمانی: (حدثوا) فەرمودەی: (حدِّثوا عن بني إسرائيل ولا حرج) واتە: « بگێرنەوە لە بەنی ئیسرائیلەوەو هیچ کێشەیەك نییە » زانایان دەفەرموون: ئەم فەرمانە بۆ دروستییە نەك بۆ واجب بوون، پێشەوا(بدر الدين العينى) دەفەرموێت: « قال مالك: المراد جواز التحديث عنهم بما كان من أمر حسن، وأما ما عُلم كذبه فلا. وقيل: المعنى حدثوا عنهم مثل ما ورد في القرآن والحديث الصحيح، وقيل: المراد جواز التحدث عنهم بأي صورة وقعت، من انقطاعٍ، أو بلاغٍ، لتعذر الإتصال في التحديث

١. (سوره العنكبوت: ٤٣).

٢. (سورة المائدة: ٢).

٣. بنوارە بۆ: تفسير ابن كثير (١/٣٢٢).

٤. (سورة البقرة: ١٨٧).

٥. تفسير الرازي: مفاتيح الغيب (٥/٩٢).

عنهم، بخلاف الأحكام الإسلامية فإن الأصل في التحديث بها الاتصال.. وقال الكرماني: الأمر للإباحة إذ لا وجوب ولا ندب فيه بالإجماع »[1].

هەروەها وەك فەرمانی (فَزُوْرُوْهَا)، (زیارەتی گۆرەكان بكەن) لە فەرمودەی صەحیحی: « نهيتكم عن زيارة القبور فزوروها، ونهيتكم عن لحوم الأضاحي فوق ثلاث فأمسكوا ما بدا لكم، ونهيتكم عن النبيذ إلا في سقاء، فاشربوا في الأسقية كلها، ولا تشربوا مسكرا »[2] واتە: « پێشتر نەهیم كردبوو لێتان زیارەتی قەبر بكەن، بەڵام ئێستا فەرمانتان پێ دەدەم كە زیارەتی بكەن چونكە قیامەتتان بیردەخاتەوە » ئەو فەرمانەش لای زۆربەی زانایان بۆ دروستتیە جگە لە (ابن حزم) كە پێ وایە بۆ وجوبە با یەك جاریش بێت[3].

## ( بەڵگەی هەشتەم )

فەرمودە صەحیحەكانی پێغەمبەر (ﷺ) لەوانە: « من سَنَّ سنةً حسنةً.. و من دلَّ على خيرٍ.. من دعا إلى هُدى.. » و نمونەكانیان كە دەقی راست و دروستن لە سەر دامەزراندنی كاری چاك و پەسەندو پاداشتی گەورەش لە سەری، وەك بە درێژی لە بەشی یەكەمی ئەم توێژینەوەدا

---

١. عمدة القاري شرح صحيح البخاري للبدر العيني: (٢٣ / ٤٦٠ـ ٤٥٩).

٢. رواه مسلم في صحيحه(١٥٦٣/٣)برقم(١٩٧٧) عن عبدالله بن بريدة عن أبيه(رضي الله عنهم).

٣. بنوارە: التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد لابن عبد البر القرطبي بتحقيق: مصطفى بن أحمد العلوي، محمد عبد الكبير البكري: (٢٣٠/٣)، وتحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي للمباركفوري: (١٣٦/٤).

باسمان کردن، بەڵگەن لە سەر ئەوەی مەرج نییە هەر شتێت تەرك کرابێت حەرام بێت.

## (بەڵگەی نۆیەم)

حەزرەتی (عبد الله بن عمر)(رضي الله عنهما) ئەیگێرێتەوە کە بیستویەتی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمویەتی: « إن مُحرِّمَ الحلال كمُحِلِّ الحرام» واتە: « هەر کەسێك کارێکی حەڵاڵ حەرام بکات وەك ئەوە وایە کارێکی حەرامی حەڵاڵ کردبێت»[1].

کەواتە ئەوانەی کاری مەولوودنامە بە بیدعەت و گومڕایی دەزانن با چاك بزانن کە ئەم فەرموودەو هاوواتاکانی دەیانگرێتەوە، چونکە لای کەمەکەی حەڵاڵێکیان حەرام کردووە، کەواتە با تەوبە بکەن لە سەر فەتوا نا دروستەکانیان چونکە دوورە لە شەرعی خوداوەو نزیکە لە هەواو ئارەزووی نەفسەوە.

---

١. رواه البيهقي في السنن الكبرى (٩/٣٢٦)برقم(١٩٢١٤). ورواه الطبراني في المعجم الأوسط (٨/٦٧)برقم(٧٩٨٢)، والمعجم الكبير(٩/١٧٢)برقم(٨٨٥٢)، قال الهيثمي في مجمع الزوائد ومنبع الفوائد:(١/٢١٦)برقم(٨٢٧) « رواه الطبراني في الكبير ورجاله رجال الصحيح وله طريق يأتي في كتاب الصيد». المعجم الكبير: (٢٥/١٧١)برقم(٤١٦) ورواه الطبراني بسند آخر عن يحيى بن الحارث التيمي: عن أم معبد مولاة قرظة بن كعب قالت: أي بني: أن المحرم ما أحل الله كالمستحل ما حرم الله ». المعجم الكبير للطبراني (١٨/٣٤٥)برقم(٢٠٩٢٤).

## ( بەڵگەی دەیەم )

مەرج نییە هەر شتێك پێغەمبەر (ﷺ) پێی ناخۆش بووبێت بە تەنها ئەم پێناخۆشیە ئەو شتە حەرام بكات، بۆیە لە كاتی خۆیدا حەزرەتی (ابن مسعود) ئەو حەقیقەتەی فەرموو لە كاتێكدا گوتیان پێی: گۆشتی بزنمژە حەرامە، چونكە پێغەمبەر (ﷺ) حەزی لێی نەبووە و لای مەكروهـ بووە، ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: ئایا زۆر شت نییە كە لای مرۆڤ كەراهەتی هەیەو حەزی پیێ ناكات كەچی حەرامیش نییە؟ پاشان فەرمووی: بەراستی ئەو كەسەی حەرام حەلاڵ دەكات، وەك ئەو كەسە وایە حەلاڵی حەرام كردبێت».

(أخرج الحافظ البيهقي بسنده عن علي بن الجعد عن زهير عن أبي إسحاق قال: كنت عند عبد الرحمن بن عبد الله بن مسعود فجاء بن له أراه القاسم قال أصبت اليوم من حاجتك شيئا فقال بعض القوم ما حاجته؟ قال: ما رأيت غلاما آكل لِضَبٍّ منه، فقال بعض القوم أو ليس بحرام؟ فسأل قال: وما حرمته؟ قال: ألم يكن رسول الله (ﷺ)يكرهه؟ قال: أو ليس الرجل يكره الشيء وليس بحرام؟ قال قال عبد الله: إن مُحرِّم الحلال كمستحلّ الحرام »[1].

ئەم فەرموودە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی كە كەس ناتوانێت شتێك حەرام بكات مەگەر دەقێكی صەریح هەبێت بۆ حەرام بوونی، بە صیغەی نەهی بێت، یان بە ئەداتی نەهی بێت، یان بە دەستەواژەی هەڕەشەو لەعنەت و عەزاب و..هتد. وەك ئاشكرایە لای ئوصوڵیەكان، هەرچەندە

---

١. السنن الكبرى للبيهقي: (٩ / ٣٢٦)برقم(١٩٢١٤).

هەندێك لە زانایانی ئوصوڵی فیقهی ئیسلامی فەرمویانە: ئەگەر ریوایەتی داخوازی (مقتضي) بۆ دروستی کارێك وەك ریوایەتی قەدەغە بوون (مانع) وابوو، ئەوا تەرجیحی موقتەزی بۆ ئیباحەت دەدرێت بە سەر موقتەزی بۆ قەدەغەکردن، بەڵام جمهوری زانایان پێیان وایە وەك یەکن، پێشەوا (ابن أمير الحاج) لەو رووەوە دەفەرموێت: « وفي هذه الجملة ما فيها، فقد اختار القاضي عبد الوهاب في الملخص ترجيح المقتضي للإباحة على المقتضي للحظر، وقال القاضي والإمام والغزالي وابن أبان وأبو هاشم يتساويان" لأنهما حكمان شرعيان صدق الراوي فيهما على وتيرة واحدة، وصححه التاجي ونقله عن شيخه القاضي أبي جعفر، ويؤيده ما في المعجم الكبير للطبراني عن أم معبد مولاة قرظة بن كعب قالت: إن نبي الله (ﷺ) قال: إن المحرّم ما أحل الله، كالمستحل ما حرّم الله»[1].

ئەمە لە کاتێکدایە ئەگەر ریوایەتێکی صەحیح هەبێت بۆ قەدەغەکردنی کارەکە، خۆ کاری مەولوودی پێغەمبەر(ﷺ) نەك ریوایەتێکی صەحیح نییە بۆ قەدەغەکردنی، بەڵکو ریوایەتێکی مەوزوعیش نییە، بە پێچەوانەوە سەدان بەڵگەی دروستی لە سەرە ئاشکراو روون یان بە ئیشارەت و دیلالەت، یان بە پێی عمومی بەڵگەکان، کە لای کەمەکەی لە بابی روخسەت و ئیباحەتە، چونکە خوا وپێغەمبەر (ﷺ) بێ دەنگ بووە لێی، بێدەنگ بوونی لەوە نییە لە بیریان کردبێت وەك پێشتر باسمان کرد، بەڵکو رەحمەت وروخسەتە.

١. التقرير والتحبير لابن أمير الحاج، دراسة وتحقيق: عبد الله محمود محمد عمر (٥ / ٥٦).

## ( بەڵگەی یازدە )

فەرمودەی صەحیحی پێغەمبەر (ﷺ): « ما نهيتكم عنه فاجتنبوه، وما أمرتكم به فافعلوا منه ما استطعتم »[1] واتە: « ئەوەی لە ئێوەم قەدەغەکردووە دورکەونەوە لێیەوە، ئەوەش کە فەرمانم پێی کردن بە پێی توانا بە ئەنجامی بگەیێنن ». ئەمەش هاو واتایە لە تەك فەرمانی قورئان کە فەرمویەتی: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾[2] واتە: « بەندایەتی بکەن بۆ خودا هەر چەندێك لە دەسەڵات وتواناتاندا هەیە » بە بێ دیاری کردنی کات و شوێن و چۆنیەتی و چەنیەتی.. واتە بە موتڵەق فەرمانی داوە.

لەو فەرمودەی سەرەوەوە بۆمان روون دەبێتەوە تەنانەت فەرمانەکانی پێغەمبەریش(ﷺ) مرۆڤەکان بە پێی توانای خۆیان بە ئەنجامی دەگەیێنن، کەواتە باسی ئەو شتانەی نەکردووە کە بێ دەنگ بووە لێی، کەواتە ئەوەی بێ دەنگ بووە لێی لە سەر ئەصڵی ئیباحەی خۆی دەمێنێتەوە، چونکە ئەصڵ لە شتەکاندا ئیباحەت و دروستییە نەك قەدەغەکردن، وەك تەواوی ئوصولیەکان ئەوەیان فەرمووە[3].

---

١. رواه مسلم في صحيحه: (١٨٢٩/٤)برقم(١٣٣٧) عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

٢. (سورة التغابن: ١٦).

٣. قال الحافظ العسقلاني في (فتح الباري): (١٣ / ٢٦٩): « إن الأصل في الأشياء الإباحة حتى يرد الشرع بخلاف ذلك ». وقال بدر الدين الزركشي في (البحر المحيط في أصول الفقه): (٣٢٤/٤): « إن الأصل في الأشياء الإباحة، وأن التحريم عارض». وقال المحدث المباركفوري في (تحفة الأحوذي): (٥ / ٣٢٤): « إن الأصل في الأشياء الاباحة ويؤيده قوله تعالى هو الذي خلق لكم ما في الأرض جميعا».

## ( بەڵگەی دوازدە )

(روى الحاكم في المستدرك وصححه والترمذي وابن ماجه في سننيهما بسند حسن و الطبراني في المعجم الكبير عن سلمان الفارسي (رضي الله عنه) والبيهقي في سننه عنه وعن قال: سئل رسول الله (ﷺ) عن السمن والجبن والفراء فقال: الحلال ما أحل الله في كتابه والحرام ما حرم الله في كتابه وما سكت عنه فهو مما عفا عنه»[1] واتە: «حەڵاڵ ئەوەیە کە خودا حەڵاڵی کردبێت لە قورئاندا، حەرامیش ئەوەیە خودا حەرامی کردبێت لە قورئاندا، بەڵام ئەو شتانەی کە باسنەکراون و بێ دەنگی نوێنراوە بەرانبەریان ئەوا حەڵاڵەو خودا عەفوی لێداوەو ئەتوانن ئەنجامی بدەن».

ئەم فەرمودەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە هەرشتێت حوکمەکەی باس نەکرابوو ئەوا حەڵاڵەو دروستە ئەنجام بدرێت، چونکە ئەصڵ لە شتەکاندا حەڵاڵ بوونە، وەك پێشەوا (الزركشي) فەرمویەتی و بەڵگەشی بەو فەرمودە هێناوەتەوە[2].

---

١. المستدرك (١٢٩/٤)برقم(٧١١٥)وسنن الترمذي (٢٢٠/٤)برقم(١٧٢٦) وسنن ابن ماجه (١١١٧/٢)برقم(٣٣٦٧)، والمعجم الكبير (٢٥٠/٦)برقم(٦١٢٤) والسنن الكبرى: (١٢/١٠)برقم(١٩٥٠٧) قال البيهقي: « وروينا ذلك فيما مضى من وجه آخر عن سلمان مرفوعاً وروي في ذلك عن ابن عباس وأبي الدرداء (رضي الله عنهم) ».

٢. (البحر المحيط في أصول الفقه) للزركشي: (٣٢٤/٤).

## ( بەڵگەی سیازدە )

(روى الإمام مالك في الموطأ بسنده عن أبي هريرة(رضـي الله عنـه): أن رسـول الله (ﷺ) قـال: «ذروني مـا تـركتكم، فإنمـا هلـك مـن كـان قـبلكم بسؤالهم واختلافهم على أنبيائهم، فما نهيتكم عنـه فـاجتنبوه»[1]. واتـە: « هەتا خۆم شتێکتان بۆ باس نەکەم ئێوە باس و پرسـیاری لـێ مەکەن، ئوومەتانی پـێش ئێـوە ئەوانـەیان بـە هیلاکـدا چـوون بـە هـۆی زۆری پرسیارکردن و سەرپێچی کردنیان بوو لە پێغەمبەرەکانیان، ئەوەی من لـە ئێوەی قەدەغە دەکەم تەنها لەو شتانە دورکەونەوە » واتە: ئەوەی باسـی ناکـەم یـان بـە راشـکاوانە حـەرامی ناکـەم ئێـوە ئـازادن لـە کـردن و ئەنجامدانیدا، چونکە ئەوەی کە حەرام بێت واجبە من بۆتان باس بکەم.

## ( بەڵگەی چواردە )

(أخرج الحاكم و البيهقي والبزار والطبراني والدارقطني بأسانيد صحيحة وحسنة وصالحة عن أبي الـدرداء (رضـي الله عنـه) عنـه (ﷺ) قـال: « مـا أحل الله في كتابه فهو حلال، و ما حـرم فهـو حـرام، و مـا سـكت عنـه فهـو عافية، فاقبلوا من الله العافية، فإن الله لم يكن نسيا ثم تلا هذه الآية: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾[2]»)[3].

---

١. الموطأ رواية محمد بن الحسن (٣/٥٠٧)برقم(٩٩٥).

٢. (سورة مريم: ٦٤).

٣. المسـتدرك للحـاكم (٢ / ٤٠٦)بـرقم(٣٤١٩) وقـال: « صـحيح الإسـناد و لم يخـرجـاه، ووافقـه الذهبي. والسنن الكبرى للبيهقي(١٠/١٢) برقم(١٩٥٠٨). ومسند البـزار كـاملا بفهـرس الباحـث:

واتە: « ئەو شتانەی خودا(جل جلالـه) لـه قورئانـدا حـەڵاڵی کـردووه، ئـەوا حەڵاڵـەو کـەس ناتوانێـت حـەرامی بکـات، ئـەو شـتانەش حـەرامی کردووه، ئەوا حەرامەو بە کەس حەڵاڵ نابێت، ئـەو شـتانەش کـە بێـدەنگ بووە لێی و باسی نەکردووە وتـەرکی حوکمەکـەی کـردووه، ئـەوا دروسـتە بۆتان و نۆشی گیانتان بێت و حەڵاڵەو هیچ مەترسییەکی شەرعی نییـە لـە کردنیدا یان خواردنیدا، وەریبگرن ئەو عافییەتـەی پـەروەردگارتان، ئـەوە نەبێت خودا لە بیری کردبێت، بەڵکو روخسەتە و بەخشـیوەتی بـە ئێـوە، چـونکە ئاشـکرایە وەك لـە قورئانـدا هـاتووە خـودا هـیچ شـتێکی لـە بـیر نەکردووە وبیریش ناکات ».

## ( بەڵگەی پازدە )

(أخـرج البيهقـي بسـنده عـن المطلـب بـن حنطب(رضـي الله عنـه): أن رسول الله (ﷺ) قال: « ما تركت شيئا مما أمركم بـه الله إلا و قـد أمـرتكم به، وما تركت شيئا مما نهاكم الله عنه إلاّ و قد نهيتكم عنـه » « مـا اجتمـع قوم في مجلس فتقرقوا من غير ذكر الله والصـلاة علـى الـنبي (ﷺ) إلا كـان عليهم حسرة يوم القيامة» [1].

واتە: هیچ شتێك نییە خودا فەرمانی پێ دابێـت ئـیللا منـیش فـەرمانم پێداوەو رامگەیاندووە بە ئێـوە و نەمشـاردووەتەوە لێتـان، هـەروەها هـیچ

---

علي بن نايف الشحود (٢/١١١)برقم(٤٠٨٧) وقال: إسناده صالح» ومسند الشـاميين للطبرانـي (٣/٢٠٩)برقم (٢١٠٢) وصحَّحَهُ. وسنن الدارقطني بتحقيق: السيد عبد الله هاشـم يمـاني المـدني (٢/١٣٧)برقم(١٢).

١. شعب الإيمان (٢ / ٦٧)برقم(١١٨٥).

